محەمەد ئەمین پێنجوێنی



# ئەو چیرۆکانەی ئەبێت بزانرێن

## یاداشت و بیرەوەریی

کۆکردنەوەو پێداچوونەوەو پێشەکی
پ.ی.د.هیوا عەزیز سەعید

ئەو چیرۆکانەی نەبێت بزانرێن

بابەت: یاداشت و بیرەوەریی

نووسەر: محەمەد ئەمین پێنجوێنی

کۆکردنەوەو پێداچوونەوەو پێشەکی: پ.ی.د.هیوا عەزیز سەعید

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢١

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان

ژمارە سپاردنی ( ١٢٣٢ )ی ساڵی ٢٠٢١ پێ دراوە

# پێڕست

## محەمەد ئەمین پێنجوێنی

محەمەد ئەمین ئەحمەد محەمەد خواموراد لە ساڵی ١٩٤٤ لەشارۆچکەی پێنجوێن لە دایکبووە.

- یەکەم کەس بوو لە مێژووی کوردا چاوی بە سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان ) بترس بترس غالی ( بکەوێ باسی کێشەی کوردی بۆ باسبکات.

- یەکەم کەس بوە لە مێژووی کوردا چاوی بە پاپا پۆلسی دووەم بکەوێت لەڤاتیکان و باسی کێشەی کوردی ب ۆ بکات.

لەگەڵ ئەم کەسایەتی و سەرۆک دەوڵەتانەدا کۆبێتەوە وەکو (یاسر عەرەفات، ماسیو دالیما سەرۆک وەزیرانی ئیتالیا، موعەمەر قەزافی، سەرۆکی ئیتاڵیا، وەزیری دەرەوە و ناوخۆی بەلجیکا، سەرۆکی پەرلەمانی ئەوروپا، ئەندامانی پەرلەمانی ئەوروپا، دەیان سیناتۆرو کۆنگرێسمانی ئەمریکاو دەیان سیاسەتمەدارو پەرلەمانتاری ئەوروپاو مەسەلەی کوردی لەگەڵ باسکردون.

- ئەندامی دامەزرێنەری پەرلەمانی دەرەوەی وڵات و ئەندامی کۆنسەی بەڕێوەبرن بووە. ئەندامی دامەزرێنەری کۆنگرەی نەتەوەیی بووە لە ئەورۆپا.

- دەستێکی باڵای هەبووە لە دامەزراندنی کەناڵی سەتەلایتی مید تیڤی لە ئەورۆپا.

- سەرۆکی ئینستتیوتی کوردی بووە بۆ لێکۆڵینەوەو زانست لە بەرلین.

- دەستەی نوسەران و بەڕێوەبەری گۆڤاری ( لێکۆڵین) بووە بە لاتینی و کرمانجی دەرچووە گۆڤاری کوردستان ئەمرۆ.

- ئەندامی یەکێتی نوسەرانی کوردو ڕۆژنامەنوسانی جیهانە.

- ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی

کورد و یەکێتی هونەرمەندانی کورد و یەکێتی مامۆستایان و پزیشکانی کورد لە ئەورۆپا.

- لەکاری حزبایەتی گەشتۆتە ئەندامی لیژنە مەرکەزی حزبی شوعی و باڵی قیادە مەرکەزی و بەرپرسی لقی کوردستان.

- لە کاری پیشەییدا ئەرکی بەڕێوەبەری ناحیە و قایمقامی و بەڕێوەبەری گشتی لە ئەسۆ گرتوە.

- لە کاری ڕۆژنامەوایدا دەستەی نوسەرانی گۆڤاری کاروان و گۆڤاری نوسەری کورد و ڕۆژنامەی هاوکاری بووە.

- شاعیرێکی بە توانایە چەندەها شیعری جوان و بەنرخی واتادار لە زوربەی بوارەکانی ژیاندا نوسیوە لە دیوانی ڕوح و هەور و بەفردا کۆیکردۆتەوە.

- ڕۆڵێکی گرنگی لە ڕێکخستنی دەیان سیمیناری شعیری و کولتوری و سیاسی لەسەر دۆزی کورد هەبووە لە زانکۆکانی ئەوروپا و جیهاندا.

- ڕۆڵێکی گرنگی ناوەندگیریی لە نێوەندی سەرکردایەتی پارتی کرێکارانی کوردو دەوڵەتی تورکیا بۆ بەرەوپێشچونی پرۆسەی ئاشتی و ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ئاشتەوایی هێزە سیاسیەکانی کوردستان.

- ڕۆڵیکی گرنگی هەبووە لە پشتگیری شۆڕشی ڕۆژئاوای کوردستان بە تایبەتی.

## پێشەکی

یاداشت و بیرەوەریی یەک لەکەرەستە گرنگەکانی نوسینەوەی مێژووە بە شێوازو میتۆدە زانستییەکەی، واتە یاداشت و بیرەوەرییەکان خودی مێژوو نین، بەڵکو ڕوداوگەلێکن لەگۆشەنیگایەکی تایبەتەوە، بەهەموو کاریگەرییە ئایدیۆلۆژیی و دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە دەنوسرێنەوە، کەدەشێت نوسەر کاراکتەری تایبەتیی خۆی و ڕۆڵ و پێگەکەی لەناو ڕووداوەکان وێنابکات، لەوێوە دیوێکی ڕووداوەکە پشتبەست بەئاگاداریی و دووری و نزیکی لەڕووداوەکە دەگێڕێتەوە، هەروەها لەسۆنگەی هەستیاریی ڕووداوەکان و ئەرێنی یاخود نەرێنی بوونی ڕۆلی خۆی ڕووداوەکان دەتەنێت، بۆیە کاتێک یاداشت و بیرەوەریی دەخوێنینەوە، هەمیشە بازدان و کەلێن لەڕووداوەکان و تەواوکردنی وێنەکاندا هەیە، پاساوەکەش ئاشکرایە دەشێت گرفت و کێشە بۆ نووسەر یاخود کاراکتەرەکانیتر دروستبکات.

لەم سەربەنەوە نوسینەوەی یاداشت و بیرەوەری شێوازو میتۆدی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە، زۆرجار تایبەتمەندیی و پسپۆڕیی و ئاستی هۆشیاریی سیاسی و زمانەوانی و ڕۆشنبیریی کەسەکان، کاریگەرییان لەسەر نوسینەوەی بیرەوەرییەکان و تام و بۆی ڕووداوەکان هەیە، لەبەرانبەریشدا بەهەمان کاریگەریی ڕۆڵی لە لەخشتەبردن و سەرلێشێواندنی خوێنەرو توێژەران هەیە، ئەم هۆکارانە پێماندەڵێن کە سەرباری ووردیی و ڕاستگۆیی و ژیریی و بێلایەنی و ...تاد نووسەری بیرەوەریی و یاداشتەکان، پێویستە توێژەران و خوێنەران بەئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ یاداشت و بیرەوەرییەکاندا بکەن و بەکاریانبهێننەوە.

(ئەو چیرۆکانەی ئەبێت بزانرێن)ی مامۆستای بەڕێزو ئەزیز (محەمەد ئەمین پێنجوێنی)، کە لە (٧٩) چیرۆک و وەک بەش یاخود

وەرزی یەکەم نوسیویەتییەوە، یاداشت و بیرەوەری بەرێزیانە کە لەکاروانی ژیانی پڕ هەڵبەزو دابەزو نەهامەتیی ژیانی کەسی و نەتەوەیی و نیشتیمانی دووچاری بووە.

ناونانی ئەم یاداشتنامەیە بە(چیرۆک) وردەکاریی و زیرەکی و لێوەشاوەیی مامۆستا پێنجوێنی دەردەخات، لە تێگەیشتن لە چەمکی مێژوو بەدیدە زانستییەکەی، کە ئەمانە چیرۆکن و لەداهاتوو بەشداریی نوسینەوەی زانستییانەی مێژوو دەکەن، لەلایەکیتر مامۆستا پێنجوێنی وەک ئەدیب و شاعیر کاتێک چیرۆکەکانی دەنوسێتەوە، وەک ئەوەیە تێکستێکی ئەدەبی بنوسێتەوەو جوانکاریی و هەستی ئەدەبی بەخوێنەرانی دەبەخشێت.

تایبەتمەندییەکانی نوسینەوەی ئەم یاداشتنامەیەی مامۆستا پێنجوێنی جۆراوجۆرن:

● ڕووداوەکان زۆرتر پابەندیی بابەت یان سەبجێکتن نەک مێژووی ڕووداوەکان، واتە نوسینەوەی چیرۆکەکان بەپێی مێژووی ڕودانیان نییە، بەڵکو وابەستەی ئەو بابەت و بکەرەیە کە مامۆستا پێنجوێنی بەپێی پێویستی دۆخ و ڕووداوەکانی سەردەم بەپێویستی زانیووە.

● تایبەتمەندییەکی گرنگ لەخستنەرووی ڕووداوەکان، هەوڵدانی مامۆستا پێنجوێنییە بۆ ڕیشەو بنەڕەتی ڕوداوەکان، چۆنیەتی مەیین و ڕوودانی ڕووداوەکە لەسەرەتاوە، ئەمەش گرنگی ئەم چیرۆکانی زیاترکردووەو جۆرێک لەزەمینەسازییە بۆ تێگەیشتنی خوێنەر لەڕووداوەکان.

● بوونی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەو دیدی تایبەتی مامۆستا پێنجوێنی، لەزۆر چیرۆک ڕوحی ڕەخنەیی و نارازیی نوسەر لەسەر ڕووداوەکان و هەڵەی کاراکتەرەکان دەخوێنرێتەوە، تەنانەت ئەو

ڕەخنەکارییە مامەڵەو بیرکردنەوە کەسییەکانی خۆیی و باکگراوندە ئایدیۆلۆژییەکەشی نەبواردووە.

● کاراکتەرو کەسایەتی مامۆستا پێنجوێنی و چالاکییەکانی تایبەتمەندییەکی دیکەی بەم نوسینە بەخشییوە، لەکەم نوسینی دیکەدا دەیبینین، ئەویش بەزاندنی سنوریی لۆکاڵیبوون و ناوچەییبوونە بەرەو جوگرافیاو مێژووی کوردستان لەسەر ئاستە گشتییەکەی، لەبەرئەوە نوسینەوەی بیرەوەری و یاداشتەکانی نوسەر سودی بۆ نوسینەوەی کۆی مێژووی کورد هەیە بە باکورو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو باشوورەوە.

● خالیکی گەشی دیکەی ئەم کتێبە ئاشنابوونی خوێنەرانیەتی بەلایەنێکی زۆر گرنگ و پێویست، کە زۆر لەخەڵک ئاگاداریی نین، ئەم نوسینە دیوە نەبینراوو دەگمەن و خولیاو خەمی سەرکردەو کەسایەتییە ناسراوەکانی کوردە، بەتایبەت کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ کەسایەتییە زۆردیارەکانی وەک خوالێخۆشبووان (مەلا مستەفای بارزانی و عەبدوڵلا ئۆچەلان و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و جەنابی مام جەلال و کاک نەوشیروان و قاسملوو ...تاد هەبووە.

● فروانی پەیوەندییەکانی مامۆستا پێنجوێنی و بوونی لەپلەو پۆستی جۆراوجۆرو لەناوچەی جۆراوجۆر، وایکردووە زانیاریی وردو نەبیستراوو نەزانراو لەبارەی هەندێک ڕووداوو گۆڕانکاریی بخاتەڕوو، کە دەگمەنە لەسەرچاوەی دیکەوە دەستمان بکەوێت.

● هەر چیرۆک و ڕووداوێکی ئاماژەپێدراو، پەندو وانەو لێکچوونێک لەپشتیەوەیەتی، ئەمەش بەتەواوی شێوازی فێربوون لەڕووداوەکانی ڕابردوو و تێگەیشتن لە هەڵەو کەموکوڕییەکانمان پیشاندەدات، یاخود نادروستی بڕیارو بیرکردنەوەکانمان بیردەخاتەوە.

له بەرانبەردا ئەم نوسینەش وەک هەر نوسینێکیتر لە کەموکورتی بەدەرنییە، بەتایبەت بەهۆی ئەوەی مامۆستا پێنجوێنی زیاتر لەجارێک ئەرشـــیفی تـــایبەتی و دۆکیۆمێنتەکـــانی لەنـــاوبراون، وایکـــردووە کەتەواوی مێژووی ڕووداوەکانی بە ووردەکاریی ڕۆژو مانگ لەیاد نەبێـت، یـاخود نـاوی هەنـدێک لە بەشـداربووی ڕووداوەکـانی وەک پێویسـت بیرنەمابێـت، هەروەهـا خۆپـارێزیی لە وردەکـاریی هەنـدێک ڕووداوو دەرخســـتنی هەنـــدێک راســـتیی کـــردووە، لەبەرئەوەی کاریگەریی نهێنیبوونیان تائێستا لەئارادایەو لەوانەیە کێشەی سیاسیی و کۆمەلایەتی لێبکەوێتەوە.

پ.ی.د.هیوا عەزیز سەعید

# (١)
# هەلێکی مێژوویی لەدەستچوو

ئەوکاتانەی سەرقاڵی ئامادەکاریی بووین بۆ پەرلەمانی دەرەوەی وولات، بیرمـــان لە پێکهێنـــانی (کـــۆنگرەی نەتەوەیـــی) کوردســـتان ئەکـردەوە، شـەوانە لەگەڵ بەڕێـز (دکتـۆر ئیسـمەت شـەریف وانـی) لەکاتی پیاسـەکردنمان لە شـەقامەکانی برۆکسـل زۆر سەرگوزشـتەو ماجارای ژیانی خۆمان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە، چونکە ئەو ژیانی منالّی لە شـام و خوێـندنی لە دیمەشـق تەواو کردبـوو. ئیتـر لە تەمەنـی ٢٠ ساڵییەوە هاتبووە ئەوروپا بۆ خوێندن، دکتۆرای لە زانستی مێژوودا هەبوو، خوێندنی لە فەرەنسا تەواو کردبوو.

هەر لە فەرەنســاو لە یەکێـک لە زانکۆکانـدا کـاریکردوە، زمـانی کوردی باش نەدەزانی، ئێمە هەر بە عەرەبی ئەدواین، پێکەوە گەلێک کاری گرنگمان بـۆ دۆزی کـورد ئەنجامـدا، بـۆ ڕونکرنەوەی ئەم دۆزە سەرمانکرد بەدەرگای هەموو دام و دەزگاو دیپلۆماسیەکانی ئەوروپا، ڕۆڵی بنەڕەتیمان لە دامەزراندنی پەرلەمانی دەرەوەی ولات، کۆنگرەی نەتەوەیی، ئینسـتتیوتی کـورد هەبـوو کە بەرلـین بـوو، ئەگەر دەرفەت بوو باسی هەندێکیان دەکەین .

کاک عیسمەت لە ئەوروپا زۆر ناسراوبوو، چونکە سەردەمانێک لە هەنـدەران وتەبێژی شۆڕشـی ئەیلـول و نـوێنەری بـارزانی ڕەحمەتـی بوو.

کاک عیسمەت گێڕایەوەو وتی: چەند مانگێک بەسـەر سـەرهەڵدانی ڕاپەڕینـی باشـوری کوردسـتان تێپەڕیبـوو، ڕۆژێـک کـاتژمێر ٣ ی پاشـنیوەڕۆ بەکـاتی (لـۆزان) زەنگـی تەلەفـۆن لێیـدا، وتـی ئەمە مـاڵی

(دکتۆر وانلی)ە، وتم بەڵێ، وتیان لەلایەن سەرۆک فرانس میترانەوە بانگێشتکراوی بۆ کۆشکی "ئەلیزێ"، تکایە لەکاتی خۆیدا ئامادەبە، وتم بەڵێ، وتیان پاش کەمێکیتر نامەکەت بەفاکس پێئەگات، وتم سوپاس.

نامەکە بەواژۆی سەرۆک کۆماری فەرەنسا گەیشت، نوسرابوو تۆمان دیاریکردوە بچیت بۆلای کوردی عێراق، تکایە لە کات و شوێنی دیاریکراو ئامادەبن. کاک عیسمەت بەروار و مێژووەکەی پێ وتم بەداخەوە لەیادم نەماوە. وتی کەچووم بۆ کۆشک، بیرۆ تایبەتیەکەی سەرۆک میتران (ئەخزەر ئەلئیبراهیمی) وەزیری دەردوەی پیشووتری جەزائیر، کەئیستا یاریدەدەری سەرۆکی نەتەوە یەککگرتوەکانە بۆ کاروباری مرۆیی، چاوەڕێ منی دەکرد، وتم خێرە ئەخزەر؟ وتی: بەڵێ بۆ پرۆبلێم و مەسەلە ئالۆزەکەی کورد لێرەین. ئێستە لەنزیک بارەگای کۆنگرەی نەتەوەیی لە شەقامی ئافانا لیوزا دانیشتوین لە برۆکسل، کاک عیسمەت وتی پاش چەند خولەکێک چوینە ژوورەوە، میتران پێشوازێکی گەرمی لێکردین لەسەر مێزەکەی وێنەیەکی خۆی و دانیالی خێزانی بە جلی پارتیزانیەوە دانابوو، بەچەند ڕستەیەکی کورت باسی خەباتی خۆی و مادام میترانی لە کاتی لاویدا بۆ کردین. ئینجا وتی ئێوەمان دیاریکردوە بۆ دوو کاری سەرەکی:

**یەکەم** - نامەی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و مەحمود عوسمان)م بۆ بێنە، من "میتران" ڕابسپێرن کەدۆزی کورد، بەتایبەتی کوردی عێراق لە کۆبونەوەی نەتەوە یەککگرتوەکان باسبکەم. لەنامەکەدا بنوسن کەئەوان ئێمەیان ئاگادارکردووە.

**دووەم** - هەوڵبدەن هێزە کوردیەکان یەکبگرن و ئیدارەیەکی لۆکاڵی بۆخۆیان ڕابگەیەنن، چونکە لەم ماوەیەدا کۆبوونەی گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان لەسەر ئاستی مەلیک و سەرۆک و بەرپرسە

بالاكانی جیهان ئەبەستریَ، من لەویَ باسی مەسەلەی كورد دەكەم. ئامادەكاریشم بۆ كردوون و ١٥ رۆژ مۆڵەتتان هەیە، برۆنە باڵیۆزخانەكەمان لەئەنكەرە، هەموو شتییكتان بۆ ئامادەكراوە، تكایە باهەموو شتێک نهێنی بێت تا دەگەڕێنەوە.

كاک عیسمەت وتی كەلای میتران هاتینە دەرەوە وەزیری ناخۆو بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری فەرەنسا هەندێ زانیاریی و ئامۆژگارییان پێداین. هاتینە ئەنكەرەو چوینە باڵیۆزخانەی فەرەنسا، باڵیۆز پێشوازی لێكردین و پاش گفتوگۆیەكی كەم ئەفسەرێک بە پلەی ژەنەرال لەگەڵمان هات بۆ فروكەخانە، ئیمەیان هێنا بۆ بارەگای بەتالیۆنێكی سوپای فەرەنسی لە ئاكریَ. ژەنەراڵەكە بە منی وت ئەمە وڵاتی خۆتانە، برۆن بە لای كارتانەوە.

كاک عیسمەت وتی كارەساتەكە لێرە دەستیپێكرد، ووتی: ١٠ رۆژ زیاتر گەراین بەدوای ئەم بەرێزانەدا، نەمانتوانی بیانبینین، نامەی ئەوانمان پێگەیشت، بەلام شتی رون و ئاشكرای تیانەبوو تا ئێمە بگەیەنین بە میتران، هەروەها بەگرنگی بەدەم ئەم هەلە مێژووییەوە نەهاتن، هەتا رۆژنامەكانی دەوڵەتانی داگیركاری دراوسێ نهێنیەكانیان بلاوكردەوەو هاواریان لێ هەستاو ئەیانوت فەرەنسا وڵاتەكانمان تێكدەداو رۆژهەلاتی ناوەراست ئەشێویَ، تاران و ئەنكەرە كەوتنە پیلان بۆ تێكدانی ئەم پرۆژەیە، ژەنراڵە فەرەنسیەكە پێوتین كاتمان تەواوبوو ئەبێت بگەڕێنەوە. (ئەمە قسەی كاک عیسمەتە بێ زیاد و كەم).

ئینجا نازانم ئەم هەلە مێژوویە بوو بە قوربانی ململانێی حزبایەتی یان هەوڵی داگیركاری دراوسێ یان ئەمریكا رازینەبوو. ئەمە لای من مەراقێكی گەورەبوو، هەتا جارێک لە خوالێخۆشبوو جەنابی مام جەلالم پرسی، لە وەلامدا وتی بەهەموویان لێیان تێكداین، جارێكی تر

لەجەنابی سەرۆک کۆماری ئێستە دکتۆر بەرهەمم پرسی، ئەویش وتی دراوسێکان بە دڵیان نەبوو، ئەمریکاش پڕۆژەی خۆی هەبوو لەناوچەکە (چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز کوردیش هاتەوە هیچان نەدایە، بەشیر وتەنی خوا لە بەڵا لامان دا).

بەشیر موشیر دەڵێ :

"یەکبوونی کورد زەحمەتە و لەتبوونی نەگبەتە".

کاک عیسمەت ئەم بابەتەی لە نامیلکەیەکدا بە فەرەنسی بڵاوکردۆتەوەو من داوام لێکرد بیکات بە عەرەبی.

# (٢)
# سەردانێك بۆ لای سەرۆكی نەتەوە یەكگرتووەكان و كۆنگرێسی ئەمریكا

لە چوارچێوەی ئەوكـارە فەرهەنگـی و دیپلۆماسـیانەدا كەلە لە ئەوروپـا ئەنجاممانـدا، بیرمـان لەوە كـردەوە چـۆن بگەیـنە لای پەترۆزگـالی سـەرۆكی نەتەوەیەگرتوەكـان، ئەم باسـەم لای كـاك عیسـمەت شـەریف وانلـی و ئەو هەڤـالانەی بەر پرسـی چـالاكی ڕۆشنبیری بوون خستەڕوو. پێشنیازم كرد سەفەرێك بكەین بۆ ئەمریكـاو یاداشـتێك دەربـارەی دۆزی كـوردو ئەو مەترسـیانەی ڕووبەڕوی ئەم میللەتە بۆتەوە بخەینە پێش چاوی جیهـان، بەلام چۆن بگەینە پەترۆزگالی؟؟

عیسمەت كەتانی كە كوردێكی باشوری و كەسایەتیەكی ناودارو خەلكی دەڤەری بادینان و ئەو كاتە یارمەتیدەری پەترۆزگالی بوو بۆ كاروبـاری مرۆیـی، ناسـیاوییم لەگەل عیسـمەت كەتـانی بـۆ كـاتی حـوكمەتی عیـراق دەگەڕێـتەوە، كەوەزیـر بـوو چەنـد جـار پـێكەوە دانیشتبووین، ئیتر وتـم كـار لەمە باشتر نابێت، تەلەفۆنی كەتـانیم لە هۆمەر دزەیی وەرگرت، هۆمەر لە ڕادیۆی دەنگی ئەمریكا كاریدەكرد، هەر لە ئینستتیوتی بەرلینەوە كە بەڕێوبەری بووم، تەلەفۆنم بۆ كرد، دوای خۆپێناسـاندن و چـاك و چـۆنی، وتـم ئەمـانەوێ سـەردانێكی سـەرۆك پەترۆزگـالی بكەیـن. هەنـدێ لە بـارەی مەسـەلەی كوردەوە قسـەی بـۆ بكەیـن، ئەگەر جەنابـت یارمەتیمـان بـدەی زۆر سوپاسـت دەكەین و ئەمەش كارێكی گرنگ و مێژووییە بۆ میللەتەكەمان .

وتی سەرۆك نایەوێ لایەنـی سیایسـی ببینـێ، چونكە كەسـانی تر لەباشوورەوە داوایانكردوە نەیبینیون ناوی چەند كەسێكی هێنـا. ئینجا وتی باشـە ئێوە بەنـاوی ئینسـتتیوتەكەتانەوە نـامەیەك بنوسـن، بلێن

ئێمەی کورد خەریکە کولتور و زمان و مێژووی میللەتەکەمان بەرەو لەنـاوچون ئەچێـت، هەمـوو ئەو شـەڕو ئـاژاوەی لە کوردسـتان ڕووئەدات لەسەر ئەمەیە، بۆ ئەم مەبەستە ئەمانەوێ بیینە خزمەتان .

لەگەڵ کـاک عیسـمەت شـەریف وانلـی و دڵبەخـوێن نامەکەمـان نوسی، پاش زیاتر لە مانگێک وەڵامی نامەکە هاتەوە ئەڵێت: "بڕیارماندا ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٢١ کـاتژمێر ٢ی پاشـنیوەڕۆ لەبارەگـای نەتەوە یەککگرتوەکان بتانبینین(ئەو ڕۆژە ڕۆژی نەورۆز بوو)"

ئینجا من کەوتمە هەوڵی وەرگرتنی فیزای ئەمریکا، تەلەفۆنم بۆ نەجمەدین کەریم کرد کە ئەوکاتە سەرۆکی KNC بوو، واتە کونگرەی کوردەکان لە ئەمریکا . داواملیکرد بانگیشتنامەیەکم بـو بنێرێ، چـونکە ئەوکـاتە مـن ڕایسـە پاسـی ئەڵمـانیم هەبـوو فیـزەم وەرگرت. من و عەلی ئەگید لە برۆکسلەوە ڕۆیشتین، ١٥ ڕۆژ پێش ژوانەکەمان گەیشتینە واشنتۆن. ئیلهـان کە ئەوکاتە بەرپرسی بیرۆی بەڤالان بوو لە واشنتۆن بەرنامەیەکی چڕوپڕی بۆ ئامادە کردبووین بۆ بینینی کۆنگرێسمان و سیناتۆرو بەرپرسە باڵاکانی ئەمریکا. لەو ماوەیەدا توانیمان نزیکەی ١٢ -١٣ سیناتۆرو ١٩ کۆنگرێسمان ببینین. هەر لە ڕێی دکتۆر نەجمەدین توانیمان بەشداری کۆنفرانسێکی گرنگ بکەین کە کۆنگرێس لەسەر مەسەلەی کورد ڕێکیخسبوو، ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا مادام میتران کەلە پێش ئێمەوە بوو، پێش ئەوەی بچێتە ناو ئامێری پشکنینەکەوە ئەلەرم لێیدا گەڕانیانە دواوە، دواتر پێیوتن کەو ئامێرێکی پێوەیە بۆ بەهێزکردنی دڵی، بەو ئامێرەوە نابێت ناتوانێت وتارەکەی بخوێنێتەوە.

بەداخەوە ناوی هەموو ئەو ئەندام پەرلەمان و سیاسەتوانانەم لە بیرنەماوە، بەڵام ناوی چەند کەسێکیان بە بیر دێنم. لەوانە(بۆب دۆل: ئەوکاتە ڕکابەری سەرۆکی ئەمریکا بوو)، دووەم (تۆملان تۆز: یەکێک بوو لە ئاقڵەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا)، سێیەم(جۆ پۆرتەر: سەرۆکی کۆمیسۆنی دەرەوەی کۆنگرەکانی ئەمریکا) بوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانە دەربارەی دۆزی کورد قسەمانکرد، بەتایبەتی لەسەر شۆڕشی باکوورو ڕەوشی ناهەمواری باشور لەدوای ڕاپەڕین، لە کۆبوونەوەکاندا گرنگی زۆرم بەم مەسەلەیە دەدا، شاندەکەمان پێکهاتبوو لە(دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی: ئەندام پەرلەمانی دەرەوەی وولات، عەلی یەگید: ئەندام پەرلەمانی تورکیا ڕاکردوو و ئەندام پەرلەمانی کوردستان دەرەوەی وڵات).

**هەندێ لە وەڵامی ئەو کەسە سیاسی و دیپلۆماسیانەی کە چاومان پێکەوت:**

**بۆب دۆل وتی:** ئێمە ٥٠ ساڵە تورک بەخێوئەکەین بۆ ئەوەی وەکو پاسەوان بەرانبەر سۆڤیەت 'بحەوێ'؟ کە سۆڤیەت ڕوخا وتمان ئیشمان پێیان نەما، بەلام بۆ نەگبەتی کورد ڕژێمی ئیسلامی ئیران هاتە مەیدان، کەلە سۆڤیەت مەترسیدارتربوو بۆ ئەمریکا، لەبەر ئەمە ئێستا ناتوانین واز لە تورکیا بهێنین، ئەمە سیاسەتی ساڵی ١٩٩٤ ی ئەمریکا بوو.

**تۆملان تۆز:** وتی ئەگەر ئێوە شەڕبکەن لەگەڵ عەرەب لەسوریا و عێراق یارمەتیتان دەدەین، بەلام ئێستا نامانەوێ تورکیا پارچە پارچە بێت.

**جۆ پۆرتەر:** وتی ئایا ئەتوانن باس لەوە بکەن کە قەبارەی جەماوەریی پەکەکە چەندە لە تورکیا؟ چۆن ئەو جەماوەرە کۆدەکەنەوە لە ئەوروپا کە لە فیستیڤاڵێکدا ٧٠ -٨٠ هەزار کەس کۆدەکەنەوە، بەڕێز پێنجوێنی کەتۆ کوردی عێراقیت و بیستومانە کە تۆ سیاسەتمەدارو دیپلۆماتکار بووی لە عێراق، وتم بەڕێز ئەوە نییە من باسی ڕەوشی ناهەمواری باشورتان بۆ ئەکەم، ژورەکەی پۆرتەر زیاتر لە ٢٠ کەسی تیابوو، زۆربەیان لە دەزگا هەواڵگریی و سەربازیەکان بوون، گەلێک پرسیاری سەیرو سەمەرەیان لێکردین،

زیاتر لە کاتژمێرێک درێژەی کێشا، ئێمەش بە گوێرەی پێویست وەڵاممان دانەوە.

**جۆ کەنەدی:** برازای جۆن کەنەدی کە کەسایەتیەکی بنەماڵەی کەنەدیە وتی: ئێوەی کورد هەوڵبدەن لۆبیەکی چالاک لە ئەمریکا پێکبهێنن، کەسانی زمانزان و بەتوانا کاری لۆبیتان بۆ بکەن و لۆبی کردنیش بە پارە دەکرێت، چونکە بەچالاکی مەدەنی لە ئەمریکاو ئەوروپا زوتر ئەگەنە ئامانجەکانتان. ئێمە دیمۆکراتیەکان یارمەتیتاندەدەین. ئەم پیاوە زۆر ڕێزی لێگرتین و لە ڕیستۆرانتی سیناتۆرەکان لە کۆشکی سپی خوانێکی بۆ ئامادەکردین.

ئینجا سەفەریکی کالیفورنیامان کردو لەشاری سانتیگۆ لەگەل کوردەکان کۆبووینەوە، ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست دیدارێکیان لەگەڵ مندا ئەنجامدا بە درێژی لە سەر ڕەوشی ئابووری و سیاسی کورد و کوردستان قسەمان کرد. پاش ئەوەی دیدارەکە بڵاوبووەوە خزمێکم بەناوی غەریبی عەبدوڵای عەلی محەمەد پێنجوێنی کەلە ساڵی شەستەکانەوە لە ئەمریکا ئەژیا، پەیوەندی لەگەڵکردم. خزمەتێکی باشی کردین و بردینی بۆ هۆلیودو بە شەقامی ئەستێرەکاندا سوڕاینەوە.

ڕۆژێکی تر خزمەکەم لەگەڵ ڕۆژنامە نووسەکە هاتن بۆلام وتیان ئەم دیدارەمان تایبەتیە، ڕۆژنامەنووسەکە باسی جولەکەکانی پێنجوێنی لێپرسیم، منیش وتم من منالبوون کە ئەوان لەوێ ڕۆشتون، بەڵام کورد بە تایبەتی شاری پێنجوین زۆر ڕێزیان لێگرتوون و هیچ جیاوازیەکیان نەکردون، وتی ئەی بۆچی ئەڵێن پێنجوێنیەکان (نونەیان) کوشتوە، وتم ئەوە لەسەر مەسەلەی ئاینی نەکوژراوە، نونە وردەواڵە فرۆش بوو، بۆ پارە و ئێستر و کەلوپەلەکەی کوشتبوویان.

هەتا ئەمانەمان ئەنجامدا کاتی بینینی سەرۆکی نەتەوە یەکگرتوەکان نزیکبووەوە، گەڕاینەوە بۆ نییۆرک، پێش ئەوەی ئێمە بگەینە نییۆرک هەڤاڵ ئیلهام لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا

درکانـدبووی که بـۆ یەکەمجـار شـاندێکی کـورد کە پێکهـاتبوون لەم کەسـانە ئەچـنە لای سـەرۆکی نەتەوەیەکگرتوەکـان، ئیتـر ئەم هەواڵە وەکو بروسکە بەناومیدیاکاندا بڵابوەوە، تورکەکان کەوتنە جموجۆڵ و ئۆقرەیان لێبڕابوو، یاداشتان دابوو بە سەرۆکی نەتەوەیەکگرتوەکان، ئەگەر ئەم تیرۆرستانە ببینن، ئێمە لە نەتەوەیەکگرتوەکان ئەکشێینەوە. سوریاو ئێرانیش بەشی خۆیان جموجۆلیان کردبوو، لۆبی تورکەکان زۆر بەهێـزن لە ئەمریکـاو شـارەزایی باشـیان هەیە لە ناشـرینکردنی کورد، من شەو تەلەفۆنم کرد بۆ عیسمەت کەتانی وتی حەق نەبوو بڵاویـبکەنەوە، نەتەوەیەککرتوەکانتـــان شــڵەقاندووە، پەترۆزگـــالی نەخوشـکەوتووە، لەوانەیە جیگـرەکەی بتـانبینی. هەروەهـا وتـی مـن بەیانی گەشـت ئەکەم ببـورن کە ناتانبینـم، سـەلام لەکـاک عیسـمەت شەریف وانلی بکە.

ئێمە لەکـاتی ژوانەکەمانـدا چـوینە بارەگـای نەتەوەیەککرتوەکـان، سـەیرمان کـرد قیـامەت هەسـتاوە، زیـاتر لە ١٠٠ کەنـاڵی تەلەفزیـۆنی ئـاژانس و گۆڤـار و ڕۆژنـامە خڕبـوونەتەوە. نوێنەرەکـانی ئێـران و تورکیا لە بەردەم بیرۆی ڕۆژنامەنووسی ئەهـاتن و ئەچون، ئەیانوت ئەگەر سـەرۆک ئەم تیرۆرسـتانە ببینـێ، ئـێمە لەم ڕێکخـراوە ئەچیـنە دەرەوە، ئێمە چـوینە بیـرۆکە بەسـەر پێوە پەترۆزگالی بەخێرهـاتنی کردین، وتی ئەوە جێگرەکەم و سـکرتێرە تـایبەتیەکەم لەگەڵتـانە، ئێمە کـۆنگرەی ڕۆژنامەنووسـی خۆمـان کـرد لەگەڵ هەمـوو کەنـاڵ و میدیاکان قسـەمانکرد، ئەو یاداشـتەی پێمـانبوو لەگەڵ پەیـامی ئاشـتی بەڕێـز ئـۆچەلان لە ڕێـگەی میـدیاکانەوە گەیانـدمانە جیهـان، وتمـان حـــوکمەتی تورکیـــا تەگەرەی خســـتە کارەکەمـــان، دوایـــی لەگەڵ جێگـرەکەی و سـکرتێرە تـایبەتیەکەی پەترۆزگالی کۆبوونەوەمـانکرد، ئەوەی پێویست بوو ئەبوایە پێمانبوتنایە پێمانڕاگەیاندن.

ئێمە ئـاوا پەیـامی شۆڕشـی بـاکورو ڕەوشـی ئەوسـای نالەبـاری باشـور و دۆزی کـورد بە گشـتی لەمـانگی ٣ سـاڵی ١٩٩٤ گەیانـدمانە

نەتەوەیەکگرتوەکان و کۆنگرێسی ئەمریکا و کۆشکی سپی، ئەوسا سیاسەتی ئەمریکاو نەتەوەیەکگرتوەکان ئاوابوو کەباسمانکرد، حەزئەکەم ئەوە بڵێم کە دکتۆر نەجمەدین و هۆمەر دزەیی یارمەتیاندایین و خزمەتی باشیانکردین، لەماڵی هۆمەر دزەیی کفتەی سورمان خوارد کە بە ئاوی شێلم لێنرابوو، دکتۆر بەرهەم و مەزهەری خالقی و هەندێ کوردی ڕۆژهەلاتیش لەوی بوون. چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز ئەمجارە من بۆنی گوڵم کرد.

# (٣)

## ڕێپێوانی ئازادی بۆن - برۆکسل

ئەم ڕێپێــوانە لە پەرلەمــانی ئەڵمانیــاوە لە بــۆن (کەو ئەوکــاتە پایتەختی ئەڵمانیا بوو) هەتا برۆکسل پایتەختی بەلجیکا، واتە لەبەردەم پەرلەمـانی ئەڵمانیـاوە هەتـا پەرلەمـانی ئەوروپـا و کۆنســەی یەکێتـی ئەوروپا لەبرۆکسل دەستپێکرد.

ئەو کاتەی ساڵانی ١٩٩٤و ١٩٩٥ لەشاری بۆن بـووم و بەرپرسی بیرۆی ڕۆشـنگەریی بـووم، هەڤـاڵان بیـروکەی گۆڤاریکـان هەبـوو بە نــاوی ڕەوشــەن، بە پیتــی لاتینــی و زاراوەی کرمــانجی چــاپ و بڵاودەکــرایەوە، ڕۆژنــامەی وڵات کەلەئەســتانبوڵ دەردەچــوو ٣٠٠ دانەی دەگەیشتەدەستمان و بڵاوماندەکردەوەو سەروکاری چـالاکییە ڕۆشـنبیریەکانمان دەکرد، هـاوڕێ فـایەق چیچـک سەرپەرشـتی کـاری ڕونـاکبیریی دەکـرد، ئەو هەمـوو کارەکـانی ڕووبەڕوی مـن کـردەوەو خـۆی بـۆ کـاری حزبـی تەرخـانکرد، لەگەڵ دڵبەخـوێن لە زۆربەی شــارەکانی ئەڵمانیـا و ئەورپـا کەوتیـنە چـالاکی ڕونـاکبیریی وەکـو (پاریس، لەندەن، ستۆکۆلم، کۆپنهاگن، ئەمستردام، برۆکسل...هتد)، لەم شارانە کۆنفرانسی گەورەمان بەگشتی لەسەر مێژوو ئەدەب و هونەر و کولتـوری کـورد سـازکرد، یەکەم کـۆنفرانس لەبـۆن زیـاتر لە (١٥٠) ڕونــاکبیرو ڕۆژنــامەنووس و دکتــۆرو پرۆفیســۆر و چــالاکەوانی مەدەنی، بەتایبەت ئەوانەی لە دەوری شۆڕشی باکور کۆبوبونەوەو بە کوردی و تورکی دەیاننووسی ئامادەبوون، لەپاش گفتوگۆیەکی دوو ڕۆژیی هەندێ بڕیاری گرنگمان گەڵاڵەکرد:

**یەکەم** - کردنەوەی ئینیستتوت کورد لە بەرلین.

**دووەم** - گرنگیدان بەکاری چالاکی مەدەنی و دیپلۆماسی

**سێیەم** – ڕێپێوان لەپەرلەمانی ئەڵمانیاوە بۆ پەرلەمانی ئەوروپا(بۆن برۆکسل)

**چوارەم** – ڕونکردنەوەی دۆزی کورد بۆ دامودەزگا سیاسی و دیپلۆماسیەکانی ئەوروپا.

**پێنجەم** – لەوێ پێشنیارمکرد کێ کوردی ئەزانێ بنوسێت و بخوێنێتەوە بچێتە لایەکەوە، کێ بە تورکی ئەنوسێ بچێتە لایەکەوە "ئەمە تۆزێ گران کەوت و ناڕەزایشی لێکەوتەوە".

ساڵی ١٩٩٤و ١٩٩٥ نزیکی سەری ساڵ و جەژنەکانی ڤایناختن، لەبەر سەرای ڕاوێژکاری ئەڵمانیاو پەرلەمانەوە کەوتینەڕێ، ئەو کاتە سەرما نزیکی ١٠ دەرەجە خوار سفر بوو، ئیمە باش خومان ئامادەکردبوو بو ئەم "مەشە" بروشەرو ڕاپۆرتمان بە زمانەکانی ئەڵمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی، فەلەمانی (زمانی بنەڕەتی خەڵکی ڕەسەنی بەلجیکایە) نوسیبوو، لەگەڵ ماشینێکی ئەمبوولانس و ماشێنێکی تر پڕ لە کەلوپەل و خواردەمەنی کەوتینە ڕێ، هەڤاڵەکان منیان ئەرکدار کردبوو کە پەیوەندی بکەم بە کوردی باشورو ڕۆژهەڵاتەوە، چونکە پێشی مەشەکە من سەفەری سویدو فەرەنساو لەندەن و گەلێک شوێنی ترم کرد، بەداخەوە کەسێک نەهات بە پیرمانەوە، هەندێک گاڵتەیان پێئەهات، لە سوید هاوڕێیەکی کۆنە سیاسی و دۆستی دێرینی باشورم بینی باسی ئەم مەشەم بۆکرد بەگاڵتە جاڕییەوە وەڵامیدامەوە، وتی مرۆڤی ئاقڵ شتی وا ناکات بەم ساردو سەرمایە، خۆ هەر پێلاو دوو سێ هەزار پێلاوتان ئەوێ، بەسەدان ڕینکۆتتان ئەوێ، مەگەر قەزافی یان سەدام یان سی ئای ئەی ئەمریکی ئەمەتان بۆ بکات، بەڵام لەم دواییە ئەپاڕایەوە بیکەین بەئەندامی کۆنگرەی نەتەوەیی!!؟ تێگەیشتم ئەم هاوڕێیەمان هێشتا لە گوێی حوشترا نوستوە.

لەبۆن پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ یاداشت و بروشور و داواکاریەکانمان پێشکەش بە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا هێلمود کۆڵ و

ســـەرۆکی پەرلەمـــانی ئەڵمانیـــا کـــرد، ئەو شـــاندەی چـــوینە دیـــوانی ڕاوێژکاریی پێکهاتبوو: (حسێن قرتاڵ، سەلاح مووسا، سەلیم فورات، بەندە).هەموو ڕۆژێک ٢٠ تا ٢٥ کیلۆمەتر بە پێ ئەڕۆشتین، ئەچوینە هەر شـارێک یـان شـارۆچکەیەک سـەرۆکی شـارەوانی و سـەرۆکی سەندیکای پۆلیسی ئەو شوێنە ئەهات بە پیرمانەوە ئەو نوسراوانەی ئامادەمان کرد بوو پێشکەشمان دەکردن، ئینجا دەچوین بۆ شوێنی پشوودان ئەو هەڤالانەی ڕێخەری مەشەکە بوون لەسەر بەڕێوەچونی مەشـەکە سـەرنجی خۆیـان دەردەبڕی و پێشـنیازی نوێیـان پێشـکەش ئەکـرد، ئینجـا دەسـت ئەکـرا بە ئـاهەنگی شۆرشـگێڕیی و سـیمنیار و ئاخافتنی سیاسی، چەند جاریش داوای شعر خویندنەوەیان لەمن کرد من لەسەر مێژوو ئەدەبی کوردی و سیاسەت ئاخاڤتنم ئەکرد، ئێمە لە سەر سنوری ئەڵمانیاو هۆڵنداوە چوینە ناو هۆلەندا. لەشاری ماستریخ بە کۆبـــونەوەیەکی گەورەی جەمـــاوەری پێشـــوازیان لێکـــردین، لە باڵاخـانەی شـارەوانی بانگێشـتی چاخواردنیـان کـردین، بە درێژایـی ڕێپێوانەکە من و کاک عیسمەت شەریف وانلی لە پێش ڕێپێوانەکەوە ئەڕۆشـتین، ئـالای سـەوز و سـور و لۆگـۆی یەکێتـی ڕۆشـنبیرانمان هەڵکـرد بـوو، چـونکە ئـێمە مـۆڵەتی مەشـەکەمان بەنـاوی خۆمـانەوە وەرگرتبـوو، ئاگـاداری حـوکمەتی هۆڵەنـداو بەلیجکامـان کـرد بـوو کە نزیکەی ١٥٠تا ٢٠٠ کەس ئەبین هەموویان ڕوناکبیرو ڕۆژنامەنووس و مامۆسـتای زانکـۆو دکتـۆر و پرۆفیسـۆرن بـۆ ئەوەی ڕێگیرمـان لێنەکەن، بەڵام هەتا گەشتینە برۆکسل نزیکەی ١٠٠٠ کەس دەبووین، دوای ١٦ - ١٧ ڕۆژ ڕۆشـتن ئێـوارەیەک گەیشـتینە نـاو شـاری برۆکسل .

لەڕێگـا هەنـدێک پەکـی کەوت و چەنـد کەس چـوونە خەسـتەخانە، ئیتر ئاڵۆزیەکە لەبرۆکسل دەستپێکرد.

ئەو کەســـایەتیە ڕونـــاکبیرو سیاســـیانەی لەگەڵمـــان بـــوون لە مەشــەکەدا (عەبــدولڕەحمان دوڕڕە، فەقــێ حســێن ســانج، میــر هەم،

عەبدوڵا ئوزون، سەرهەد بۆجاخ، پرۆفیسۆر مۆلان موش و هاوژینەکەی کە سەرۆک و ڕازگری زانکۆی بریمن بوون).

لە هۆلاند و بەلجیکا (دکتۆر جەبار قادر، دکتۆر مارف عومەر گوڵ) کە لەناو شاری بەلجیکا هاتنە ناو ڕێپێوانەکەوە.

هەڤاڵەکان لەناوی شاری برۆکسل شوێنێکی گەورەیان ئامادە کردبوون بۆ حەوانەوە خەریکی ئاهەنگ و ئامادەکاریبوون، لە پڕ تورکەکان هێرشیان کردە سەرمان بە سەدان چەقۆ وەشێن و گورگە بۆرەکان بە قەمە و چەقۆ و دەمانچەوە هاتن. شەڕ قەوماو چەند هەڤاڵ و کادری پاریزگاری مەشەکەیان بریندار کرد، دەمانچەیان بەکارهینا. سەروکی شارەوانی بروکسل مورگەر مایستەر بە خوی و هێزێکی چەکدارەوە خۆی کرد بە هۆڵەکەدا، بە ژڵژاوی و هەناسە بڕکێوە هاواری کرد شارەکەم شێواوە شەڕی کورد و تورک دەسپێکردوە، ئەو جەماوەرەی داواتانکردووە لەسەر سنورەکانن، بوەستن بریندار زۆرە.

ئاخر هەڤالان تەلەفۆنیان کرد بوو بۆ شارەکانی نزیک برۆکسل بە دەیان ماشینی کوردی باکوور ڕژانە ناو شاری برۆکسل، لە کورد ٥-٦ کەس بریندار بوو سیانیان بە دەمانچە و لە تورکە نەژادپەرستەکان ١٠ کەسیان بریندار بوون چواریان کارمەندی باڵیۆزخانەی تورکیا بوون لە برۆکسل، سوپا هاتەناوەوەو ئێمەیان بە ماشینی سەربازی گواستەوە بۆ سەربازگەیەک، لەوێ ٣ ڕۆژ مانگرتمان ڕاگەیاند، حوکمەتی بەلجیکا داوای لە باڵیۆزخانەی تورکیا کرد ئەوانەی کارمەندی باڵیۆزخانەن ئەبێت بە زوترین کات بدرێنە دادگا. ئاڵۆزیی کەوتە نێوان حوکمەتی بەلجیکا و تورکیا، پاش دوو ڕۆژ لە مانگرتن وەزیری ناوخۆی بەلجیکا هاتە لامان وتی داواتان چییە بڵێن؟ وتمان :

**یەکەم** - بینێی سەرۆک پەرلەمانی ئەروپا

**دووەم** - بینینی سەرۆکی کۆنسەی یەکێتی ئەروپا

**سێیەم** - بینینی سەرۆکی پەرلەمان و وەزیری دەرەوەی بەلجیکا

بۆ ئەوەی کە ئەو یاداشت و بەڵگەنامانەی لەسەر دۆزی کورد و ئەو دەستدرێژیانەی دەوڵەتی تورک هەمانە پێشکەشی بکەین .

وتی شاندێک پێکبهێنن لە سێ بۆ چوار کەس زیاتر نەبێت، خۆم سبەینێ ئەنێرم بە شوێنتاندا. کە چووینە لای وەزیری ناوخۆ بەرنامەکەی داینێ ئێمە قسەی خۆمان کردو ئەویش قسەی خۆی کرد، هەندێ گلەیی لەرێکخستنی کوردەکانی باکوری بەلجیکا کرد. شاندەکە پێکهاتبوو (عیسمەت شەریف وانلی، حسین قرتاڵ، بەندە، دکتۆر جەبار).

بەلام کەچووین بۆلای سەرۆکی پەرلەمانی ئەورپا و سەرۆک کۆنسەی یەکێتی ئەوروپا و سەرۆکی کۆمسیونی ئاشتەوایی جیهانی هەر ڕێگەیان بە من و عیسمەت شەریفدا، چونکە میدیایەکی زۆر و کەناڵی تەلەفزیۆنی ئامادەبوون، ئێمە ئەو بەڵگانامانەی پێمانبوو پێشکەمانکردن، وەلامی پرسیارەکانمان دایەوەو دیداری تەلەفزیۆنیان لەگەڵ کردین، توانیمان حەقیقەتی ڕەوای مەسەلەی کوردیان تێبگەیەنین. ئەو ڕۆژانە میدیاکانی ولاتانی ئەڵمانیاو هۆڵەندا و بەلجیکا و لۆکسەنبورگ سەرقاڵی مەشەکەی ئێمە بوون و مەسەلەی کوردیان بە چاک و خراپ هێنایە سەر تەلەفزیۆنەکانیان. ئەم چالاکیەمان دەنگی زۆری دایەوەو بووە جێگەی باس و خواسی میدیاکانی ئەوروپا . دوو خاڵی گرنگ بەدیکرا:

**یەکەم** - بۆ بەرێز ئۆچەلان و بزاڤی ئازادی کورد ئاشکرا بوو کە چالاکی فەرهەنگی دیپلۆماسی سودی زۆری هەیە بۆ دۆزی کورد

**دووەم** - ئەگەر بە پلان و پرۆگرام تێکۆشانی سڤیل بکرێ زوو ئەگەینە ئامانج .

**چوونمان بۆلای وەزیری دەرەوەی بەلجیکا:**

زۆر بەرێزەوە پێشوازی لێکردین گوێی لە قسەکانمان گرت، کاک عیسمەت زۆر بە فراوانی باسی دۆزی کوردی بۆ کرد، هەر لەو

کاتەدا حیکمەت چەتین کە وەزیری دەرەوەی تورکیا بوو بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ وەزیر کرد: وتی ئەو تیرۆرستانە ببینم پەیوەندیمان خراپ دەبێت، تەلەفۆنەکەی تەواو کردو وتی ئەوە خۆشی کوردە داوام لێ ئەکات ئێوە نەبینم، کاک عیسمەت وتی بەڵێ تێگەیشتین، وەزیر وتی پێموتووە ئەوانە میوانی ئێمەن ١٧ رۆژە بە پێ بەرەو شارەکەی من دێن، هەموو پیاوی بە تەمەن و خوێندەوارن سەر و سیمایان لە تیرۆرست ناچێت، ئینجا کاک عیسمەت ئاماژەی بۆم کردو وتی ئەوە کوردی عێراقە شاعیرەو رۆژنامەنووسە. وەزیر رویکردە من پێش ئەوەی قسە بکات من وتم بەرێز ئێمە هاتوینەتە خزمەتان بۆ مەسەلەی کورد، من داوا لە جەنابتان ئەکەم وەکو چۆن بلفۆر وەزیری داگیرگەکانی بریتانی پەیمانیدا بە جولەکەکان کە دەولەتیان بۆ دروستبکات، هیوادارم جەنابیشت هەوڵێکی وا بۆ کورد بدەیت. لە وەڵاما وتی ئەو زەمانەو ئێستە زۆر جیاوازن، بەڵام کەمتەرخەمی ناکەم. هەنێک بێدەنگبوو وتی قاوەمان بۆ بێنن، دکتۆر سەربەست کەرکوکی کەلە بەلجیکا تێکەڵمان بوو و زمانی فەلەمانی باش ئەزانی قسەکانی منی بۆ وەرگێرابوو.

لە پەرلەمانی بەلجیکا ئاهەنگی رێزلێنانیان بۆ سازکردین ٢٠ کەس لە بەشداربووانی مەشەکە چوینە ناو پەرلەمان، چەپکە گوڵی رێزلێنانیان پێشکەشکردین، ئەندام پەرلەمانی بەلجیکاو ئەوروپا وتاری پشتگیری کوردیان خوێندەوە، کاک عیسمەت و بەندە بەوتارێکی کورت سوپاسمانکردن.

"چەپکێ وەنەوشەو چەپکێ نێرگز لە پەرلەمانی بەلجیکا گوڵ و رێزیان پێشکەشکردین."

**تێبینی:** زۆر داوای لێبوردن لەو هەڤاڵ و کەسانە ئەکەم کە ناویانم لە یادنەماوە یان ناویانیانم پاش و پێشکردوە.

(٤)

# سەردانی پاپا لە ڤاتیکان

لە چیرۆکەکانی پێشتر باسمانکرد ڕونکردنەوەی ڕەوایەتی مافی کوردو دۆزە پشتگوێخراوەکەی ئامانج و ستراتیجی کارکردنمان بوو، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی زۆر دامودەزگای سیاسی و دیپلۆماسی جیهان و بەتایبەتی ئەوروپا و ئەمریکامان کرد، یاداشت و نەخشەو دۆکیۆمێنت و هەرچی پێویست بوو دامانە دەستیان و خستمانە بەردەمیان.

بیرمان کردەوە کە پێویستە ڕوبکەینە دامودەزگا ئاینییەکانی ئیسلام و مەسیحی و هەندێ دەوڵەتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بۆ ئەم مەبەستە پلانمان دانا کە لە ڤاتیکان سەردانی پاپا پۆلسی دووەم بکەین، لە کۆبونەوەکی ئینستتیوت عیسمەت شەریفمان ئەرکدارکرد کە پەیوەندی لەگەڵ ڤاتیکان بکات، کاک عیسمت وتی یەکێ لە میسیۆنێرەکانی پاپا ئەناسم، نامەیەکمان بە ناوی ئینستتیوت نوسی کە کورد میلەتێکی ستەملێکراوەو لەبەردەم هێرشی لە ناوچوندایە، بۆ ئەو مەبەستە دێینە خزمەتتان، وەزیری دەرەوەی حوکومەتی ڤاتیکان وەلامی داینەوە(ئێمە لایەنی دینین سیاسەتمەداران نابینین، بەلام ئێوە وەکو ڕۆشنبیرانی میلەتێکی ستەملێکراو ڕێگەتان پێدرا کە حەزرەتی پاپا ببین. شاندەکەمان پێکهاتبوو لەبەڕێزان:(دکتۆر عیسمەت شەریف سەرۆکی فەخری ئینستتیوت محەمەد ئەمین پێنجوێنی سەرۆکی کرداریی ئینستتیوت، عەبدولڕەحمان دوڕڕە موفتی دیاربەکری لەکارلادراو، دڵبەخوێن دارا ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ئینستتیوت)، ئێمە لەکات و شوێنی خۆیدا چوینە خزمەت حەبری ئەعزەم.

هەرچی بەڵگەو داواکاری هەبوو خستمانە (خورج)ێکەوە لە شێوەی ئەو خورجەی حەزرەتی عیسای مەسیح کاتی خۆی لەشانی کردووە، پێشکەش بە حەزرەتی پاپامان کرد، پاپا وتی ئەگەر (رەب) یارمەتیمبدا نوێژێکتان بۆ دەکەم، چونکە (کووغت - کورد) میلەتێکی ستەملێکراوە! ڕێز لە ئاینی مسیح دەگرن لە کوردستان.

بەڵێ هەر ئەوەندە بوو ... ئاخر نوێژی پاپا کەم نییە لە جیهانی کریستیاندا، بەشێکی زۆر لە پارتە کریستیانەکان لە ئەوروپا یان حوکوم دەکەن یان بەشدارن لە دەوڵەتداریدا، هەتا ئێستاش کەنیسە ڕۆڵی گرنگی لە چڤاتدا بەهێزە.

هەر ئەو ڕۆژە بەتەلەفون رادیوی دەنگی ئەمریکام ئاگادارکرد لە سەردانە مێژوویەکە، لەبەرئەوەی من جلی کوردی ڕانکوچۆغەم لەبەردا بوو فۆکسی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ئاژانسەکان لەسەر بەندە بوو.

هۆمەری دزەیی کە بێژەربوو لەڕادیۆی دەنگی ئەمریکا زۆر بەر گرنگی و گەرموگوڕیی هەواڵەکەی خوێندبووەو بایەخێکی زۆری پێدابوو، چونکە بۆ یەکەمجار بوو کورد بە جلی کوردیەوە بگاتە حەبری ئەعزەم. من بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە برا موسوڵمانەکانمان لەکوردستان ئەمەیان بەلاوە پەسەند نەبێت و (فتوای) کافربوونمان بدەن، پێشنیارمکرد کە پێویستە زیاسەردانی موسڵمانانیش بکەین، چونکە کاتی خۆی مامۆستا ڕەئوف زوهدی نامەیەکی کراوەی بۆ پاپا نوسی و بڵاوی کردەوە، دواتر بە ڕۆژی ڕۆشنا لە شاری سلێمانی تیرۆرکرا. ئینجا لەبەرئەوە بڕیارماندا سەردانی میسرو سعودیەو لیبیا بکەین. من و عەبدولڕەحمان و عیسمەت شەریف لە شاری بۆن لە ئەڵمانیا سەردانی باڵیۆزخانەی سعودیەمان کرد. پێمان ڕاگەیاندن کە ئێمە بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی مەسەلەی کورد، بۆ سەردانی شوێنە پیرۆزەکان دەچین. ئەوکاتە باڵیۆزخانەی لیبیا لە ئەڵمانیا داخرابوو.

باڵیۆزخانەی میسر بەرژەوەندیەکانی لیبیای دەپاراست، پاش نزیکەی ٢٠ ڕۆژ وەلامان وەرگرتەوە بەمجۆرە

**یەکەم** - لە میسر لەسەر ئاستی وەزارەتی دەرەوە دەبینرێن .

**دووەم** - لە سعودیە لەسەر ئاستی وەزیری دەرەوە دەبینرێن .

**سێیەم** - لەسەر ئاسی وەزیری دەرەوەو بەڕێز عەقید قەزافی دەبینرێن .

چوینە قاهیرە کەس پێشوازی لێنەکردین. بە هەوڵ و کۆششی سەیدا دوڕڕە توانیمان سەعدەدین ئیبراهیم سەرۆکی دەزگای ئیبن خەلدون ببینین و قسەی خۆمانی بۆ بکەین. گۆڤارو ڕۆژنامە چاوپێکەوتنیان لەگەل سازداین. کۆنگرەی ڕوژنامەنووسیمان کرت. لە سعودیەش هەروەها هەر بە هەوڵی سەیدا دوڕڕە توانیمان لە یەکێک لە زانا دینیە بەناو بانگەکانی ئیسلامی لە سعودیە ببینین، ئالێرە گفتوگۆیەکی سەرنج ڕاکیش ڕویدا کەلای من زۆر سەیر بوو، ئەو بەڕێزە کە ڕیشێکی ماش و برنجی و سەرو سیمایەکی جوان و پاکی هەبوو زۆر ڕێزی گرتین و قاوەی عەرەبی بۆ بانگکردین، دەستی بە ڕیشیا هێناو وتی "انتم شنو" ئێوە کێن؟ هەموو پێکەوە "الحمدالله نحن مسلمين" وتی "اعرف اخوان اعرف" انتم شيعة او سنة" وتمان سونەیین کاک عیسمەت بە دەستە لەرزۆکەکەی قاوەکەی داناو وتی "یاشیخ ماکو فرق بين الشيعة و السنة، كلنا مسلمين" ئەم پیاوە جوانخاس و پر لە حورمەتە ئوقرەی نەماو وتی "لا لا اخی لا، الشيعة اخطر من الشيوعية ومن الصهيونية، لان الشيعة يهدمون من داخل الاسلام".

منیش لە دڵی خۆمدا وتم ئەی قوڕ بەسەر کورد بۆ لای کێ هاتوین باسی بەلەنگازی داماوی کوردی بۆ ئەکەین. سکالا لای کێ ئەکەین.

دواتر بە پاپۆڕ چوین بۆ لیبیا چونکە ئەوکاتە ئەمبارۆگۆ لەسەر لیبیا بوو، قەدەغەبوو فرۆکە بنیشێتەوە، جێگری وەزیری دەرەوە

پێشوازی لێکردین. له هۆتێلی پێنج ئەستێره دایبەزانین. ڕۆژی دواتر "جەلود" وەزیری دەرەوە هات و بردینی بۆ خێمەکەی قەزافی. ڕەوانشاد شیری حوشتری داینێ. منی برده لای خۆیەوە، چونکه ئێمه پێشتر سیفی خۆمان بۆ ناردبوون باسی ڕەوشی عێراق و کوردستانی لێپرسیم، هەواڵی مام جەلالی پرسی، ئێمه باسی ڕەوشی کوردستانمان بۆ کرد، ئەو هەموو شتێکی له ئێمه باشتر ئەزانی، وتی زۆربەی سەرکردەکانتان دێنەلام، بەڵام ئەوان بوێرنین، تەنها ئۆچەلان بوێره، من پێموتن یان شەڕەکەن یان بۆ سەربەخۆیی بجەنگن، من کەله نزیکیەوه بووم وتم "سیادەتی عەقید ئێمه داوای ئۆتۆنۆمی ئەکەین ئەمانکوژن و ئەنفالمان ئەکەن و بەکیمیاوی لێمان دەدەن، وتی ئاخر له بەرنەوەیه من ئەلیم شەڕ بۆ سەربەخۆیی بکەن، ئەگەر نیوەتان بکوژرێت نیوەکەی تر به سەربەرزی ئەژین، ئینجا وتی هەر سەرۆکی کورد ترسنۆک نییه سەرۆکی عەرەب ترسنۆکه. میسرو سعودیەکان له ترسی تورکیا ئێوەیان نەبینی، تورکەکان هەڕەشەیان لێکردبوون که ئەو تیرۆرسیانه نەبینن. به کورتی ئەنجامی ئەم گەشتەمان بەم جۆره بوو:

١) قەزافی باسی ئەو هەله له دەستچوانەی بۆ کردین که درێژایی مێژوو کورد له دەستیداوه، به ڕاستی هەموومانی سەرسامکرد، وتی هەر سەرکردەیەکی کورد هاتبێته لام یارمەتی مادی و چەکم پێداون، ئێوه یەکەم شاندن که داواکاری مادیتان نەبوو، من پشتگیریتان ئەکەم تا سەربەخۆیی به داخەوه ڕۆحی شاد بێت!

٢) پاپا وتی نوێژێکتان بۆ ئەکەم.

٣) برایانی عەرەبی چاوڕەش و دەوڵەتانی عەرەبی و برایانی موسوڵمانیش دوعایەکی خێریشیان بۆ نەکردین.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز، پاپا نوێژێکی بۆ کردین، قەزافی شیری حوشتری دەرخوارد داین، عەرەب دوعای بۆ نەکردین.

# (٥)
# چیرۆکێکی گرنگ و سەرسورهێنەر

لەسەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٦٩ حزبی شیوعی بۆ قیادەی مەرکەزی و لیژنەی مەرکەزی دابەشبوو، زۆربەی جەماوەرو بنکەی حزب بەلای قیادەی مەرکەزی هاتن، ململانێیەکی گەرم لەناو رێکخستنەکانی حزبدا پەرپابوو، بۆ یەکەم جار دروشمی روخاندنی حوکومەت لەلایەن قیادەی مەرکەزیەوە هەڵکراو شۆرشی چەکداریی راگەیەنرا، لەباشووری کوردستان چەند چالاکیەکی سەرنجراکیش ئەنجامدراو کەوتینە دەسبەسەراگرتنی بانک و پارەی حوکومەت بۆ کرینی چەک، چەکی جۆراو جۆرمان بە دەستهێنا، شانەی چەکداریی لەناو حزبدا دروستکرا، لە هەندێ شوێنی باشووری عیراق دەست بەسەر زەوی ئاغاکاندا گیراو درا بە جوتیار، لە کوردستان دەست بەسەر هەندێ پارەی حوکومەتدا گیرا، هەندێ چالاکی جۆراوجۆر کرا، ئیتر لە هەموو لایەکەوە کەوتنە گەلەکۆمەکێ بۆ لەناوبردنی قیادەی مەرکەزی.

لە بەغداد لە هێرشێکی پیلان بۆ داڕێژراودا زۆربەی ئەندامانی قیادە دەستبەسەرکران، ئێمە لە سلێمانی لقی کوردستانی حزبی شیوعی قیادەی مەرکەزی پێکهاتبوین لەم هاورێیانە(موسلح مستەفا: بەرپرسی لق، غازی عنتوان: ئەندامی قیادەو بەرپرسی کەرکوک، جمال، محەمەد ئەمین پێنجوێنی: بەرپرسی سلێمانی ، شێخ حەسەن شێخ محێدین قادر کەرەم: کە بە پیری موغان ناسرا بوو، لەحزبدا بەرپرسی پەیوەندیە تایبەتیەکان، سابیر: بەرپرسی هەولێر، یەڵدا: بەرپرسی موسڵ و دهۆک بوو.

ئـێمه هەمـوو ڕۆژێکـی هەینـی سـەرەتای هەمـوو مانگێـک کۆبوونەوەمان هەبوو، هاوڕێیان لەکاتی خۆیاندا ئامەدە ئەبوون، لەو ماڵانەی نێوان شەقامی ئۆرزدی و حەمامی بەرخی کۆن، بە کۆڵانێکی باریـک لە تەنیشـت مـاڵی ئەورەحمـان ئاغـاوە کە ئێسـتە گەراجـی ئۆتـۆمبێلە، لەو کـۆڵانە بـاریکە مـاڵێکی حزبمـان هەبـوو، خێزانـی هاوڕێیەکی تیابوو بەناوی بەکر قادر، لەوێ هەمووومان کۆبووینەوە چاوەڕێی غازی عەتوانمان ئەکرد، لەکاتی خۆیدا کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ زەنگی دەرگاکە لێدرا، من کە بە تەمەن لە هەموویان بچوکتر بووم، دەرگـاکەم کـردەوە، سـەیرەکە لێـرەدایە، کەبیـنم هـاوری غـازی دوو کەسی کەتەی ڕەشتالەی شێوە عەرەبی لەگەڵدا بوو. غازی ڕوی لە من کرد ووتی: هاوڕێیان ئامەدەن، خێرا پەنجەی شایەتومانی خستە سەر لێوەکانی بە چاوەکانی تێیگەیاندم کە دۆخەکە نۆرماڵ نییە، ئیتر من ساتێک وەستام و وتم نەخێر هاوڕێیان لێرە نین، وتی کەی دێن وتـم سـەعات ٤ ی عەسـر! ئەوان یەکسـەر پاشـە کشـێیان کـرد و ڕۆشـتن، منـیش لە دەرگـاکەوە سـەرم دەرهێنـاو سـەرنجمداو بیـنم سواری ئۆتۆمبیلێکی ڤۆکس واگۆن بوون، چەند ئۆتـۆمبیلێکی چەکدار بە دوایدا ڕۆشـتن، خێرا گەرامەوە ژوری کۆبـوونەوەکە چیم دی بۆ هاوڕێیانم گێڕایەوە ... ئیتر بوو بە قسەکردن لەسەر ڕوداوەکە، من و موسلح و شێخ حەسەن پێمانوابوو غازی دەستبەسەرەو ناچارکراوە جێگەی ئێمەیان پێبڵێت، بەڵام ویژدانی هاتۆتە سەرخەت و پەشیمان بـۆتەوە، لەبەرئەوە کۆبوونەوەکەمـان هەڵوەشـاندەوەو بڵاوەمـان بە هاوڕێیان کرد.

ئەو کـاتە لەنـاو شـاری سـلێمانی چەنـد شـانەیەکی چەکـدارمان هەبـوو، توانیمـان لە مـاوەی ٣ کـاژێردا شـانەیەکیان لە مـاڵی شـەهید

فـایەق ئەمـین دەرەویـانی کـۆبکەینەوە، کەمـاڵەکەی مـاڵی حـزب بـوو لەنزیک ماڵەکەی ترمان، شانە چەکدارەکە پێکهاتبون لەم هاوڕێیانە:

١ .ئیسماعیل ئەحمەد
٢ .فایەق ئەمین دەرەویانی
٣ .مەلا رەئوف
٤ .ئیبراهیم نەسرولا
٥ .جەلال چاوشین
٦ .عوسمانی نانەوا

ئەوانە هەریەکەو دەمــــانچەیەکی چــــواردە خۆریـــــان پێبـــــوو، کلانشینکۆفێکیان لەگەڵدا بوو، منیش بە ئامادە بوونی شێخ حەسەن و موسلح چیرۆکەکەم وەک خۆی بۆ گێرانەوە، هەمـوو گەیشـتینە ئەو بـــاوەڕەی غـــازی دەستبەســـەرەو ئەیەوێ بە شـــێوەیەک دۆخەکەی خۆیمـان تێبگەیێنێت، نامەیەکمـان نووسـی بۆ غـازی، وتمـان کـێ خـۆی قوربـانیی ئەکـات ئەگەر سـەعات چـوار هـاتنەوە ئەم نـامەیە بـدات بە غـازی، یەکەم کەس هـاوڕێ فـایەق وتـی من، نـامەکە بە عەرەبـی بـوو نوسرا بوو هاوڕێ غازی بەخێربێیت، لەبەرئەوەی رەوشی ئاسایش نا ئـارامە، کۆبوونەوەکەمـان گواسـتەوە بـۆ مـاڵی هـاوڕێ سـیروان لە کەرەکی گردی سەیوان، لەگەڵ ئەم هاوڕێیە وەرن بۆ ئەوێ.

هـاوڕێ چەکدارەکانمان نـارد بـۆ کۆتـایی شـەقامی ئیبـراهیم پاشـا، ئەو کاتە لە کۆتای شەقامەکە شیوێک هەبوو لەسـەر شـیوەکە پردێک هەبـوو، کە ئەچـوینە ئەوبەر مزگەوتێـک هەبـوو وابـزانم بە نـاوی مزگەوتـی سـەیوان، ئەوکـاتە شـەقامەکە قیـر نەکرابـوو هەتـا نزیکـی پردەکەش هاتبوو، هاوڕێیان لە ژێر پردەکە خۆیـان ئامـادە کرد بـوو.

من و پیری موغان لەو کۆڵانە باریکەی سەرو ئۆرزدی کە ئەیروانیە ماڵە حزبیەکەمان خۆمان مەلاسدابوو چاومان لێبوو غازی و چەند کەسێک رویانکردە بەر ئەو ماڵەی کە هاورێ فایەق چاوەڕێی ئەکردن، گەیشتنە بەر ماڵەکە فایەق نامەکەی دایە دەستیان یەکەکە خوێندیانەوەو وردە وردە لەگەڵ فایەق کەوتنە رێ بەرەو شوێنی دیاریکراو، بەراکردن هەواڵمدا بە هاورێیانی چەکدارو پێمانوتن دەستانکراوە بێت ئاگاداربن غازی بەر نەکەوێ. ئەوان غازیان نەدەناسی من وەسفی غازیم بۆ کردبوون کە پیاوێکی چۆنەو جلی چونی لە بەرایە. لەسەر ئەو وەسفە کە گەیشتبوون یەکسەر جەلال چاوشین پەلی رائەکێشێ و لەناو شەرەکە دوری ئەخاتەوە، ئاخر ئەمانە لە بەغدادەوە هاتبوون بۆ گرتنی ئێمە، مەفرەزەی ئەمنی عامەی نازم گزار بوون، شارەزای تەواوی شاری سلێمانی نەبوون، هاتبوون وەکو مریشک بمانگرن، ئیتر لە دەورو بەری پردەکە بوو بە تەقە، مەگەر لە (ئەنگۆلا یان لە فیلمی رامبۆ) شتی وا لە رۆژی رۆشن رویدابێت. لە ئەنجامدا ئەفسەرێکی گەورەی ئاسایشی بەغداد کوژراو چەند کەسی تریان لێ بریندار بوو، لە ئێمەش ئیبراهیم و نەسروڵلا و مەلا رەئوف بریندار بوون، کەلەلایەن چەند کەسێکی سەرخۆش کەلە کارێزی وەستا شەریف ئەیان خواردەوەو چەکداری نزیک لە حکومەت بوون، بەبرینداری ئەو دوو کەسەیان گرت تەسلیمیان کرد بە حوکومەت، ئێوارە داهات ئێمە خۆمان گەیاندە ماڵی مەلا بەکر لەسەر شەقام، لە پڕ جەلال چاوشین و غازی خۆیان کرد بە ژوورا، غازی لەخۆشیا گریاو وتی هەر ئەمزانی کارکێکی وا قارەمانانە دەکەن، هەر ئەو ئێوارەیە بە سواری ولاغێک ناردمان بۆ قەرەداغ بۆ گوندی دەرەویان، بۆناو لقە سەربازییەکەمان کەلەناو مزگەوتەکەدا بوو. ئێمە بۆ شەو چوینە ماڵی عەبدوڵلا زەنگەنە، باوکی خانمی

ناودارو تێکۆشەر پەخشان زەنگەنە، هاوڕێ عەبدوڵڵا ئەندامی حزب بـوو لە لیـژنەی گزنگـی ڕۆشـنبیران کاریـدەکرد، وتمـان هـاوڕێ دەنگوباس چییە، پێکەنی وتی چییە قیامەتتان دروستکردووە، هەموو حوکـومەت بە دوای ئێـوەدا ئەگەڕێ ئەوە دەنگـوو باسـە. لەوان دوو کـوژراوو سـێ بریـندار هەیە، بە هەلی کۆپتەر بردیانن بـۆ بەغدا، لە هاوڕێیـانیش بە بریـنداریی دوو کەس گیـراوە، یەکێکـان نەناسـراوە لەدانپێدانانەکەیدا دەڵێ: من فەلاحـم خەڵکی شـارەزورم، هـاتبووم بچم بۆماڵی عەلی بەگی جاف کەوتومەتە ئەم شەڕەوە، (ئەوە مەلا ڕەئوف بـوو)، ئەوتریـان خەلکـی سەرشـەقام بـوو بەنـاوی (برایم) ئـاخر هـاوڕێ زەنـگەنە بەرپرسـی هەوالگریـی نـاو بەڕێوەبەرێتییەکـان بـوو، هەر ئەو لەهەواڵەکـان ئاگـاداری ئەکـردینەوە، بەیـانی تاریـک و ڕون هەڵسـاین چـووین بـۆ قەرەداخ بـۆ گونـدی دەرەویـان، شـەوی دواتـر هێزی مغـاویر چووبـونە سـەر مـاڵی بەکـری قـادری مقیـاس، مـاڵەکە چۆلکرابـوو، پاشـان چووبـونە سـەر مـاڵی دراوسـێیان، سـێ چـوار کەسیان لەخەودا کوشتبوون... مەلا ڕەئـوف و ئیبراهیم لە حەپسـخانە ئەشکەنجەو سزای زۆریان چەشت، هەتا بەیانی ١١ی ئازار، ئەوکاتە گۆڕینەوەی دیلکراوەکان لە نێوان حوکومەت و شۆڕش دەستپێـکرد، ئـێمەش شـاندێک چـووینە لای خوالێخـۆش بـوو ئیـدریس بـارزانی و ناوی ١٠ کەسمان پێشکەشکرد، ئیبراهیم و مەلا ڕەئوف بە ناوی دیلی پێشمەرگەوە ئازادکران. سلاو ڕێزم و بۆ ئەوکەسانە هەیە کە ماون، ئەوانەش لە ژیاند نەماون ڕۆحیان شاد. سوپاسی دکتۆر سیروانیش ئەکەم ئەم گەشتەی بۆ سازکردین و لەپایزی تەمەندا منی شاد کردوە بە دەرەویانی مەکۆی خەباتی قیادە مەرکەزی لە کوردستان. چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز ئێمەش گەشتێکمان بۆقەرەداغ کرد .

# (٦)

## یەك ملیۆن واژۆ ... یەك دەنكە شقارتە!!

مـانگی ١٠ ی ١٩٦٢ شۆڕشــی ئەیلـول ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پـێش ئەچوو، خەڵكی باشـوری كوردسـتان هیوای گەورەیـان لەسـەر ئەم شۆڕشە هەڵچنیوە، حزبی شـیوعی عێراقی لەگەڵ هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشــە نەبـوو، لە ســەرەتادا ڕەخـنەو تێبینــی هەبـوو، لەبەرئەوەی حـوكمی عەبـدولكەریم قاســم هێشــتا بە حكـومی نیشـتمانی لە قەڵەم ئەدرا، بەڵام لە ژێـــردەود بەنهێنـــی پەیوەنـــدییان لەگەڵ مەلا مســـتەفا بـارزانی هەبـوو، ڕەزامەنــدی ســۆڤیەتیش وەرگیرابـوو بـۆ ئەوەی جوڵانەوەیەكی چەكداریی لە كوردسـتان ڕوویدات، بەئومێدی ئەوەی (قاسـم) زیـاتر بەلای سـۆڤیەتدا بشـكێتەوە! ئەو كـاتە حزبـی شـیوعی سیاسـەتی (التعـاون والكفـاح)ی پەیـرەوە دەكـرد، ئەمەش بـووە هـۆی ئەوەی حـزب سیاســەتێكی یەكـلاكەرەوەو ڕونــی نەبێـت، هەروەهـا ئـاڵۆزییەكی سیاســی و فكـری و ئایـدۆلۆژیی لە حزبـدا دروسـتكرد، ئەنجامەكەشـــی بە كەرتبــوون كۆتاییهـــات، بەو هـــۆیەوە زۆربەی جەمـاوەری لەدەسـتدا، لەلایەكیتـرەوە حـوكمی قاسـم نەك هەر بەلای سۆڤیەتدا نەچوو، بەڵكو بەرەو دیكتاتۆریی ڕۆشت و حزبی شـیوعیش وردە وردە لێیتەكیەوە، ئـاخر حوكـومەتی قاسـم هەنـدێ دەسـكەوتی گرنگی بۆ عێراق بە دەستهێنا وەكو:

١. یاسای تەئمینی شەریكاتی نەوت.
٢. یاسای چاكسازیی كشتوكاڵیی
٣. مادەی ٣ی دەستور كە ئەڵێت كورد و عەرەب هاوبەشـن لەم وڵاتە.

لەبەر ئەمە حزبــی شــیوعی تــا ڕادەیەك پشــگیری لە حــوكمی قاسم ئەكرد.

بەڵام دواتر حزبی شیوعیش كەوتە ژێر هێرشی دكتاتۆریی قاسـم، هێرشــی ســەربازی بـۆ كوردسـتان، گرتن و ڕاوەدوونـان و سـوتاندن

دەستپێکرد، حەپسخانەکان پڕبوون لە خەڵکی تێکۆشەرو ئازادیخواز، حزب ناچاربوو دروشمی (السلم  فی کوردستان)، بۆ ئەم مەبەستە لە زۆربەی شــارەکانی عێــراق ڕێپێــوان و خۆپیشــاندانی گەورە گەورە ئەنجامدرا، ڕێپێوانە یەک ملیۆنیەکەی بەغداد هاواریان ئەکرد ئاشتی بـۆ کوردسـتان، لە هەمـوو جیهـان دەنگیـدایەوە ئەمە لە خۆیـا یەکەم: ڕێکلامبـوو بـۆ شـۆڕش، دووەم: ئاگـادارکردنەوە بـوو بـۆ حوکـومەتی قاسم.مەبەستی من لەم پێشەکیە، هەڵسـەنگاندنی سیاسـەتی حزب یـان ڕەخنە لە شۆڕشی ئەیلول نییە، بەڵکو مەبەست ئەم چیرۆکەیە بۆتـان ئەگێـڕمەوە، ئینجـا لقـی کوردسـتانی حـزب واژۆی بـۆ ئاشـتی بـۆ کوردستان کوکرددود. هاوکات واژو بو ئیدانەکردنی هێرشـی ئەمریکا بۆ سـەر کۆبـا کۆکرایەوە. لە سلێمانی شـاندێکیان ڕێکخست کە نـاوی ئەم بەڕێزانەم لەیادماوە(عەلی بـاراوی، فـایەق نـوری، فـایەقی بەهـێ، حەمەی حـاجی سـاڵحی حەمـامچی، وەسـتا عـارفی خەیـات، مـحەمەد ئەمـین پێنجـوێنی، سـێ چـالاکەوانی ژن بە نـاوی: توباخـان خوشـکی جەلال ئەبو شوارب، ئافتاوخان هەڵەبجەیی و خانمێکی تر کە مامۆستا بـوو نـاوەکەیم بیرنەمـاوە). لە گەرمیـان شـێخ ئیبراهیمـی قـادرکەرەم کەسـایەتی ئـایینی و عەشـایەری ئەو دەڤەرە، لە کەرکـوک مەلا شـێخ محێدین ئیمـام و وتـاربێژ، لە بەغـداد لە هۆتێلێـک لە شـەقامی (کفـاح) یەکمان گرت، نزیکەی ١٧ بۆ ١٨ کەس دەبووین، چەنـد کەسـایەتیەکی تر لە ناوچە جیاجیاکانەوە هاتبوون، ئێمە دوو یاداشت و دوو فەردە واژۆمــان پێبــوو، یاداشــتێک بــۆ حکـومەتی عێـراق و یاداشــتێک بە ئینگلیزی و یەک ملیۆن واژۆ بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکا، وەک پرۆتستۆ بـۆ دژی هێرشـی ئەمریکـا بـۆ سـەر کۆبـا، لێرەوە چیرۆکەکـان تـامی خۆی وەردەگرێت.

یەکەم سەردانمان بۆ لای (زەعیم عەبدولقاسم) بوو، پێشوازییەکی باشــی لێکــردین و لەبەرمــان هەســتاو ڕێــزی لێگــرتین، پــاش چــا خواردنەوە یەکێک لە ژنەکان یاداشتەکەی لەسـەر مێزەکەی دانـا، کە چــاوی بە یەکەم دێــڕی یاداشــتەکە کەوت نوســرابوو ئاشــتی بــۆ

کوردستان لە پێشا گرژو تورەبوو، دواتر بە زەردەخەنەیەکەوە وتی برۆن بە وانەی شاخ بڵێن بینەوە، ولات...ولاتی خۆیانە بۆچی لێمان یاخیبوون پاش ١٥ دەقیقە هاتینە دەرەوە.هەروەها سەردانی (مەهداوی)مان کرد، ڕێزی زۆری پیشاندا، وتارێکی دوورو درێژی بۆ داین، وتی لەهەموو لایەکەوە گەمارۆدراوین، ئەگەر پاپۆڕەکە نقوم بێت بە کوردو عەرەبەوە نقوم ئەبین، وتی من لە کێشەی کورد تێدەگەم، ئێمە ویستمان کوردستانی عێراق بکەین بە مەشخەڵێک بۆ ڕوناککردنەوەی بەشەکانی تری، بەلام دیارە لێیان تێکداین. ژەنەڕاڵ فەتاح شالی کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو بە کوردی هەندێک قسەی بۆ کردین، وتی بەحزبەکەتان بڵێن ڕەوشەکە زۆر مەترسیدارە، با گرفت بۆ حوکومەت دروستنەکەن.چەند کەسایەتییەکیترمان لە حوکومەت و ناودار بینی، لەوانە: (ئەحمەد ساڵح عەبد، کامل چادرچی سەرۆکی حزبی دیمۆکراتی نیشتیمانی، عەبدولفەتاح ئیبراهیم سەرۆکی حزبی جمهوری، ئیبراهیم کوبە ئابووریزان و ڕوناکبیری عێراق، محەمەد حەدید، مونیر تۆفیق ، شاعیری گەورەی عەرەب جەواهیری کەوئەو کاتە سەرنوسەری ڕۆژنامەی (الرأي العام) بوو، یاداشتەکەو ڕای ئێمەی بلاوکردبووەوە، بەمانشێتی گەورە نوسیبویان (شاندی کوردستان نامەی ئاشتیانهێنا بۆ زەعیم).

لەگەڵ ئەو کەسایەتیانەی ئاماژەمان پێکردن، ڕەوشی نائارامی کوردستان و بۆمباباران و پەلاماری فڕۆکەو ئەمبارگۆی ئابوری و گرتن و ڕاونان و هەموو ئەمانەمان بۆ باسکردن، هەندێ لەگوزارشتەکانی ئەوکەسانە:

**کامل چادرچی:** برۆن لە ناو شۆڕشی ئەیلول جێبگرن با مرۆڤی دیموکراتخواز و نیشتیمانپەروەر ڕۆڵی خۆیان هەبێت.

**عەبدولفەتاح ئیبراهیم:** حزبی شیوعی هەڵوێستی ڕونی نییە، ئەمەش کارەسات بۆ عێراق دروستئەکات.

ئێمە هەموو ڕۆژێک چالاکیەکەمان ئەکردو بە ڕاپۆرت ئەماندا بە هاوڕێ جەمال حەیدەری، کە هەموو ئێوارەیەک لە چایخانەیەک ئەمانبینی، کە بە تەنها لەگەڵ من و عەلی باراوی دائەنیشت.

چیرۆکی سەرنجراکێش ئەوەبوو کە پێیوتین بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی ئەبێت واژۆکان کە بۆ کۆباتان کۆکردۆتەوە بیبەن بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکا ئیتر لە هۆتێلەکە بڕیارماندا (بەندەو مامۆستا فایەقوە مەلا شێخ محێدین و شێخ ئیبراهیم و وەستا عارف و یەکێک لە ئافرەتەکان) بەیانییەکەی بڕۆین. بۆ بەیانی کەسێک هات بە شوێنماندا کوردی فەیلی بوو، بردینە بەردەرگای باڵیۆزخانەو خۆی ونبوو، لە بەرددرگا پاسەوانە عیراقیەکان هەندی دەنگەدەنگیان لەگەڵ کردین، پاسەوانە ئەمریکیەکانیان بانگکرد، کە سەیری ئێمەیان کرد شێخ و مەلاو ژن و بە جلی کوردیەوە بە هەیبەت و شان و شەوکەتەوەین، لێیپرسین چیتان ئەوێت، مامۆستا فایەق کەخۆی مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو بە ئینگلیزی پێیوتن: ئێمە نوێنەری کوردستانین ئەمانەوێ باڵیۆز ببینین. وتی فەرموو وەستا عارف و شێخ و مەلای پێشخۆیداو فەردە واژۆکەیان بە کۆڵی مندادا، ئەمریکیەکە هەر دیقەتی لە وەستا عارف دەدا، وەستا عارف کەسێکی زۆر بە هەیکەل و جوانخاس و دەستێ جلی ستارخانی تازەی لەبەردا بوو، مشکیەکی گوڵینگەداری بەستبوو، گوڵینکەکانی بە لاجانەکانیدا شۆڕببونەوە مەلا بەخۆی جبەو تەربوشەکەیەوە و شێخ بە عابەیەکی مەیلەو سەوزو مێزەرێکی سەوزی کاڵ و منیش بە فەردەیەک واژۆ بە کۆڵمەوە، بە ڕێزەوە بردینیان بۆ ژوورێکی گەورە، قاوەیان بۆ هێنایین، باڵیۆز خۆی و کەسێکیتر هاتن بەرانبەرمان دانیشتن، وتی فەرموو چیتان ئەوێ؟ مامۆستا بە ئینگلیزیەکی پێرفێکت وتی ئەو فەردەیە یەک ملیۆن واژۆیە، بەکۆڵی ئەو قوتابیەوە هێناومانە بۆ پرۆتستۆی هێرشی ئێوە بۆ سەر کۆباو هاوڕێ کاسترۆ، باڵیۆز بە بیستنی ناوی کاسترۆ وەک فیشەکە شێتە چوو بە ئاسمانا، پایپەکەی دەرهێناو بە دەنکە شقارتەیەک دایگیرساندو شقارتەکەی فڕێدایە سەر

فەردە واژۆکە، وتی ئەم ملیۆنە واژۆیە نرخی ئەم دەنکە شقارتەی نییە، ئێنجا دەستی من گرت و بردمیە لای خۆیەوە ئێشت چییە؟ وتم (I am student)، وتی ئەوە کوردستان ئەسوتێ بۆ ناچن لەپێناو شەرکەرەکانی بارزانی واژۆ ببەن بۆ حوکومەت بڵێن کوردستان مەسوتێنە، چیتان داوە لە کوبا، مامۆستا فایەقیش وەلامیدایەوە کە ئێمە لە پێشدا چووین بۆ لای سەرۆکی حوکومەت و دامودەزگاکانی حوکومەت، واژۆژمان بەوان داوە، ئیتر مەلا و شێخ و وەستا زویربوون بەرویانەوە دیاربوو، بە رێیان کردین تا بەردەرگای باڵیۆزخانە، کە هاتینە دەرەوە مەفرەزەیەکی هەواڵگریی عێراقی گرتنیان و بردینیان بۆ بەریوەبەریتییەکی سەربازیی. لەوێ شێخ و ئافرەتەکەیان بەردا من و مەلا و مامۆستاو وەستا عارفیان برد بۆ لای دادوەری گشتیی سەربازیی (ئەحمەد سالح عەبدی)، کە ئێمەی بینی تورەبوو، وتی من چەند رۆژ لەمەوبەر ئامۆژگاریی چیمکردن؟ لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدراوین رویکردە مەلا وتی: ئاخر زەمانە شێخ و مەلا شیوعی بن، مەلا وتی من شیوعی نیم ئەنساری سەلامم، نەراندی بەسەریا وتی بۆ من نازانم ئەنساری سەلام شیوعی دروستیکردوە، وتی: بەعسیەکان ناسیۆنالیستە شۆفێنیەکان و یاخیبووەکانی باکور هەموو دژی زەعیم یەکیان گرتوە، ئەگەر کودەتا بکرێ مەلا پێش هەموو کەس لەسێدارە دەدرێت، چونکە تۆ هەم مەلاو هەم شێخ و هەم شیوعیت، ئیتر هەندێ ئەملاو ئەملایان پێکردین و شەو ئازادییان کردین.

کە هاتینەوە هۆتێل ئەو شەوە هاورێ جەمال حەیدەری نەهات بۆ لامان، کەسێکی تر هات، وتی بەیانی ئەرۆنەوە، ئیتر لەرێگەی دیالەو دەربەندخانەوە یەک یەک و دوو دوو هاتینەوە سلێمانی، پاش چەند هەفتەیەک لە ئەمنی عامەوە فەرمانی گرتنی چەند کەسێکمان دەرچوو.

داوای لێبوردن لەو کەسانە ئەکەم ناوەکانیانم یاد نەماوە، سڵاو و رێز بۆ ئەو کەسانەی لە ژیاندا ماون، ئەوەشی لەژیاندا نەماوە رۆحی شادبێت، چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بەبێ ئومێدی گەراینەوە.

# (٧)

# ئۆپەراسیۆنی ساندویچ " بابۆڵە"

سەرەتای ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٢ بۆ سەرکۆنەکردنی تیرۆری سەرکردەی رۆژهەلاتی کوردستان "شەرەف کەندی" رێپێوانێک کرا، لەریزی پێشە چەند ئەندامێکی پەرلەمانی کوردستان ئەرۆشتن، لە وانە: دکتۆر عزەدین و کەمال شاڵی، چومە نێوان هەردوکیانەوەو بە دەم رۆشتنەوە قسەیان بۆ ئەکردم، کەمال وتی دوێنی کۆبونەوەی پەرلەمان هەبوو وابزانم شەری دژی پەکەکە دەستپیدەکات. ئەگەر شتێکت پێدەکرێت فریاکەوە ... ئاخر من تازە لە بیقاع هاتبوومەوە ئاسایش ئەیویست لێپێچینەوەم لەگەڵ بکات، بۆیە خۆم شاردبووە زۆر کەم دەرئەکەوتم، چونکە رۆژی پێشووتر برادەری بەرێزم کاک دارای حاجی برایمی چەرمەگا لە کەبابخانەیەک هاورێیەکی دێرین و کابرایەکی ناسراوم بینی، منیش بەیادی جاران سلاوم لێکردن و گەرامەوە شوێنی خۆم، ئەو هاورێیە چوو لەتەلەفۆنی وەستاکەوە تەلەفۆنی بۆ ئاسایش کردو وتی ئەوە فلان لێرەیە بیگرن، وەستا هات لەگەڵ دارا چپەیەکی کردو شلەژاوییەک دروستبوو، بۆیە بەپەلە نانمان خواردو هاتینەوە ماڵی دارا، وتی وتی خەم مەخۆ کۆنە هاورێیەکەت هەواڵی لێداویت، بەلام من شەوو رۆژ هەر بیرم لەوە ئەکردەوە چۆن ئەم بەر لەو شەرە بگرین. زۆر شەو مولازم کەریم سەلامی بەرپرسی پاسۆک و مولازم عومەر ئەهاتن بۆلام. شەوێک بە مولازم عومەرم وت: بەڵکو کارێک بکەی کاک نەوشیروان ببینم، وتی ئاسانە.

سبەی هات بەشوێنماو ڕۆشتین بۆ لای نەوشیروان، کەلە ماڵێکی بچوکدا بوو لەسەر شەقامی قەنات بەپشتی خەستەخانەکەوە، چومە لای نەوشیروان وتم با هەوڵبدەین ئەم شەڕە بوستێنین، هەندێک قسەی ترمان کردو وتی مادام وایە تۆ خۆت دەرمەخە من ئەچم بۆ هەولێر جەنابی مام جەلال و جەنابی کاک مەسعود دەبینم و کە هاتمەوە پلان دادەنێین چی بکەین. کە هاتەوە چومەوە بۆلای وتی چیت پێدەکردێت؟ ئایا ئۆچەلان ڕازیە بۆ ئەوەی شەڕ نەکرێت؟ جەماعەتی خواکورک ڕازین؟ وتم من ئەوانە جێبەجێدەکەم.

ئەوکاتە نایف ئاجو ئەندامی سەرکردایەتی لە سلیمانی بوو. بانگمکردو بابەتەکەم بۆ باسکرد، وتی بابچین بۆلای جیهازەکە پەیوەندی بکەین. ئەوکاتە لە سلێمانی جیهازێکی بێ تەلی ڕاکاڵمان هەبوو، پەیوەندمانکرد بە بیقاع و خواکورکەوە وتیان "تۆو نەوشیروان بریکاری ئێمەبن چیتان پێدەکرێت بیکەن بۆ ئەوەی شەڕ دروست نەبێت ئێمە ڕازین". ئەو کاتە کۆمەڵێ هونەرمەندو تیپی گۆرانیم لە حەلەبەوە هێنابوو لە شەقامی پیرەمێرد، لەماڵی هونەرمەندی گەورە تەها خەلیل ژورێکم بۆ گرتبوون، ئەوانە هەندێکیان کادرو گەریلا بوون، لە ڕێی ئەوانەوە پەیوەندیکردن ئاسان بوو، چومەوە بۆلای ڕەوانشاد کاک نەوشیروان، پاش گفتوگۆیەکی زۆر پێکهاتین کەوەک شاندێکی سیاسی و سەربازیی بچین بۆ ناوچەی خواکورک، لە نزیکەوە لەگەڵ بەرپرسە سەربازییەکانی پەکەکە قسەبکەین. بەیانیەک بە سێ لاندکرۆزەرەوە دەرچوین، ئەوەی لەیادم بێت کاک نەوشیروان ئەم بەڕێزانەی لەگەڵ خۆی هێنابوو(حامیدی حاجی خالید، شێخ جافر، مام ڕۆستەم، مەحمود سەنگاوی، لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە)، ئێمەش (بەندە، نایف حاجۆ، دکتۆر وەیسی بووین)

چوینە ناوچەی برادۆست و مجێسیر بۆ ماڵی کەریم خان، بینیمان قیامەت هەڵساوە، هەر چی دەنکە برجێکی ماڵی پاشای خواردوە لەوێیە، هێزێکی زۆری پارتی و یەکێتی و هەندێ لە مستەشارەکان کە هێشتا هێزی چەکداریان مابوو لەوێن. پێشمەرگەکان کە نەوشیروانیان بینی لێیکۆبوونەوە، نەوشیروان وتی من بۆ شەڕ نەهاتوم، ڕاستە من لەشەڕەکانی ناوخۆ ڕۆڵم هەبووە، بەلام لەگەل ئەم شەڕە نیم. ئەم شەڕە زۆر ڕەهەندی ناوخۆیی و دەرەکی هەیە. لە بەرپرسە سەربازییەکانی پارتی:(حەمیدە فەندی، عەبدولا ئاغا، عوسمانی قالە منەوەر)، لە یەکێتیش: ئەو بەریزانەی باسمکردن و مامۆستا بەکر و هەندی بەرپرسی تر ئامادەبوون.

لە دیوەخانەکەی کەریم خان هەموو کۆبوونەوە کاک نەوشیروان وتی لەگەڵ حەمەومین و ئەبرادەرانە هاتوین ئەم شەڕە نەکرێت. بەهەلم زانی وتم ئەم شەڕە جیاوازە لە شەڕە ناوخۆیەکانی تر، ئەگەر شەڕی جەلالی و مەلای ویژدان و سیاسەتی کوردی کرد بە دوو لەتەوە، ئەم شەڕە ئەقڵ و دۆزی کورد پارچە پارچە دەکات، ئەمە ئەبێت بە شەڕی باکورو باشورو سۆران و بادینان، ئەبێتە سەرەتای ئالۆزکردنی دۆزی کورد، ئەمە شەڕی دەولەتانی داگیرکەرە، بەرپرسێک وتی مامۆستا لۆ ناچی بەلای شیعر و میعری خۆتەوە، ئەمە شەرە شەڕ، وتم بەرێز ڕاستە شەڕە، بەلام شەڕو شیعرو شانامەشە نازانم چی لێتێگەیشت. ئیتر کاک نەوشیروان وتی من تازە عەمەلیاتی فەقەراتم کردووە، ناتوانم بە پێ بڕۆم تۆ لە برادەرانی پارتی و یەکێتی ببە با لەوێ وەک بارمتە بمێننەوە، تا دوو کەسی ئەوان بێن بۆ قسەکردن، بەلکو لێرە بگەینە ئەنجامێک.

منیش مام ڕۆستەم و حامیدو شێخ تاریق نوریم دەستنیشان کرد. وتی ئەی لەپارتی بۆ کاک عوسمانیش لەگەڵ خۆت نابەیت؟ بەڕاستی من حەزم دەکرد، بەلام بیرمکردەوە وتم نەکو شتێکی نەخوازراو

روبدا وتم کاکە نەوە هەر ئەوەنە بەسە. نەوشیروان وتی کاک عوسمان قسەی خۆشی لایە بۆ ڕێگە بێتاقەت نابن، من بێدەنگ بووم، کاک عوسمان وتی ئاخر ئەو برادەرانە مەگەر ختوکەیان بدەی پێبکەنن، ئیتر کەوتنینە ڕێ بۆ ئێوارە گەشتینە بناری چیای شا کێف، کە بنکەیەکی سەرەکی گەریلاکانی لێبوو، مام ڕۆستەم و کاک حامید وتیان ئێمە ناتوانین لەمە زیاتر ڕێ بکەین، ئێوە برۆن با ئەوان بێن و قسەبکەین، ناچار شێخ تاریق و نایف و وەیسی بە شاخی شاکێفدا هەڵگەراین. لە ئێوارە هەتا تاریک و ڕون گەیشتینە بنکەی سەرەکی عوسمان ئۆچەلان. بەقەراخ چەمێکا ئەڕوشتین سەیرمانکرد شتێکی سور لە ئاودکەدا ئەلە ئەکات. بینیمان عەزیز ئەقراوی بوو بەو بەیاینە ساردو سەرمایە خۆی ئەشت، چوینە لای عوسمان ئۆچەلان و دەستەی سەربازیی خواکورک. پێمانوتن ئەو برادەرانە لە فلان بنکە چاوەڕێدەکەن بۆ قسەکردن، لە پێشدا ماهیرو عوسمان پێزانینیان پیشاندا بۆ بەندەو کاک نەوشیروان بۆ ئەو هەوڵەی دەیدەین تا شەڕ نەبێت، وتیان با تاریک دابێت ئەکەوینە ڕێ، شەو بەڕێوەبوین دەم و بەیان گەیشتینە ئەو شوێنەی حامیدو مام ڕۆستەمی لێبوو. کۆبوونەوە دەستی پێکرد، عوسمان وتی چیتان لەئێمە ئەوێت؟ بۆ شەرمان لەگەڵ دەکەن، وتیان داوای حکومەتی هەرێم و بەرەی کوردستانی ئەمەیە:

**یەکەم** - شەڕ لە سنوری عێراق -تورکیا مەکەن.

**دووەم** - ناوچەی خواکورک چۆڵبکەن.

**سێیەم** - وەرن لەگەڵ وەزارەتی ناوخۆ پرۆتۆکۆلێک واژۆبکەن، چالاکی سیاسی و مەدەنی بەبێ چەک لەباشور بکەن.

**عوسمان وتی:** بۆ کاک نەوشیروان نەهات؟

من وتم نەخۆشە ناتوانێت ڕێبکات لە گوندی لێلکان چاوەڕێدەکات پڕۆتۆکۆلێک واژۆبکەن لەسەر ئەو خاڵانەی باسمانکرد، عوسمان وتی: ئەڵێن کاک نەوشیروان دانیشتووە، چۆن ئەتوانێت پڕۆتۆکۆڵ واژۆبکات؟ مام ڕۆستەم وتی کاک نەوشیروان هەموو دەسەلاتی هەیە، من ئەندامی پەرلەمانم ئەگەر کاک نەوشیروان بڵێ من بە قازیفە پەرلەمان وێران ئەکەم. عوسمان لەم قسەیە زۆر سەرسامبوو، لەم قسانەدا بووین گوێمان لە گرمەی تۆپ و گرمەی بیکەیسی بوو، عوسمان ڕوی لەمن کردو وتی هەڤال ئەمە دانوستاندنە یان پیلانە؟ وتم ناتوانم شتێک بڵێم تا نەگەڕێینەوە، لە گەڕانەوە لە نزیک گوندی لێلکان بە دەیان ماشینی چەکدارو میکزەمینیمان نەبینی بەرەو ناوچەکانی پەکەکە کەوتنەڕێ. شەڕ قەوماو گەرم بوو، ئێمە بەناو شەڕا بەرەو لایێ کاک نەوشیروان کەوتینەڕێ، ئیتر چیرۆکە سەیرو سەمەرەکان لێرە دەستپێدەکات.

بە ناو شەڕو تۆپ باراندا ئەڕۆیشتین، حامیدو مام ڕۆستم لەبەرئەوەی بەشی زۆری ژیانیان لە پێشمەرگایەتدا بەسەربردبوو، پێش من و شێخ تاریق کەوتبوون، بەناو شیوو دۆڵەکان و شوێنە ئارامەکاندا ئەیانبردین، حامید خێرا خێرا ئەیوت ڕۆسە ڕۆسە (واتە ڕۆستەم) پێنجوێنی چاک وەحیزی ئێمەتدا وەکوشت، چونکە چەکیان پێ نەبوو بە هەر نارەحەتیەک بوو گەشتینە لای نەوشیروان، زۆر شەکەت و مانووبوین، وتم کاک نەوشیروان بڕیار وانەبوو تا ئێمە ئەگەڕێینەوە هێرش نەکەن؟! وتی ئێمە نین، ئەوانن، ئیتر ناردی بەدوای حامیدە فەندی و کاک عوسماندا، ئەوانیش هاتن وتیان ئێمە نین ئەوە ڕەوەندەکانن! وتم بەڕێز ڕەوەند تۆپی لە کوێ بوو، یەکێکیان وتی کاکە تۆ تا تیانەچوی لەم ناوە بڕۆ، کاک نەوشیروان لەم قسەیە تورەبوو، جگەرەیەکی داگیرساند وتی کاکە ئەگەر ئەم نەبوایە ئەم ناوە ببوو بە گۆمی خوێن، ئیتر من تێگەیشتم کار لەکار

تـرزاوەو منـیش چـومەتە لیسـتەکەوە، کـاک نەوشـیروان پێیـوتم بـێ ئاگاداری من جوڵەنەکەی، تێبینم ئەکرد کە ئەچوم بۆ دەست شۆرین تارمـایەکم بە دواوەیە، بەهەر حـاڵ لەم کاتـانەدا ئەم بینـی مامۆسـتا بەکرو مامۆستا چەتۆو کاک حەمە تۆفیق رەحیم، لەهەولێرە ئەهاتن و ئەچون و چپەیـان لەگەڵ کـاک نەوشـیروان دەکـرد، خەریکی نـان و مـاس خواردن بـووم، کاک نەوشیروان هـاتە لامەوە وتی ئەم نـامەیە بخـوێنەرەوە، نامەکە بـۆ کـاک نەوشیروان نوسـرابوو، ئەڵێ خـۆت و شاندەکەتان بگەڕێنەوە، سبەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و پارتی لە پەرلەمان کۆدەبنەوەو بڕیاردەدەین(.... چییان لێ بکەین)، نامەکە زۆر بەتوڕەیی نوسراوبوو. پارووەکە لە قورگم گیرا. چومە لای نەوشیروان وتم کاکە من لەسەر شەرەفی جەنابت ئەم کارەمکرد، ئەوانیش وتیان مادام ئێوە لە بەینان چی دەکەن ئێمە ڕازین.

ئێستە چی بە ئۆچەلان و برادەرانی خواکورک بڵێم، نەوشیروان توڕەبوو دەموچاوی گرژبوو، جگەرە لە دوای جگەرە دایدەگیرساند، وتـی: دە تۆ بڵێ چیبکەم؟! وتـم: بەیانێک دەربکە، بڵـێ ئێمە چوین ڕێکەوتین هەر واژۆی مابوو، تێکیاندا، وتم: ناوی کەسیش مەهێنە بۆ ڕەچاوکردنی دۆخەکە، وتی: نابێت، وتم: بۆ؟

وتی: ئەگەر بەیان دەربکەم مام جەلال عاجز ئەبێت وەڵامدەداتەوە، ئەگەر وابـوو یەکێتـی ئەبێـت بە دوو کەرتەوە، چـونکە یەکێتـی واتـا جەلال تاڵەبانی، کە ئەمە دروستبوو، نەیارەکانی دێنە سلێمانی ئەمـان خۆن، ئەمە قسەی کاک نەوشیروان بوو لە دیوەخانەکەی کەریم خان، لە موجەسـیر مـانگی ١٠ی سـاڵی ١٩٩٢ هـاتینەوە هەولێـرو منـی لە مەکتەبی سیاسی داناو خۆی چوو بۆ کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و پارتی لە پەرلەمان. پاش چەند کاتژمرێک بە توڕەیی هاتەوە وتـی هەڵسـن بـا بڕۆینەوە، برادەران پرسـییان چیە بۆمـان باسـبکە ؟ وتـی فرۆشـراو بـڕایەوەو عەرەبوونەکەشـی وەرگیـراوە! ئیتـر ئـێمەو

شاندەکە هەموو هاتینەوە بۆ سلێمانی،بەداخەوە یەکەم بریاری گرنگی پەرلەمان ئەوە بوو شەری بەشێکی تری کوردستان بکەن بەناوی شەری پەکەکە، هەموو ئەندامان دەستیان بۆ شەر هەڵبری، جگەلە عەبدولخالق زەنگەنە کەنوێنەری زەحمەکێشانی ئەوسا بوو، لە رێگە هەندێ لەو برادەرانەی لەگەڵمان بوون، سەریان کردەسەرم من وەڵامم نەدانەوە، گەیشتینە سلێمانی کاک نەوشیروان وتی لە کوێ دائەبەزی؟ وتم لە نادی موهەندیسین، خواحافیزم لێکردن و نەوشیروان وتی ئاگات لە خۆت بێت هەر شتێک بوو لە رێی ملازم عومەرە پەیوەندیم پێوەبکە، چونکە دوایی زانیم کە بریاربووە پاکتاومان بکەن و بڵێن لە شەردا کوژرا، ئەو رێگری بوو، ئیتر بە تەواوی خۆم شاردەوە، چونکە بە فەرمانی گرتنی من دەرچوو بوو، گوایە من هۆکارم پەکەکە لەم ناوە بڵاوبۆتەوە، دەستمکرد بە خەباتی ژێرزەمینی، چەند بەیانم دەرکردو لە شوێنە گشتیەکانی سلێمانی بڵاوبوەوە، لە شوێنەی لێیبووم، ملازم کەریمی پاسۆک و ملازم عومەر ئەهاتن بۆلام، منیش لەرێگەی جیهازەکەمانەوە ئەمگەیاند بە شوێنی خۆی، ئاسایش هێرشی کردە سەرمان، چونکە رێکخراوێکمان هەبوو بەناوی پارتی رێخراوی کوردستان، رۆژنامەیەکمان هەبوو بەناوی ئازادی کوردستان، من و مامۆستا رەئوف حەسەن ئەچوین لە شام و دیمەشق رۆژنامەکەمان ئامادەئەکردو چاپمان ئەکرد، ئەهێنرایە باشورو بڵاوئەکرایەوە.

شەر درێژەی کێشا زۆر کەسیان گرت، ئەو کەسەی جیهازەکەی لەماڵدابوو خۆی تەسلیمی ئاسایش کرد، پەیوەندیی ئێمە پچرا، ناچار تەلەفۆنم بۆ حەمە شوانی حزبی شیوعی کرد، وتم دۆخێکی وا هەیە، ئەمانەوێت جیهازەکەی ئێوە بەکاربهێنین، وتی ئەمە نابێت، تۆ لە کوێی؟ وتم ئێستە کچێک ئەنێرم بۆ لات بە ئینگلیزی قسە ئەکات ناوی دیلانەو پەیامنێری بی بی سی و رۆژنامەکانی ئوستورالیا بوو

راپۆرتی بۆ ئامادەکردن، حەمە شوان کە کچەکەی بینیبوو، شۆکبوو پێیوتبوو تۆ دوێنێ هاتیت راپۆرتت لێوەرگرتم، ئێستە ئیش بۆ پەکەکە ئەکەی؟ منیش "شفرەکانم"دابوو بەو کچە، ئەویش بەباشی کارەکانی جێبەجێئەکرد. لەشەڕدا بە سەدان گەنجی باکورو باشور شەهیدبوون، ئۆپەراسوێنی سەندەویچ ئەوە بوو تورک لە سەرەوەو برادەرانیش لە خوارەوە بیانکەن بە بابۆڵەو قووتیانبدەن، بەلام "لە قورگیان گیرا"، درێژبوونەوەی شەڕەکە بە بەرژوەندی تورکیا ئەشکایەوە، تا حافز ئەسەد هاتە سەر خەت، بڕیاری ئاگربڕی لێوەرگرتن، لەم دوایەیەدا عوسمان ئۆچەلان بۆی گێرامەوە کەلە بەرەی خواکورک کاک کۆسرەت هاتە سەرخەت وتی شەر ئەوەستێنین ئەگەر "ئەوان" بیوەستێنن، عوسمانیش وتی ئێمە وەکو پەکەکە ئامادەین بۆ شەڕ وەستاندن، چونکە "ئاسف شەوکەت" بەفەرمانی ئەسەد فشاری خستبووە سەر هەموو سەرانی باشور، ئیتر لەمانگی(٣) شەڕ وەستا، گفتوگۆی نێوان وەزیری ناخۆی ئەوکاتەی هەرێم و نوێنەری پەکەکە دەستپێکرد، پەکەکە هاتنە ناو شارەکان و چالاکی مەدەنیان دەستپێکرد، منیش لەژێر زەمین هاتمە سەر زەمین. کەریم سەلامی پاسۆک منی برد بۆ هەولێر، چونکە ماڵم لە هەولێر بوو، لە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەککگرتن دانیشتبوین، خوالێخۆشبوو سامی عەبدولرەحمان هات منیان پێشکەش کرد، وتی ئەیناسم کاکە ئەوە ماوی؟ وتم هەر ئەمێنم لەو کاتەدا عومەر ناوێک هاتە ژورەوە وتیان ئەمە نوێنەری ئێمەیە لە ئەنکەرە، ئیتر خۆی دەستیکرد بە قسەکردن، رویکردە کاک سامی وتی ئەو ژەنەراڵەی سەرکردایەتی شەری پەکەکەی دەکرد، کۆبوونەوەی پێکردین و وتی ئێوە بەڵێنەکەتان بەجێنەهێنا، کەزانیان من نوێنەری یەککگرتنم، منیان وەدەرنا، عومەر بۆتانی وتی ژەنەراڵەکە بڕێ پارەی کەمی پێبوو، بەتورەییەوە فڕێدایە سەر مێزەکە بۆیان، کاک سامی و کاک کەریم زانیان مەسەلەکە

قوڵبوەوەو بابەتەکەیان گۆڕی، هەندێ پرسیاری تایبەتیان لە من کردو خــوا هەڵنــاگرێ کــاک ســامی وتــی هەر کارێــک بە ئێمەبــوو ئەوە تەلەفۆنەکەم من ئامادەم.

ڕۆژان هات ڕۆژان ڕۆیی، کاک نەوشیروان جیابووەوە، مام جەلال زویربــوو یەکێتــی بــوو بە دوو لەتەوە، ئەوەی خــوا پێنــاخۆش بــوو یەکێتی و گۆڕان بەیەکیان کرد، ڕۆژێک چووم بۆ سەر گردەکە بۆلای کاک نەوشیروان، دوو بە دوو لە ژوورەکەی دانیشتین، وتم لە بیرتە لە ماڵی کەریم خان وتت چی؟ وتت ئەگەر یەکێتی ببێت بە دوو کەرتەوە ئەمــان خــۆن. تورەبــوو زۆر قســەیکرد بە دورو درێــژی زۆر شــت و نهێنی بۆ باسکردم، ئەگەر زەمانە لیمان گەریت ڕۆژیک ئەبیت بوتــان بگێڕمەوە.

•

**هەندێک تێبینی:**

١. عومەر بۆتــانی نوێنەری یەگرتن بــوو لە ئەنکەرە زۆر شــتی سەیرو سەمەرەی باسکرد (کنگرو ماست بۆ کاتی خۆی).

٢. ئاســف شــەوکەت بەڕێــوەبەری هەواڵگریــی ســوری بــوو، فشاری خستەسەر هەموو سەرکردەکانی باشور کە شــەڕ بوەستێنن، پێی وتبون ئەگەر شەر نەوەستێ تورکیا هەتا باشــور داگیردەکات، وا ئێســتا بەنەوی ئۆپەراسیۆنی شــەنگالەوە، خەریــکە ئەو پیلانە زینــدو ئەبێتەوە.

٣. عەبــدوڵا ئــۆچەلان عوســمانی دەرکــردو وتــی ئەبێــت بــیکەن بەشوانی پەزو بزن، چونکە خۆی بە دەستەوە داوە.

٤. عوســمان لەگەڵ یەکێتــی ڕێــکەوت بە خــۆی و چەکەکــانیەوە هــاتنە نــاوچەی زەڵــێ کە جــێگەی تــایبەتی مــام جەلال بــوو لە کــاتی شۆڕشدا.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، من لە مردن ڕزگارم بوو

## (٨)

# "جانتاکەی یاسینی مچە و پارەکەی مەعارف "پەروەردە"

هاوینی ساڵی ١٩٦٦ بوو، لە کوردستان و بەتایبەتی لە سلێمانی لە گەرمەی چالاکی و کاری شۆڕشگێڕیدا بوین، بەندە خەریکی کاری ڕێکخستنی قەزاو ناحیەکان بووم، لە کۆبوونەوەیەکی لیژنەی محلی سلێمانی، نامەیەکی قیادەی مەرکەزی خوێنرایەوە داوای پارەیان کردبوو، دەڵێن رەوشی ئابوریمان خراپە، هاوڕێیان سێ ژەمە نان و راشی دەخون، بەڵکو دەست بەسەر برە پارەیەکی حکومەتدا بگرن.

کەوتینە بیرکردنەوەو پیلان دانان، ڕۆژێک هاوڕێ حسێن عارف هات وتی پارەی بەڕێوەبەرێتی پەروەردە نزیکەی (20000) دینار ئەبێت. پارویەکی چەورە وانیە؟ منیش وتم بەڵێ وایە، پیلانمان دانا بەندە، حسێن، شێخ عەلی، حمە کوڵەباڵ.

ڕۆژو کات و شوێنی گواستنەوەی پارەکەمان دەستنیشانکرد، ئەو کاتە بەڕێوەبەرێتی پەروەردە لە شوێنی ئێستەی کاسۆ مۆڵ بوو، ئێمە لەبەر دەرگای مزگەوتی گەورە چاوەڕێی ئەو دوو پیکابەمان دەکرد کە پارەکەیان دەهێنا، دوو پیکابەکە هاتن، یەکێکیان ژمێریارو ئەویتر دوو جانتا پارەو چەند پۆلیسێکی تیا بوو، وەکو هەڵۆ حەمە کوڵەباڵ پریکرد بە جانتا گەورەکەدا، دوو هاوڕێکەیتر پەلاری پۆلیسەکانیاندا، تەقە دروستبوو، دەست بەسەر پارەکەدا گیرا، من و شێخ عەلی پێش تەقە دەست پێکردنەکە چوینە ماڵی هاوڕێ ئەحمەد کە موزەمید بوو، ماڵی لە یەکێک لە کۆڵانەکانی پشتی سەرا بوو، خێرا جانتاکانمان بەتاڵکردو هاوڕێ ئەحمەد تەنورەکەی ئاگرداو جانتاکامنان سوتاند، پارەکەمان خستە دوو بوخچەوەو دامانە دەستی دوو هاوڕێی ئافرەت.

من و شێخ عەلی و ئافرەتەکان سواری عەرەبانەیەکی دوو ئەسپی بووین، حەمە کوڵەباڵیش سوار عەرەبانەیەکی تر بوو کەوتینە ڕێ بۆ ماڵی وەهابی پۆلیس، کەلە پشتی سەدەکەوە بوو، ژنەکان ڕۆشتن و شێخ عەلی و پارەکەمان لە ماڵەوە بەجێهێشت، من و حەمە کوڵەباڵیش بە شەقامی سابونکەرانا هاتینە خوارەوە تا گەیشتنە بەر چوخمەکەی سابونکەران، لای چوخمەکە جگەرخانەیەک هەبوو، حەمە وتی برسیمەو داوی جگەری کرد، منیش چومە چایخانەکەی بەرانبەری، داوای نان و ماستم کرد، لە پڕ کۆمەڵێک چەکداری کوردو ئەمن و پۆلیس کۆڵان و شەقامەکانی سابونکەرانیان گرت، چەکدارە کوردەکان حەمە کوڵەبالیان ناسی ویستیان بیگرن، ئەویش پەلاماری دەمانچەی لیدان، دوو کەس لەنەوان، دوو ریز کلاشینکوفیان لیداو شەهیدیان کرد، هاتنە چایخانەکە منیان نەناسیەوە، چایچیە کە هاورێی خۆمانْ بوو خێرا سینە چای تێکردو دایە دەستم. منی تا کۆڵانەکەی خوارتر بەڕێکردو سینەکەی لێوەرگرتم وتی برۆ خۆت ڕزگار بکە. ئیتر کەوتنە پشکنین و گەڕان، ماڵی شێخ عەلی کەلەسەر فلکەکەی شەقامی سابونکەران بوو، کون و قوشبنیان پشکنیبوو، ئەگەر شێخ عەلیان بگرتایە لەویا ئەیان کوشت، من گەڕامەوە بۆ هێلانەکەی خۆم بۆ ماڵی مەحمودی قالە فەرەج لە گەڕەکی ئەقاری بوو، لەوێ شەهید ساڵح عەسکەری چاوەڕێی ئەکردم، کە بینیم ئاگادارمکرد ئۆپەراسیۆنەکەمان سەرکەوتبوو، بەڵام شەهیدێکماندا. ئێمە لەگەڵ شەهید ساڵح خەریکی قسەکردن بوین لە پڕ سەبری خانی خوشکی حەپسە خانی خاوەن ماڵ خۆی کرد بە ژورا، بە بۆڵەبۆڵ و دوعاو نزا "یاخوا جەرگیان بە ئاو بێت" وتمان چییە بۆ دوعا ئەکەی؟ وتی لەگەڵ جەماله فەندی چوین مسواک بکەین چەند چەکدارێک مووچەی هەموو مامۆستاکانیان فڕاند وپێیان حەرام بێت یاخوا، حەپسە خان سەیرێکی من و هاورێ ساڵحی کرد سەرێکی بادا، وتی دادە وەرە خوا کەریمە! بەو پارەیە بڕێکی باش چەکمان کڕی و شانە

چەکدارەکانمان پڕچەککردن، بڕێکمان نارد بۆ هاوڕێیانی چەکدار لە دەرەویان و کلکە سماق، هەندێ ماڵە شەهیدمان بەسەرکردەوە. ئیتر هاوڕێ سالحمان ناردەوە بۆ بەغداد، چونکە سالح عەسکەری ئەندامی قیادە بوو، بەرپرسی هەموو شانە چەکدارەکانی قیادەی مەرکەزی بوو، مەبلەغێکمان بە هاوڕێ فاروق نوری و خێزانە بەڕێزەکەیدا نارد بۆ بەغدا، سەبیحە خانی خێزانی فاروق جلی کوردی لە بەرکرد، سوخمە "هێلەک" مان بۆدوری پڕمانکرد لە دەیی و پێنجی لەبەرمان کرد، بەم شلکە بڕەکەی گەیاندە بەغداد.

کۆنفرانسی فراوانی کادرە پیشکەوتوەکان لە بەغداد دەبەسترا، من و موسلح بانگێشتکرابوین، من جانتایەکی سەوزم هەبوو ناوی جانتاکە بە قوماش داپوشرا بوو، قوماشەکەمان لائەبردو شتە نهێنییەکەمان لە ژێر دادەناو کارتۆنێکمان دەخستە ژێر و دامان دەپۆشی بەسریژو کەتیرە قوماشەکەمان ئەلکان بە مقبا کەداو جل و کەلوپەلی پێویستمان لەسەر دادەنا، هەر بەو شێوە پاشماوەی پارەکەو ئەونوسراوە نهێنیانەی پێویست بوو بیبەین بۆ بەغدا لەو جانتایەدا شاربوومانەوە.

ئەوکاتە تەکسیەکانی ڕێگەی بەغدا دوو لە پێشەوە سوار ئەبوو، سێ کەسیش لە دواوە، من و موسلیح لە پێشەوە سوار ببوین دوو کەسی تریش لە دواوە، شۆفیرەکە وتی نەفەرێکیشمان لە ئەقاری سوار ئەبێت، کەلە گەڕەکی ئەقاری وەستا، یاسینی حاجی مستەفا بەخۆی و جانتایەکی سەوز هاتە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە، ئەو کاتە یاسین خوێندکاری کۆلێژی وەرزش بوو لەبەغدا، پێشتر یاسین شەقاوەو چەقۆ وەشێنی پارتی بوو، لەشەڕی قوتابیانی شیوعی و پارتیدا زۆر جار شەڕمان ببوو، ئەو چاوی کزبوو ئیمەی نەناسیەوە، ئێمە قژو سمێڵمان بۆیە کرد بوو، ئەوکاتە وەک ڕێزێک بۆ ستالین سمێڵ تاشین نەنگی بوو! پێش ئەوەی بگەینە گەراج یاسین دابەزی، ئێمەش لە گەراج دابەزین جانتاکەمان هەڵگرت و سواری تەکسیەک بووین بۆ

ماڵی ساڵح عەسکەری لەگەڕەکی "بەیاع "، پاش ماوەیەک هاوڕێ ئەحمەدی دەلاک و هاوڕێ (متی) هاتن بە خۆشی ئەوەی پارەکە ببەن، کە جانتامان کردەوە هەندێ جلی وەرزش و کالەو کراس و فالینەی چڵکنی تیا بوو، یەکسەر هاتە بیرم یاسینیش جانتاکەی وەکو هی ئێمە بوو.

کە باسمان کرد هاوڕێ ئەحمد وتی ئێستە یاسین هەموو حوکمەتمان لێتێئەگەینی، خێرا دەستکرا بە ڕێوشوێنی خۆپاراستن، کۆبوونەوەکە دواخرا، زۆر شوێن ئاڵوگۆڕی پێکرا، من موسڵیحم برد بۆ ماڵی خوشکم لە مدینەی حوریە، چونکە لەناو جانتاکەدا زۆر ناو و شوێن و ناونیشانی ئاشکرای تیا بوو. باوەڕناکەم ئەو شەوە کەسێک لە ئەندامانی قیادە تا بەیانی خەوی لێکەوتبێت. بەیانی جانتاکەمان هەڵگرت هاتینە چایخانەیەک بەرانبەر گەراجی سلێمانی "حەمەی عەلۆل"، کاتێکمان زانی یاسین بە تەکە تەکو جنێودان و بۆڵەبۆڵ خۆی بەناو محلەکەدا کرد و ئێمەیش هەر لەوکاتەیا چوینە ژورەوە، وتمان جەنتاکەمان گۆڕاوە، ئەمەی تریان جانتای ئێمەیە، خێرا جانتاکەی خۆمان هەڵگرت و هاتینە دەرەوە، سواری تەکسیەک بووین بۆ ماڵی ساڵح عەسکەری، لە ڕێگە ماسیەکی گەورەمان کڕی و بردمانەوە بۆ لای گەلاوێژ خانی ژنی هاوڕێ ساڵح بە ڕۆنی کلکە سماقەوە نیوەڕۆ کردمان بە ئاهەنگ.

سەرنج:

١) ساڵح عەسکەری برای پارێزەر مستەفا عەسکریە لە حەقەکانی کلکە سماقن.

٢) یاسینی مچە یان یاسینی حاجی مەستەفا برای عومەری مچەیە لەسلێمانی ناسراون، لەم دواییە ئەم چیرۆکانەم لە یانەی فەرمانبەران بۆ یاسین ئەگێڕایەوە، بە سەرخۆشی ئەی وت ئاخ چۆن ئەو پارەو نهێنیانەم لەکیسچوو ئێوەی پێ لەسێدارە بدەم.

٣)    شێخ عەلی بەرزنجی باوکی ڕۆماننووس ڕوناکبیری هەڵکەوتوو بەختیار عەلیە.

٤)    حەمە کوڵە باڵ کەسایەتی ناوداری هۆزی کۆکۆیی هەڵەبجەیە.

٥)    لەوانەیە ئێستە بە بیری هەندێ کەسدا بێت بپرسێت لەو پارەیە چەنت بەرکەوت، بە بڕیاری لیژنەی محەلی سلێمانی کە ئەوکاتە ئەدیب و چیرۆکنوسی بەناو بانگ حسێن عارف بەرپرسی بوو، بڕیاریاندا قەلەوێرەیەکم بۆ بکڕن بە ٧٥٠ فلس، هەتا ئەم دواییە لە ماڵی مەحمودی قالە فەرەج مابوو ژەنگدای پۆشی بوو.

٦)    وەهابی پۆلیس ئەندامی حزب بوو(باوکی وریا کە بە تەور کوژرا).

چەپێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، ٧٥٠ فلسیش بەر ئێمە کەوت.

# (٩)

# ئەزانن مادام میتران بۆچی گریا؟!

کاتێک بەڕێز ئۆچەلان فڕێنرا، جوڵانەوەی شۆڕشگێڕو ئازادیخوازی جیهان شۆکبوون، ئەو ئۆپەراسیۆنە نێودەوڵەتییە بە بەرچاوی جیهانەوە کارێکی زۆر قێزەون و تۆقێنەربوو، گورزێکی بە ئازاربوو لە جەستەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی باکوور درا، ئێمە لە ئینستتیوتی کوردی لە بەرلین، کەوتینە چالاکی کۆڕو کۆبوونەوەو ڕێپێوان. بەمەبەستی ڕیسواکردنی ئەم پیلانەو ئازادکردنی ئۆچەلان یان گۆڕینی حوکمی لە سیدارە بۆ بەندیی هەمیشەیی، پەیوەندیمان بە میدیاکانی ئەڵمان و جیهانەوە بەتایبەتی میدیاکانی ئەورووپاوە کرد.

ئەم مەبەستە واژۆی هەموو ئەو کەسانەمان کۆکردەوە کە خەڵاتی نۆبلیان وەرگرتبوو، بۆ نموونە: لە بەرلینەوە تەلەفۆنم بۆ نەجیب مەحفوز کرد لە قاهیرە "وتی بەڵێ بەڵێ (نعم نعم) بەهەر دەپەنجەکەم واژۆی ئەکەم!"، واژۆو ناو و ناونیشانی ئەوانەماندا بە هەموو باڵیۆزخانەکانی جیهان لە بەرلین.

هەر لەچواچێوەی ئەو چالاکییانەدا، کۆنگرەی نەتەوەیی و ئینستتیوتی کوردی لە بەرلین کۆنفرانسێکمان لە برۆکسل ڕێکخست بە ناوی کۆنفرانسی ئاشتی و ئاشتەوایی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین، کە بەشێکی زۆری حزب و گروپ و ڕێکخراوە کوردستانییەکان تیادا بەشداربوون، ئەمە جگە لە کەسایەتی سیاسی و دیپلۆماسی دیاری ئەورووپاو ئەمریکاو ڕۆژهەڵاتی ناوین تێیدا بەشداربوون. چەند ئەندامێکی ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانی و ئەندامی کۆنگریس و ئەنجومەنی سیناتۆرەکانی ئەمریکاو ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپاو زۆر

له سـەرۆک و نـوێنەری حـزبە چەپ و سـەوزو سۆسـیال دیموکراتەکانی ئەورووپا ئامادەییان هەبوو.

"چیرۆکە سەیرو هەست تەزێنەکان لێرە دەستییانپێکرد:

لەبەرئەوەی کۆنفرانسەکە بەسرودی ئەی ڕەقیب کرایەوە، هەندێ موسڵمان و کۆمۆنیستی سەلەفی و پەڕگیر لەهۆڵەکە چوونە دەرەوە. هەڤـاڵان لێیـان پرسـیم: ئەوانە زۆربەیـان باشـووریین، بـزانە بـۆچی چـوونە دەرەوە؟ منـیش لـێم پرسـین، کۆمۆنیسـتەکان وتیـان هـزری نەتەوەپەرستی لای خەڵک دەورووژێنێ و قبووڵمـان نییە، لە برایـانی مسـوڵمانم پرسـی وتیـان: ئەم سرووودە دەڵێ (دینمـانە ئایینمـان هەر نیشتمان)، ئامانەوی گوێمان لەم سروودە بێت. هەر چونێک بوو دوای گفتوگۆیەکی کەم و تەواوبوونی سروودەکە هاتنەوە ناو هۆڵەکە.

لەکـۆنفرانس وتـاری بەنـرخ و پـڕ بـایەخ خـوێنرایەوە، گەلاڵەی یاداشتنامەیەک ئامادەکرا. تا بدرێ بە نەتەوەیەکگرتووەکان، ولاتانی ئەورووپا، ئەمریکا، ڤاتیکان، کۆنگرەی ئیسلامی و هەموو داو و دەزگا جیهانییەکـان لە بـارەی سـتەمدیدەیی کـورد، شۆڕشـی بـاکوورو ئـازادکردنی ئـۆچەلان، یـان گـۆڕینی حـوکمی لە سـێدارەدانەکەی بـۆ بەندیی هەتاهەتـایی، هەمـوو لەسـەر ئەمە ڕێککەوتـین و دەسـتی بەڵێ بەرز کرایەوە.

لەکـاتی پشـوودا هەنـدێ ئـاڵۆزیی و مقۆمقـۆ پەیـدابوو، هەڤـاڵان "شـەهید ئەردال، ئەحمەد ئاکتاش" بانیگیـانکردم وتیان: ئەو هەڤـاڵانەی ڕۆژهەڵات بۆچی پشێوییان تێکەوتوە؟ کەچووم بۆ لایان وتیان: ئـالای کوردستان دیار نییەو ئێمە قبوڵمان نییە.

چونکە هەڤاڵەکان لەسەر دووانگەی وتار خوێندنەوەکە سێ پارچە قوماشـی زەردو سـوورو سـەوزیان دانـابوو، منـیش بە هەڤـاڵانی ڕۆژهەڵاتم وت: برا ئالای کوردستان چەند ڕەنگە؟ وتیان چوار ڕەنگە

ئەوەتا ڕەنگی سپی تێدا نییە، خێرا چووم لە کارگێڕیی هۆتێلەکە چەرچەفێکی پاکی سپیم هێنا، لە بەینی ڕەنگی زەردو سورەکەدا دامناو بوو بە هەر چوار ڕەنگەکەی ئاڵای کوردستان، برادەرانیش هاتنەوە ناو هۆڵەکەو کۆنفرانس دەستپێکردەوە. (ئەوانەی لە کۆنفرانسەکەدا ئامادەبوون، دەستەبژێری سیاسی و ڕۆشنبیری دیاسپۆرای کوردبوون!)

نۆرە هاتە سەر وتاری مادام میتران، لە دەسپێکی وتارەکەیدا وتی: "ئەو کاتەی ئۆچەلانیان بە چاو بەستراوی پیشاندا 'من گریام '، چونکە زەلیلبوونی کوردم بە بیر هاتەوە، لە سێدارەدانی شێخ سەعیدو سەید ڕەزام بە بیر هاتەوە کە لە ژێر ئەو ئالایەدا هەزاران کوردیان لەسێدارەدا، ئاخر من لەبەرئەوە گریام.

ئەگەر یادگەم بەهەڵەمدا نەبات، لە نێوان دکتۆر مەحمودو دکتۆرە پەروینی حاجی ڕەحیمدا دانیشتبووم، ئەوان فەرەنسیەکەیان بۆ ئەکردمەوە بە کوردی، هەر لەکاتی وتارەکەیدا چاوە وردیلەکانی پڕبوو لە فرمێسک، بە دەم هەنسکەوە وتی: چەند کەسێکی کورد بە تەلەفۆن پیرۆزبایی گرتنی ئۆچەلانیان لێکردووم، لێیان پرسیم بۆچی گریاوی؟ لە وەڵامدا پێموتن بۆ زەلیلی ئەقڵی سیاسیتان دەگریم. ئەم دانیشتنە بە تراژیدیاو خەمباری تەواوکرد، بۆ سبەینێ کۆنفرانس دەستپێکردەوە، توانیمان یاداشتەکە تەواوبکەین و بگەیەنینە ئەو جێگایانەی مەبەستمان بوو.

چەپکێ گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە ، منیش بە خەمباری و دڵپڕییەوە هاتمەوە بۆ بەرلین.

## (١٠)

## "سوڵحەکەی هاوڕێ عەلی و داواکارییەکەی حەمە سویلە"!

کاری حزبیم گواسترایەوە بۆ سلێمانی، لە لیژنەی قەزاو ناحیەکانی سلێمانی کارمدەکرد. هاوڕێ عەلی سەعید کە بەهۆی کاری حزبی و چالاکی سیاسی لە کارگەی چیمەنتۆی سلێمانی لە سەرکار لابرابوو، وەک کادری حزبی لە لیژنەکەماندا کاریدەکرد، لیژنەکەمان پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە: بەندە، عەلی سەعید، سەعە سوری جافەرانی، حەمە سویلە، عەلی باراوی، کەریمی عەبە چنگیانی و چەند هاورییەکی تر کە ناوەکانیانم بیرنەماون.

بەپرسەکەمان نائب عەبدوڵلا بوو، زۆربەی ئەندامانی لیژنە لەگەڵ نائب ناتەبابوون، قسەی خۆمان بێت منیش زۆر پەزم پێی نەدەهات، لە هەمووی سەیرتر جیهانی سدیق شاوەیسیان گواستەوە بۆلیژنەکەی ئێمە، جیهان ڕۆشنبیرێکی گەورە بوو، ڕەخنەی زۆری لە سیاسەتی (ڕاسترەوی حزب هەبوو) ئیتر نیوەی کۆبوونەوەکان بە گفتوگۆو ڕەخنەگرتن لە حزب کۆتایی دەهات، لەبەرئەوەی من زیاتر پابەندی بڕیارەکانی حزب بووم و ڕێزم بۆ هاوڕێ نائب دادەنا، ئەویش منی کردبووە جێگری خۆی.

هاوڕێ عەلی لەبەرئەوەی لە کارەکەی دەرکرابوو، بۆ بژێویی ژیانی دوکانێکی دەرزیلێدانی لە فولکەی بەر خانەقای ئێستە دانابوو، دوکانەکەی بووبوو بە جێگەی کۆبوونەوەی هاوڕییانی سەرشەقام و بەرخانەقا، هاوڕێ علی بژێویی ماڵ و منداڵی بەو دوکانە دابین دەکرد، حزبیش مانگی ٧ دینارّی بۆ بڕیبۆوەو لە شەقامی ئیبراهیم پاشا خانویەکی یەک هۆدەو هەیوانی مانگی بە ٣ دینار گرتبوو، وابزانم ٣ منداڵیشی لە قوتابخانە دەیانخوێند، ئەو ئاوا دەژیا، یەک ڕۆژیش لە خەبات کۆڵی نەدا.

هەر لەنزیکی ئەوەوە، چەند دوکانێک ئەولاتر جێگەی شەقاوەکانی بەرخانەقابوو، ئەوان زۆر دژی شیوعی بوون، هەر کەسێکیان بناسیایە جنێوبارانیان ئەکرد یان شەڕیان پێ ئەفرۆشت، تەنیا کەسێک بەرەوڕوویان ببوایەوە، هاوڕێ عەلی بوو، هەر کەسێک بچوایە بۆ دەرزیلێدان بۆ دوکانەکەی هاوڕێ عەلی ئەویش دەکەوتە بەر ڕەحمەتی جنێوو توانجی ئەوشەقاوانە.

ڕۆژێک من و حەمە سویلە بۆ دوکانەکەی چووین، بینیمان دوکان بەسەر یەکا شێواوە، شووشەی جامخانە شکاوە، دەرمان و دەرزی بەو ناوەدا پەرشو بڵاوبوونەتەوە، دوکانەکە وێران بووە، پرسیمان چی ڕوویداوە؟ وتیان چەند کەسێک گیچەڵیان بە کاک عەلی کردو دوکانەکەیان ئاوا بەسەریەکدا داوە، کاک عەلیش زامداربووەو لە خەستەخانەیە.ئێمە چووین بۆ خەستەخانە، لەوێ نەمابوو، چووین لەماڵەوە بیینیمان، لەناو جێگە کەوتبوو و ماڵ و منداڵ دەورەیان دابوو. ئێمەش کات و شوێنی کۆبوونەوەمان داناو ماڵئاواییمان لێکرد، بەهەر حاڵ لە کات و شوێنی دیاری کراودا، هاوڕێ عەلی بەسەرو گوێلاکی پێچراوەوە هات، پاش گفتوگۆ، هاوڕێ عەلی بە بڕیاری حزب، شکاتی لە شەڕ فرۆشەکان کرد، ڕاپۆرتی دکتۆریشی هەبوو کە زۆر ئازاری هەیە و خوێنی زۆری لە بەر ڕۆیشتووە، شکات کراو دادوەر بڕیاریدا تاوانباران چوار مانگ بەندبکرێن، یان بە حەوت سەت دینار لەگەڵ هاوڕێ عەلی ڕێکبکەون، ئیتر چەند کۆبوونەوەیەکمان هەر باسی ئەم شەڕەو سوڵح و تۆڵەسەندنەوە بوو.

پاشان هەرکەس چووین بەلای کاری خۆمانەوە، پاش ماوەیەک بۆ کۆبوونەوەی مانگانە گەڕامەوە، لەبەرئەوەی ناوم لە بازگەکان هەبوو، پێش ئەوەی بگەمە ناو شار، لە خاڵی پشکنینەکەی سەرکارێز دائەبەزیم و بە گۆڕستانی سەیواندا دەهاتمە ناو شار، ماڵی (ڕەفعەت زوهدی) لە گەڕەکی دەرگەزێن بوو، کە دەکەوتە سەرپەڕی شار، دەمبینی هەموو جارێک ساوەریان هەیە، ئەوجارە لە دەرگاکەمداو

وتیان فەرموو! وتم ئەگەر ساوەرە، نایەمە ژوورەوە، ئەو شەوە لەوێ پشومداو بەیانی من و حەمە سویلەو سەعە سور چووین بۆ لای هاوڕێ عەلی، بە ڕوخۆشی و پێکەنینەوە هات بۆ لامان وتی بە کفتە دەعوەتتان دەکەم، چووین کفتەمان خواردو بینیمان ماڵ پۆشتە کراوەتەوە، کەلوپەلی تازەو کومبارو سۆپای عەللادین کراوە، منداڵەکان پۆشتەو پەرداخ کراونەتەوە، حەمە سویلە وتی هاوڕێ چییە بیتاقەتان بۆ دەرچووە؟ هاوڕێ عەلی وتی نا مەسڵەتم کردووە. خزمان وتیان لەگەڵ شەڕفرۆشەکاندا هەر دۆست و ناسیاوی یەکترین و بامەسڵەت بکەین و پێکبێینەوە باشترە، ئیتر سەدو حەفتا دینارم وەرگرتووە، ئەوەی بینیتان هی ئەو پارەیەیە. داوام لەئێوەش هەیە لە کوبوونەوەدا پشتگیریم بکەن، با حزب ڕازی بیت، ئیمەش وتمان ئەمە باشترە لە تۆڵەسەندنەوە، چونکە حزب ڕێگە بە تۆڵەسەندنەوە نادات، هاوڕێ عەلی وتی داواکاری ترتان هەیە؟ هاوڕێ سەعە سور وتی گلۆسێک جگەرەی جمهووری. من وتم جووتێک پێڵاو، حەمە سویلە وتی کراسێک، لە کۆبوونەوەدا ئێمە پشتگیری سوڵحەکەمان کردو بەم جۆرە مەسەلەکەی هاوڕێ عەلی کۆتایی هات.

ڕۆژی دواتر حەمە سویلە وتی کارم پێتە، وتم فەرموو: وتی بمبە بۆ ئەو شوێنەی لە هاوڕێ عەلییان داوە. وتم بۆچی؟ وتی چەند جنێوێکیان پێدەدەم و دەماریان دەگرم، وتم مەسەلە چییە هاوڕێ؟ وتی ئەمەوێ بایی ٥٠ دینارم لێبدەن، چونکە بە تەمای ژن هێنانم پێویستم بە ٥٠ دینارە، وامزانی دەیەوێت تۆڵەی هاوڕێ عەلی بکاتەوە، چونکە دەمانچەیەکی ٧ تیری پێبوو، چووینە بەردەم شەقاوەکان کلکی دەمانچەکەی لە ژێر پشتێنەکەی دەرهێنابوو لەبەر خۆیە هەندێ جنێو بۆڵە بۆڵی کرد، ئەوانیش بێدەنگ بوون و قسەیان نەکرد، حەمە سویلەش دەستبەتاڵبوو، چەپکێک گوڵ و چەپێک نێرگز، ئەوکاتە ئاوا خەباتمان ئەکرد

## (١١)

# "حەپسخانەی ماوەت - باستیلی کوردستان"

کاتی کودەتای ١٩٦٣، من بەرپرسی شاری هەڵەبجە بووم، لەیەکەم ڕۆژی کودەتاوە بەعسیەکان بەیاننامەکیان دەرکرد بەناوی بەیانی ژمارە (١٣)، ئەڵێ بۆ هەموو هێزە چەکدارەکان لەهەر جێگەیەک شیوعیتان بینی بیانکوژن، بە هەزاران کوژراوو بە هەزاران ڕویانکردە کوردستان، هاوکات مەکتەبی سیاسی پارتیش بەیاننامەیەکی تایبەتی بڵاوکردەوە، ئەڵێت شیوعیەکان رویانکردۆتە کوردستان، بیانگرن و ئازاریان بدەن. ریگەی چالاکی سیاسیان لێبگرن، لای خەڵک رویان رەشبکەن.

دوای ئەم بەیاننامەیە، هێرشکرایە سەر بنکە سەربازیەکانی (بەمۆ، وەڵەسم، کلکەسماق، گەرمیان و ئەو شوێنانەی بنکەی سەربازیی شیوعی تیابوو، لە هەموو بنکەکان کوژراوو بریندار هەبوو، لە هەندێ جێگە بەرخۆدانێکی کەم هەبوو، دوایی هەموو خۆیان بەدەستەوەدا، چونکە هێزی پێشمەرگە چەکی باشیان پێبوو، شارەزای شەڕکردن بوون.

ئەو کات ئێمە لە بنکەی وەڵەسم بووین بە نیازی "جەولە" من و سەید تۆفیق و باسام لە بەرزاییەکانی پشتی وەڵەسمەوە چەند کیلۆمەترێک دوور کەوتینەوە، کە گوێمان لە تەقەی تفەنگ و هەراوهوریا بوو گەڕاینەوە، هەتا ئێمە نزیک بووینەوە، هاوڕێیان خۆیاندا بوو بە دەستەوە، داوایان لە ئێمە کرد خۆمان بەدەستەوە بدەین، ئێمە ڕەتمانکردەوە، لەگەڵ پێنج بۆ شەش هاوڕێی چەکدار بەرەوە گوندی یالان پێ کەوتینەڕێ.

پاش چەند هەفتەیەک لەو گوندانە سوڕاینەوە، پاشان دزەمان کردو هاتینەوە ناوشاری هەڵەبجە، کەوتینە گەڕان و بەرزکردنەوەی

مۆڕالی ڕێکخستنەکان، پاشان من و قالەی حاجی حسێنی پێنجوێنی بەرەو پێنجوێن کەوتینەڕێ، لە نێوان گوندی گامێش تەپەو وەلەسمدا ئێمەیان گرت، بردنیان بۆ بنکەیەکی پێشمەرگە، وەستا مەحمودی نالبەند بەرپرسیان بوو، وەستا مەحمود خەریکبوو ولاخی نال ئەکرد، ئەو چەکدارەی ئێمەی گرتبوو هاواری کرد دوو شیوعیم هێناوە، وەستا: بیانهێنە با نالیان کەین، کەئێمەیان ناسی کێن و کوڕی کێن، ڕێزیان گرتین و نالیان نەکردین!!.

بردنیانە پێنجوێن و بە کەفالەت و مەرجی ئەوەی لەشار نەچینە دەرەوە مەرەخەسیان کردین، کەفیلەکەمان عەلی مامە قادر بوو، حاکم ئەحمەد گەلالی پێیوت، ئەگەر ئەمانە رابکەن پێنج سەد دینار جەزا ئەدرییت، مامە عەلی وتی بەلی هەموو (دەلوت) بۆ ئەژمێرم، پاش ماوەیەک منیان گرت و بەرەو بەندیخانەی ماوەت بە ڕێیان کردین.

لە سیاگوێزەوە بە شاخی سورکێوا هەلگەڕاین، بە لێدان لە ژێر بەفربارین و برسێتیدا چەند شەو ڕۆژ ڕێگەمان کرد تا گەشتینە بەندیخانەی ماوەت، لەوێ من و جەمال جەلالیان جیاکردەوە، بردنیانە ژورێکی بچوک کە نزیکەی (٢٥-٣٠) کەسی تیابوو، ئەوانیان برد بۆ هۆلێک کە پربوو لە سەربازو جاش و پیاوکوژو دزو سیخوڕ، لە ژورەکەی ئێمەدا چەند ئەفسەری عێراقی و قامیقامێک، لە هاوڕێیانی شیوعیش ئەوڕەحمانە شەلی هەولێریی، ئەو ڕەحمانی سالحی خلە، ئەکبەری خانەقینی، سەید تۆفیق، باسام، مامۆستا ئەحمەد ڕەشید، ئەحمەد دەنگ گەورە، چەند شیوعیەکی تری تیابوو.

ئەو ژوورەی ئێمە زیدانێک بوو لە ناو حەپسخانەکەدا، شەو بە نۆرە ئەخەوتین، ئەبوایە چەند کەسێک بە پێوە بوەستایە تا چەند کەسێک ئەخەوت، حەپسخانەکە نزیکەی (٧٥٠ - ٨٠٠) کەسی تیابوو، ڕۆژی سێ پارچە نانیان دەداینێ، مەگەر خوا بزانێ لەچی دروست کرابوو. برسێتی وای لە خەلک کرد بوو، کە ئەیانبردن بۆ دەرەوە بۆ ئیشکردن، بە تایبەتی سەربازە عەرەبەکان، ئەگەر لەسەر سەرە

نوێلکەکـان لاشـەی ئـاژەڵی تۆپیویـان دەسـتدەکەوت، ئەهێنـایەوە بـۆ حەپسـخانەکەو ئەیـان کوڵانـدو ئەیـان خـوارد، ئەمەم بە چـاوی خـۆم چەند جار دیبوو.

دەنگـو باسـی برسـێتی وای لە مەلای مـزگەوت کردبـوو، فتوایـدا ئەگەر بەنـدەکان بەلای مزگەوتـا گوزەریـان کـرد بـا خەڵـک نـانو خورمایـان بـاتێ خێـرە، شـیوعیەکان نـزیکەی (٦٥) کەس دەبـووین، دوایی هەمووممانیان لە هۆڵێکی گەورەدا دانا، ئەوە بۆ ئێمەی قولەکە وەکو پشویەک وابوو!!

بەڕۆژ ئەیـانبردین بـۆ کـۆڵە دارهێنـان، ئەگەر کەسـێ لە ڕیـزەکە لایبدایە، مام سەلیم بە گۆچان لەم سەر بۆ ئەو سەر لەهەمووی ئەدا. ڕیزەکە زۆر جار لە نیو کیلۆمەتر دریژتـر نەبـوو، هەندی سـەربازو ئەفسەری عەرەب، کە خۆیان تەسلیم کرد بوو بە شۆڕش، ئەوانیش لە هۆڵە سـاردو سڕەکەی ئێمەدا بـوون. یەکێکیـان لەکـاتی بێگاریـدا، کەوتبـوو قـاچی لە جێچووبـوو، لەنـانەوا خانەیەکدا هەنـدێ هەویـری دەستکەوت بـوو، قـاچی پێبەسـتبوو، شـەو سـەربازێک لە تەنیشـتیەوە لەبرسـا هەویـرەکەی خواردبـوو، بەیـانی ئەیـوت خـۆم قـاچم شـکاوە، برسیبووم هەویرەکەم نەخوارد، کێ خواردوویەتی؟

ڕۆژێ تــر هەر لەو نــانەوا خــانەیە، بڕێــک هەویــری هێنــابوو بەسـتیبووی بە قـاچیەوە، شــەو بەدەم هــاوارەوە خەبەرمــان بــووە، سـەربازەکە ئەیـوت بۆ گـازم لێئەگرن، هەویـرەکە قوزەڵقـورت بـکەن، تـومەس ئەم جـارە مشـک خـوارد بـووی، مشـکەکان لە ئێمە برسـیتر بوون.

خولە ئامە و عەلی برایم دەروێش بە نۆرە بەڕێوەبەری بەندیخانە بوون، خولە ئامە پەیوەندی لەگەڵ حزب هەبوو، ڕۆژێ بانگیکردم بۆ ژوورەکەی خۆی، نامەیەکی دایە دەستم، هاتمەوە نامەکەمان کردەوە، نوسـرا بـوو هاوڕیـان سـڵاویان هەیە بۆتـان، بەم زوانە مەلا مسـتەفا دێـتە نـاوچەی مەرگە هــاوڕێ عەزیـزی لەگەڵە ئـازاددەبن، وەڵامـی

نامەکەمان دایەوە، من بردم بۆ ژوری خولە ئامە لە پەلەپەلیدا پارچە سابوون کەلە گیرفانمدا بوو، دابووم بە کاک مەحمود لە باتی نامەکە.

ڕۆژی دوای بانگیکردم بۆ ژورەکەی خۆی، وتی ئەزانم لێت تێکچووە، ئەوە سەلکێ سابوون، نامەکەم بدەرێ، ئیتر لە ڕێ خولەئامەوە هەرچی هەبوو ئەمان گەیاندە حزب، من ٨ مانگ لەوێ مامەوە، هاوڕێیت هەبوو ٢ ساڵ لەو ڕەوشە ناهەموارەدا ژیابوو، تا خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی هاتە مەرگەو هێزی تایبەتی خۆی ناردو هەر چی شیوعی هەبوو هەموویان بەردا.

هەندێ ڕوداوی سەرنجڕاکێش:

١) ڕۆژێک ڕۆژنامەنوسێکی چیکۆسلۆڤاکی هات بۆ بەندیخانە، هێنایان بۆ ژووره بچوکەکەی ئێمە، خوالێخۆشبوو سامی عەبدولڕەحمان و موحسین دزەیی لەگەڵدابوو، یەکەیەکە پرسیاری لێکردین، مامۆستا ئەحمەد ڕەشید کە ئینگلیزییەکی باشی ئەزانی، لەگەڵیدا کەوتە قسە، ئەوڕەحمانە شەلی هەولێریش لەگەڵ کاک موحسین دزەییدا کەوتنە گلەیی و باسی هەولێر کردن، ڕۆژنامەنووسەکە لەگەڵ من دیدارێکی سازدا، کاک سامی وەرگێڕبوو، ڕۆژنامەنووسەکە زۆر تورەبوو، ووتی: ئەم شۆڕشە شۆڕشی گەلێکی ستەملێکراوە چۆن دەبێت شیوعی حەپسبکات؟ ئیتر بە تورەیی چووە دەرەوە.

٢) برادەرێکمان نانەوابوو بەیانی ئەیانبرد بۆ ئیشکردن، کە ئەهاتەوە دەورەمان لێئەدا، ئەمانوت هەواڵ چیە؟ وتی: (ڕادیۆی ئیسرائیل) وتویەتی ئەم شەو ئیشەلا باش ئەبێت. تومەس لە هەواڵەکاندا باسی دانوستاندنی کورد و عێراق کراوە.

٣) دیمەنی ئەو منالە دوانزە ساڵەی ئێمە هێنامانە لای خۆمان بۆ ئەوەی دوچاری کاری خراپی نەکەن، کە دایکی هات بۆ بینینی، چووە باوەشی دایکی چەند کاتژمرێک خەوی لێکەوت. ئەو دیمەنە ئێستەش هەرلەیادمە.

٤) سەردانی عەلی سویلەی برای حەمە سویلە، کە یەک مەنجەڵی فافۆنی برنج و قەلی کولاوو دەستەیەک نانی تیری بۆ هێناین، هەرگیز لەیاد ناچێت، حەمە سویلەش ئەیوت ئەم جارە عەلی لە مردن ڕزگاریکردین. (عەلی سەر لقی پارتی بوو)

٥) جارێک هێنایانینە دەرەوە بۆ گەرماو، عەلی ماوەتی کە هاورێی خۆمان بوو لەدەرگای گەرماوەکە چەند پاکەت خورمای کردە ناو گیرفانی چاکەتەکەمەوە، منیش لەگەڕانەوەمدا لەبەر ئەو هۆڵەدا تێپەڕبووم کە هاورێی هونەرمەند تەها خلیلی تیابوو، لە پەنجەرەکەوە پاکەتێکم بۆ فڕێدا، بەندییەکان هەر بە ئاسمانەوە قۆستیانەوەو لە نێوان خۆیاندا بەشیانکرد. یەک دەنکیان نەدا بە هاوڕێ تەها.

٦) هاوڕێ موعتەسەم ڕەشید، کەلەم دواییە بوو بەڕێوەبەری مۆزەخانەی سلێمانی، لەگەڵ عەلی ئەحە خورشە لە کۆڵەدار ئەیانهێنانەوە، لەناوەڕاستی حەوشەی بەندیخانەکەیەدا هاواریان ئەکرد بە دەنگی بەرز ئەیان وت "بژی هیتلەر بژی فاشست"، ئەمانوت بۆچی وا ئەڵێن، ئەیانوت لەوە زیاتر هیچیمان لە دەستنایەت.

٧) ئەورەحمانی ساڵحی خلە لە "کانی ماسی" بەزیندوویی بەنزین و نەوتیان پیاکردو گریان تێبەردا هەتا بوو بە خۆلەمێش.

٨) لەهەولێر لەسالانی ١٩٥٨و ١٩٥٩ ڕێپوانیان دەکرد، ئەیانوت بژی گەل ڕۆڵەی گەل ئەورەحمان و شێخە شەل (ئەمانە دوو تێکۆشەری شیوعی بوون).

٩) حەپسخانەی باستیل لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بەڕەشترین حەپسخانە ناسراوە، لە شۆڕشی کۆمۆنەی پاریس دەرگای حەپسخانەکەیان کردەوە (٣٠٠) کەس زیاتری تیانەبوو، بەلام لەحەپسخانەی ماوەت دەیان کەس لە برسا مردن.

چەپێک گوڵ و چەپێک نێرگز بۆ ئێوە، ئێمەش بەندیخانەی ماوەت ١٠ ساڵی لە تەمەنمان کوژاندەوە.

# (١٢)

# "ئاهەنگێك بۆ كەرە سپی و كەوتنەخوارەوەی كۆپتەرەكەی عەبدولسەلام عارف"

حزبی شیوعی لقێكی پێشمەرگەی لەناوچەی قەرەداخ هەبوو، بارەگاكەی لە گوندی ئەستێل بوو، سەعید مەتەر كە یەكێک لەو دوانزە ئەفسەرە بوو شۆڕشی ١٤ی تەمووزیان بەرپاكردو بە ئەفسەرە ئازادیخوازەكان ناویاندەركرد، ئەو بەرپرسی لقەكە بوو.

ئەوكاتە من لەناوچەی پینجوین كارمدەكرد، پارتییەكان زور ئازاریاندەدام و ڕێگرییان لە ڕاپەڕاندنی كارەكانمدەكرد، ئێرانییەكان هەر بەدوامەوە بوون و هانی دەزگای "پاراستن"یاندەدا گەلێک پیلانیان لە دژم ئەنجامدا، گەرەكیان بوو یان ئەو ناوە بەجێبهێڵم یان لەناومبەرن، تەنگیان پێهەڵچنیبووم، ناچار ڕوومكردە هەڵەبجە، ماوەیەكیش لەهەڵەبجە مامەوە، ئینجا چوومە گوندی "عازەبان" كە مەكتەبی لیژنەی محەلی سلێمانی لەوێبوو.

چەند ڕۆژێک لە لای ئەحمەد كەریم كە بەپرسی مەكتەب بوو مامەوە، پێشنیاری بۆكردم وەكو بەرپرسی سیاسی بچمە لقی سەربازیی، لقەكەش لەلایەن نەیارەكانی حزبەوە وەكو سوكایەتی پێكردن بە شیوعییەكان ناویان نابوو لقی كەرەسپی، كەرە سپی ڕۆڵێكی باشی هەبوو لە ڕاپەڕاندنی كاری حزبدا، چونكە تاكە هۆی گواستنەوەو هێنانی كەلوپەل ئازوقەو بریندارو نەخۆش و نهێنییەكانی حزب بوو. كۆپانی كەرە سپی جێگەی شاردنەوەی نامەو بەیاننامەو دەمانچەو جارجارەیش قاپە ئارەقی تیا دەشاردرایەوە.

مەلا ئەنوەر ناحەقی نەبوو كە دەیووت كەرە سپی بە قەدر (١٠) هاوڕێ خزمەتی حزب و گەلی عێراقی كردووە، لەسەر ئەم قسەیە

ڕەخنە لە مەلا ئەنوەر گیرا، ئەویش لەوەلامدا دەیووت خۆ دروشمی دیموکراتەکانی ئەمریکا کەرەو کەرێکی سپیشە؟.

مچە خاوەنداریی لەکەرەکە دەکرد، کەرەکەو مچە وا هۆگری یەکتربوون، پێکەوە ئەخەوتن و پێکەوە پشویان ئەدا، مانگانە کەرە سپی و خاوەنەکەی ئەبوایە لە ئەستێڵەوە بچن بۆ عازەبان، لەوێ نامەو بەیاننامە نهێنییەکانی حزب باربکەن بیبەن بۆ ناو شاری سلێمانی، بە پێچەوانەشەوە لەشارەوە دەرمان و نامەو هەر شتێکی کە پێویست بووایە ئەهێنرایەوە بۆ عازەبان، بۆ ماڵی هاوڕێ سەید کەریم، سەید کەریم جوتیارێکی زیرەک و تێگەیشتبوو، کۆلکە خوێندەوارییەکی هەبوو، بووبوو بە کادرێکی چالاکی حزب.

لەبەرئەوەی سەر لقەکەمان سەعید مەتەر بوو (هەواڵگریی سەربازیی عێراقی) زۆر چاودێری کەرە سپییان دەکرد، ناوبانگی کەرە سپی وەکو تەتەرێکی قارەمان لای دەزگای هەواڵگریی عێراقی تۆمارکرا بوو، چونکە دەزگای هەواڵگریی عێراقی گومانی لەوەکردبوو کە ئەو نامانەی سەعید مەتەر بۆ هاوڕێ ئەفسەرەکانی کە هێشتا لە سوپای عێراقیدا مابوون، دەنێرێت. هەموو هەر لەکۆپانی کەرە سپییەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە لە شارەزوور هەمیشە بۆی لە کەمیندا بوون!. بۆ نەگبەتی مچەو کەرە سپی لە نزیکی سەید سادق کەوتنە کەمینی جاش و جەیشەوە، بەهەزار نالی عەلی و دەردەسەرییەک، مستەفا خۆی دەرباز ئەکات، بەلام بەڕێز کەرە سپی دەگرن وەکو دەسکەوت و سەرکەوتنێکی سەربازیی دەیبەن بۆلای ئامر فەوج! کە کۆپانەکەی هەڵدەوەشێنن، هەموو نهێنییەکانی حزبیان بەردەست دەکەوێت، لەناو حزبدا دەوترا هەوڵی سەرنەکەوتنی کودەتا ١٩٦٤و ١٩٦٥ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نهێنیانەی لە کۆپانی کەرەسپیدا بەردەستکەوت، کەلەنامەیەکی نهێنیدا بوو بۆ سەعید مەتەر!!.

بەرانبەر بەم چاکەیە ئەفسەری هەواڵگریی و فەرماندەی فەوج، بڕیاریاندا ئاهەنگێکی ناوازە بۆ کەرە سپی ڕێکبخەن، ناویشیان لێنا

"مولازم حیمار" هەموو فەوجەکەو چەکدارەکانیان کۆکردەوە، دوو تەنەکە جۆیان لە بەردەم مولازم حیماردا ڕۆکرد، تەشتێک ئاویان لە تەنیشتەوە دانا و چارەکە عارەقێکیان بۆ کردە ناو ئاوەکەوە، کەرە سپی جۆی ئەخواردو ئاوو عارەق مەستەکی ئەکرد بەسەرا، لەپڕ دەعباکەی داهێشت و ڕەپیکردو سەلامێکی سەربازیی بۆ ئامر فەوج پێکرد!!

ئەڵێن قسە قسە ڕائەکێشی، تۆ بڵێی "بەهمەنی قوبادی" بیرۆکەی فلیمی ساتێک بۆ مەستی ئەسپەکانی لە مولازم حیمار وەر نەگرتبێت؟

ئامر فوج ڕوو دەکاتە یەکێک لە چەکدارە کوردەکان کەلە ڕیزی پێشەوە بووە لێیدەپرسێت: ئەوە بۆ وا ڕەپیکردووە؟ ئەویش پێیدەڵێت: قوربان ئەوە داوای ژنتان لێدەکات. ئەفسەری هەوالگریی فەرمان بە یەکەیەکی تایبەت دەدات بچن ماکەرێکی بۆ بێنن، ئیتر کردبوویان بە زەماوەند، ناویان نابوو ئاهەنگی سەرکەوتن.

سەرنج :

- کەرە سپی بوو بە مولازم حیمار.
- مچە لە خەستەخانەی سیلەکەی سلێمانی گیانی سپارد هیچ خۆشییەکی نەدی.
- ئەڵێن هۆی سەرنەگرتنی کودەتاکەی ١٩٦٤ مولازم حیمار نەبوو، بەڵکو مولازمێکی دوو پێ بوو.
- هەندێک وشەی عەرەبی بۆ زیاتر تێگەیشتنە.
- عازەبان گوندێکە لە نزیک دەربەندیخان و ئەستێل گوندێکە لە قەرەداخ .
- من ئەم چیرۆکەم وەکو ڕۆمانێک داڕشتبوو، بە داخەوە لەگەڵ شتی نایابی تر و دەسنووس لە هەولێر فەوتا.
- ئەم ڕوداوە ساڵی ١٩٦٤ ڕویداوە .

•ئەو ڕۆژەی عەبدولسەلام عارف لە فڕۆکەدا کەوتە خوارەوەو سووتا، ئێمە لە لقی ١٠ بووین، (سەعید مەتەر) لە ڕادیۆی عێراقەوە، کە گوێی لە هەواڵەکە بووبوو، بە پەلە منی بە ئاگاهێنایەوە، ئەودەم هەردووکمان لە ژوورێکی بچووکی بارەگای لقدا دەخەوتین، بە دەنگی بەرز وتی: (ڕەفیق جەمال، ڕەفیق جەمال، هەڵبستە! عەبدولسەلام کوژرا. پێکەوە گوێمان لە ڕادیۆ گرت، بەیاننامەیەکی خوێندەوە، کە تێیدا هاتبوو: لە کارەساتێکی گوماناویدا فڕۆکەی سەرۆک کۆمار لە ئاسماندا گڕیگرت و هەرچیی تێیدا بوو سووتا.

ناوی ئەو ئەفسەرانەی خوێندەوە، لە گەڵیدا بوون،(سەعید مەتەر) بۆ یەکێکیان زۆر خەمبار بوو، کە باش لە بیرم نەماوە، ئاخۆ ناوی (عەمید نووری) یان (عەمید نووردەدین) بوو. بە پەشۆکاوی و پەستییەوە وتی: (هەموو ئەندامانی لق کۆبکەرەوە!). هەموو کۆبووینەوە (هاوڕێ سەعید مەتەر) باسیکرد چۆن ئامادەکارییان بۆ شۆڕشی ١٤ تەمووز کردووە، وتی: سێ سێ و چوار چوار دەچووین بۆ مەزارگەی عەبدولقادری گەیلانی و مووسای کازم، لەوێدا سوێندمان دەخوارد ناپاکی لە یەکتری نەکەین و نهێنیی ئەفسەرانی ئازادیخواز نەدرکێنین و هەوڵی سەرکەوتنی کودەتاکە بدەین. چەند کۆبوونەوەمان کرد، ئەنجام بەوە گەیشتین، ئەگەر سەر نەکەوتین، چی بکەین؟ (هاوڕێ سەعید) گێڕایەوە، کە عەبدولسەلام عارف هەستاوەتە سەرپێ و وتوویەتی: (ئێوە ئەگەر سەرپشکمبکەن و ڕێگەمبدەن بە فەوجی ئاگرکوژێنەوە کودەتا دەکەم). ئەم نموونەیەی لەسەر ئازایەتیی (عەبدولسەلام) هێنایەوە، بەڵام هاوکات وتیشی کابرایەکی زۆر شۆڤێنی و نەتەوەپەرستی ئیسلامی - ئیخوانی بوو، هەروەها گەلێک شتی دیکەیشی لەبارەیەوە دەگێڕایەوە، وتی ئەوەی جێگەی داخە، لەدەستدانی (عەمید نورەدین)ە، کە ئەومان بە هاوڕێی خۆمان دەزانی و ئومێدمان پێی هەبوو، چاوەڕێ بووین ئەو کودەتا بکات، بەڵام ئەوەتا هیواکەمان بڕا، نزیکەی دوو سەعات لەبارەی

شۆڕشی ١٤ی تەمموز و کودەتای ٨ شوباتەوە قسەی بۆ کردین، گەلێک ڕەخنەیشی لە حزب گرت .

ئەو ڕۆژە هەر بۆ یادگاری زۆر وێنەمان گرت، داوا دەکەم هەر کەسێک ئەو وێنانەی لا ماون بۆم بنێرێت، لە ئێستاوە زۆر سوپاسی دەکەم، بەو هیوایەی بتوانم لە بیرەوەرییەکانمدا وەک بەڵگە دایان بنێم.

چەپێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، منیش لە پایزی تەمەندا ئەم چیرۆکەتان بۆ ئەگێڕمەوە. مـچەو هەزارانی وەکو ئەو هیچ خۆشییەکیان لە ژیاندا نەدی و بە نائومێدی سەریاننایەوە.

## (١٣)

# چیرۆکی وێنەکان و ڕۆڵی ئەدەب و هونەر

هاوڕێیانی ئازیز، ئێوە کە ئۆغرتان کرد، هیچ ماڵئاواییتان لێنەکردین، تەنانەت نەتان وت: ئێمە دوای ئێوە چی بکەین؟ چۆن مۆراڵ و ورەی ئەم خەڵکە بەرزبکەینەوەو بەرەو ئامانجە پیرۆزەکان بیانبەین؟ ئێوە کاتێ لە شاخ هاتنە خوارەوە، وتتان نسکۆیە، هەرەسەو ئاشبەتاڵە!

هەر کەسەتان بە جۆرێک شرۆڤەی هۆکاری کارەساتەکەتان دەکرد، بەلێ...دارمانی شۆڕشی میللەتیکە، کە خاوەنی سەد هەزار چەکدار بوو، ڕووبارێک خوێنی لەپێناو مافی ئازدیدا ڕشتبوو، ئەوە هەروا ئاسان نەبوو، بۆیە لە گۆشەنیگای جیاجیاوە ڕاڤەتان دەکرد.

لەدیدی نەتەوەپەروەرێکی وەکو (شێرکۆ بێکەس)ەوە ئۆبالی ئەم دارمانە بە هۆی پیلانێکی نێودەوڵەتییەوەیە، بەڵام سەرکردەکانی کوردیش لێی بەرپرسیارن. لە ڕوانگەی (سامی شۆڕش)ی (چەپی ئەوسایشەوە) ئیمپرالیزمی ئەمریکاو نۆکەرەکانی، لەوانە شای ئیران و هاوپەیمانەکانی، لە پشت ئەو شکستەوە بوون... بەڵام نیشتمانپەروەرێکی وەکو (دکتۆر نافیع ئاکرەیی) دەیوت ئێمە بەباشی لە بەهێزیی سەددام نەگەیشتبووین و بە قسەی "کیسەنگەر" هەڵخەڵەتاین!

ئێمەش وتمان ئەمانە هەموویان ڕاستن. هەمووی یەکسانە بەوەی (ئەقڵی سیاسیی کورد سوودی لە مێژوو و ڕابردووی خۆی وەرنەگرتووە) .

وەرن با کارێک بکەین لەوە زیاتر ورەی گەل نەڕوخێ، ئەوەی تووشی نائومێدی بووە، مۆراڵی بەرزبکەینەوە، وتیان باشە چۆن؟ وتمان وەرن لە باتیی چەک، قەڵەم بەکاربهێنین! وەرن بە شیعر،

چیرۆک، شانۆ، بەهونەری مۆسیقاو گۆرانی گەل هۆشیاربکەینەوە! وەرن با لە باتیی گوللە، وشە بە دوژمنەوە بنێین! وەرن دەرفەتتان بۆ دەرەخسێنم! وەرن ئەو دەرفەتەی هەیە، بۆ شۆڕشی هزرو ڕوناکبیریی بە کاربهێنین، کاتێ لیژنەی کەلتوری (ڕۆشنبیری)م لە (بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی جەماوەریی) پێکهێنا، دەمزانی چیدەکەم، بەمانایەکی دیکە مەبەستێکم لەم پرۆژەیەدا هەبوو، ئەندامانی لیژنە بریتیبوون لە دەستەبژێری نووسەرو هونەرمەندی ئازادیخوازو نیشتمانپەروەر، بۆ نموونە: دڵشاد مەریوانی، حەسیب قەرەداغی، جەلیل زەنگەنە، هێرو گۆران، ئازاد عەبدولواحید، جەلال عەزیز، ئەنوەر قەرەداغی، فوئادی حەمەئەمین ئاغا، حسێن جونبوش و هەندێکی دیکە، کە لە کاتی چالاکییەکاندا یارمەتییان دەداین. ئەمانە لووتکەی ئەدەب و هونەر بوون.

ئەو کۆڕانەی بۆ یادکردنەوەی قانع، گۆران، بێکەس و موفتی پێنجوێنی ڕێکخران، تەنیا چالاکیی ئەدەبی نەبوون، بەڵکو لەو ڕێگەیەوە پەیامێکی تر دەگەیەنرا، کە شۆڕش بە شێوازێکی جیاوازتر بەردەوامە.

هەروەها یادی (٢٠٠)ساڵەی دامەزراندنی شاری سلێمانی بە هاوکاریی لقی سلێمانی یەکێتی نووسەرانی کوردو دەیان میهرەجانی شیعر، چیرۆک، شانۆ، سەدان پێشانگەی شێوەکاری هەر لە چێوەی ئەم تێگەیشتنەوە بەڕێوەبران.

بایەخدان بە لاوەکان بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەو دەستگرتنیان ئەرکێکی تری ئێمە بوو، دەمانویست بە چاکترین شێوە لە ئەستۆی بگرین، مەبەستمە بڵێم ئەوانە تەنیا چالاکیی ئەدەبی و هونەری نەبوون، بەڵکو سیمایەکی سیاسییانەیان بە خۆوەدەگرت، کە ئەو سەردەمە بەجۆرێک لە سەرکێشی و یاخیبوون لێیان دەڕوانرا، ئەم

چالاکیانە تەنیا لە سنووری سلێمانیدا نەمانەوە، بەڵکو بۆ هەولێرو دهۆکیش پەلیان هاویشت.

لە شارە جوانەکەی دهۆک، لەو کاتەی یەکەم میهرەجانی شیعری کوردیی دوای (نسکۆ) بەڕێوەچوو، شیعری (ڕاسپاردەی گۆران بۆ خانی)م تێدا خوێندەوە، شیعرە ئاگراوییەکانی شێرکۆ بێکەس، سامی شۆڕش، عەبدولرەحمان مزووری، لەتیف هەڵمەت، پەشێو، حەمەسەعید حەسەن، ڕەفیق سابیر، سەعدوڵا پەرۆش و دەیانی تر بوونە بڵێسەی خەبات و ورەی تەپیوی ئەو گەلەیان هێنایەوە جێی خۆی.

مخابن یەکێک لەو زاتانە (دکتۆر نافع ئاکرەیی) لە کارەساتێکی ئاڵۆزو تەماویدا تێداچوو، دووانیان بوون بە وەزیرو کەوتنە ناو تەمومژی شەڕی ناوخۆوەو ئەدەبەکەیان شێوەیەکی حزبایەتیی وەرگرت، بەڵام شێرکۆ بێکەس لە لوتکەی شیعری کوردیدا هێلانەی ڕەنگاوڕەنگی هەر دەدرەوشایەوە!

هاوڕێیان، ئەوەندەم نەماوە بێم بۆ لاتان، بە کۆڵێ شیعرو هزر و ڕامیاریی نوێوە دێم، چونکە کە گڵ ئەبێتە هیمۆگلۆبین، شاری گڕ، ئەزباب نینە، من عاشقم، پێنجوێنی تەخت، کە دەکران بە سروودی گەنجەکانی ئەوسا، دەکران بە کەرەستەی شانۆو مارشی شۆڕشگێڕیی ئەو سەردەمە، ئەوانە دەخەمە ژێر سەرم و لەوێیشدا دەیکەم بە کۆڕی هونەرو ئەدەب.

هەرچەندە ئێوە بە بێدەنگی ڕۆیشتن، بەڵام ئێمەش کۆڵمان نەدا، لە بەرانبەر لافاوی شەوەزەنگی ئەم زەمەنە ئاڵۆزەدا، هەوڵماندا بۆ ئەوەی ئەم گەلە لەوە زیاتر چەواشە نەکرێت.

چەپێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە. ئەم وێنەیەیش زۆر چیرۆکتان بۆ دەگێڕێتەوە.

## (١٤)

# شاعیرو هونەرمەندان

(شــــــاعیرەکان لە ویژدانــــــی هونەرمەندەکانــــــدا دەژیـــــــن، هونەرمەنـدەکانیش بە فلچەکانیـان وشــە دەکەن بە تـابلۆ) لە ژێـر ئەم دروشمەدا یەکەم پێشانگەی پۆستەری شیعریی لە سلێمانی کرایەوە، لەو چالاکییە ناوازانەی لای ڕۆشنبیر، هونەرمەندو خوێندەواری ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی بایەخی پێدراو لە یادگەی ڕووناکبیراندا مـاوەتەوەو تـا ئێسـتا باسـیدەکەن، پێشـانگەی پۆسـتەری شـیعری کـوردییە، کە بە دەستپێشـخەری ئیمە، ئەو چـالاکییە سەرنجراکیشـە ئەنجامدرا.

کاتێک (دیوانی سەمفۆنیای وەنەوشـەی) شـەهید دڵشـاد مەریوانی بڵاوبووەوە، گەلێک قسەو باسی گەرمی لەنـاو خوێندەوارانی شیعری کوردی ئەو سەردەمەدا بەرپاکرد. چەند کەسێک بە جوانی لە سەریان نووسی ، ڕستەیەک لە یەکێک لەو نوسینانەدا سەرنجی ڕاکێشـام و تـا ئێستا لە یادم ماوە

نووسـەرەکە دەڵێت: (شـیعرەکانی سـەمفۆنیای وەنەوشـە هەمـوو کۆپلە شیعرێکی تابلۆیەکە بە گوڵی نێرگزو وەنەوشە نەخشێنراوە)ە.

ئەوە هانیدام، بە (شیرین.ک) خـانی خێزانی دڵشـاد مەریوانی بڵێم بـۆچی ئەم شـیعرانە نەکەیـن بە تـابلۆ کە خـۆی تـابلۆیەکە لە وشـە؟ شـرین.ک چیرۆکنـووس و نووسـەری بە توانـا ئەم کـارەی کـردو لە مـاوەیەکی کەمـدا پێشـانگەکەمان کـردەوەو جەمـاوەرێکی زۆری شیعردۆست و خوێندەوار سەردانیان کرد و بە خۆشییەوە پێشوازی لێکرا.

ئەو یەکەمین کارە وایکرد بیر لە کارێکی گەورەتـر بکەمەوە، بۆیە لەگەڵ لیژنەی ڕۆشنبیریی قسەمکردو ئەوانیش پێخۆشحاڵی خۆیان بۆ

بیرۆکەکە دەربڕی، بانگهێشتم لە زۆربەی هونەرمەندە شێوەکارەکان کردو باسی گرنگی پێشانگایەکی لەو جۆرەم بۆ کردن، هەموو بە دڵ خۆشییەوە پێشوازییان لێکرد.

وتـم: هەر هونەرمەنـدێک زەوقـی لەگەڵ ڕۆحـی چ شـاعیرێکدا دەگونجێـت و کڵـپەی ئـارەزووی بە مۆسـیقای چ چـامەیەک دائەمرکێتەوە، با بەگوێرەی سەلیقەو هزری خۆی بیکاتە تابلۆ، بە مەرجێک درێژی تابلۆکە یەک مەترو پانییەکەی (٦٠ بۆ ٧٠) سانتیم زیاتر نەبێت، تا بۆ هەڵواسین و پێشاندان سەرنجراکێش بێت ، مانگێکمان دانا بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە، پێشانگە لە وادەی خۆی لە هوڵی (دار طلبة) کە دەکەوێتە سەر کۆتایی شەقامی ئیبراهیم پاشا کرایەوە.

لە یەک مانگدا نزیکەی هەڤدە هەزار کەس سەردانی پێشانگەیان کرد، نزیکە شەش هەزار کەس کۆمێنتی جوان و دەستخۆشییان نووسیبوو، گەلێک کۆمێنتی بە زمانی بیانی تێدا بوو، ڕۆژنامەنوسێکی فەرەنسی نووسیبوی کاری وا ڕوناکبیریی و هونەری مەگەر لە پاریس لە سەردەمی (ڕێنیسانس)دا، کرابێت.

لە پاش مانگێک پێشانگەکەم برد بۆ هەولێر، لەوێ چەند هەفتەیەک پێشاندرا، داوودەسگەی بەعس کە زانییان پێشانگەکە مایەی گرنگیپێدانی خەڵک و ڕۆشنبیرانە، بە تایبەتی بە فەرمانی (عەبدولغەفار السائغ) پێشنگاکە داخراو تابلۆکانیان برد، عەبدولغەفار وتبووی: ئەم تابلۆیانە (توحف)ەن بیانخەنە گەنجینەوە با نەفەوتێن، بەڵام هەرخۆی هەموو تابلۆکانی ئەنفالکرد، هەرچەند هەوڵمدا تابلۆکەی خۆمم بەدەست نەکەوتەوە

بە شیعری( پەیامی دوور ) بەشدارییم کردبوو، هونەرمەندی شانۆکار (حیکمەت هیندی) کە هەم شانۆکارەو هەم شێوەکار تابلۆکەی منی کێشابوو.

ئەمەش دەقی شیعرەکەیە:

پەیامی دوور
لە ئاسۆی من
کوا گزنگی تەلکەمانی ؟!
هەلاڵەی سوور!
لە تاسەی من
سیس بوو وەری، ژەنگی هانی
ساباتی ژین گرەی تەنوور
هیلانەی من
کام ئاوازی کامەرانی ؟!
پاشەڕۆژم
(شەوەی) ملی کیژی.. بەندە!
لەتاو جوانی
بەختیارییم
گریان ئەدا لە جێی خەندە
بۆ مزگانی
پەیامی دوور
( دەبا ) هەڵبێت لە ئاسۆی سوور
گزنگی ئاڵی بەیانی

## (١٥)

# چۆن جەمال جەلالم ڕزگارکرد؟

ڕۆژێک خوالێخۆشبوو (فەرەیدون)ی برای جەمال جەلال بە شڵەژاویی و خەمبارییەوە، هاتە لام و وتی: فەرمانی گرتنی کاک (جەمال) دەرچووە، وێنەو ناوی لە بازگەکانی پێنجوێن بڵاوکراوەتەوەوماڵی خۆمان و هەموو خزمەکانیان پشکنییەوە، بەڵام ئەو ئێستە لە سلێمانییە، ئەڵێین نەوەکو ماڵی خزمەکانی ئێرەیشی بە شوێندا بکەرێن. چیبکەین باشە؟ وتم لە کوییە؟ وتی لەماڵی (میرە)یە، بە پەلە هەندێ ئامادەکاریم کردو بە ماشینەکەی فەرمانگە چووین بۆ ئەوێ. پێش ئەوەی بگەینە بەر دەرگە، (فەرەیدون)م دابەزاندو پێم وت هەرکەس لەماڵەکەدا هەیە بڕۆنەدەرەوە یان لە ژوورێکدا کۆیانبکەرەوە بانەمبینن، چوومە ژورەوە (جەمال)م لەگەڵ خۆمدا هێناو بردم بۆ ماڵی خۆمان.

شەو (فەرەیدوون)م نارد بە شوێن (عەبدولی حەمەی سەعید)، ڕۆژی دواتر بە نووسراوێکی فەرمی و بەناوی (هەڵمەتی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریی حملة مكافحة الامية) خۆمم (ئیفاد)کرد بۆ ناوچەی شارەزوور، ئەوکاتە ئەو مەسەلەیە لە ئارادا هەبوو، ناو سەیارەکەمم پڕکرد لە پۆستەری ئەو هەڵمەتە، پۆستەرەکان هەموو وێنەی (سەددام حوسێن)ی پێوەبوو، (جەمال)م لە تەنیشت خۆمە سوارکرد، (عەبدول)یش لە دواوە، وتم گەیشتنە هەر بازگەیەک پێشئەوەی داوای ناسنامەتان لێبکەن، یەکسەر ئەم پۆستەرو وێنانە بدەن بەسەربازو ئەمنەکان.

پێش ئەوەی لە سلێمانییەوە بەڕێبکەوین، تەلەفونم بۆ (کوێخا قادری کۆڵێتان)کرد، کە ڕاگوێزرابوون بۆ شارۆچکەی سەید سادق، وتم نیوەڕۆ میوانی تۆ دەبین و دوو کەسم لەگەڵدایە، لە هەندێ بازگە

ئەگەر پرسـياريان بكـردايە، دەسـتوبرد نووسـراوە فەرميـيەكەم نيشاندەدان و چەند پۆستەرێكيشم بە سەربازەكان دەدا، ئەوان وايان دەهاتە بەرچاو من شۆفێرم و (جەمال)يش بەڕێوەبەری فەرمانگەكەيە، بەو جۆرە گەشتينە ماڵی (كوێخا قادر).

دوای نـانی نيـوەڕۆ بە يـاوەری (كوێخـا قـادر) بەرەو پێنجـوێن بەڕێكەوتـين، لە پـردەكەی كەولـۆس سـەركەوتين، لە هەورازەكەی بەرانبەر دۆڵی چەوتـان و كۆڵێتان، سـەيارەكەم وەستاندو بۆنيتەكەم هەڵدايەوە، نمە نمە بارانيش دەباری، جەمال و عەبدولم دابەزاندو وتم بەو شـيوەدا بەرەو چەوتـان سـەركەون، بـۆنيتەكەم بـۆيە هەڵدايەوە، چونكە لوتەكەكانی دەوروپشتمان هەموو (رەبايەی سەربازيی) بوو. ئەوان بـۆ نـاو دۆڵەكە شـۆڕبوونەوەو تـا لە چـاو ونبـوون خـۆم بە سـەيارەكەوە خەريككـرد، ئينجـا لەگەڵ كوێخـا بەرەو پێنجـوێن كەوتينەوەڕێ.

لە پێنجوێن، كوێخا دابەزی و چوو بۆ مـاڵی غەوارە، منيش چووم بـۆ مـاڵی بـاوكم. هەرگەيشـتمە بەردەرگە، دايكـی (عەبـدول) بە حەپەساوی لە بەردەمدا قوتبووەوە، نازانم ڕێكەوت بوو يان سووسەی شـتێكيان كردبـوو؟ سـەرم نـايە پەنـا گـوێی و وتـم گەيانـدمە شـوێنی خـۆی، شـەويش (دادە خەجـێ) خـۆيكرد بە ژووورداو بەدەم گريـانەوە ويستی قسەبكات، وتم قسەمەكە گەيشتنە شاخ.

چەنـد ڕۆژێـك لە پێنجـوێن مـامەوە سـەردانێكی (قايمقـام)و بەرپرسـەكانم كـرد، گـوێم هەڵخسـتبوو، وتـم بـزانم قسـەو باسـێ لەو بارەيەوە هەيە!، هيچم نەبيست (سـەلمان)ی ئەمنم لە نـاو بـازاڕ بينـی، وتی بۆ نيوەڕۆ لە لۆقەنتەكە ميوانی منيت، زۆری كرد، منيش ترسـام و گومـانێكم لادروسـتبوو، لەكـاتی نانخواردنـدا وتـی: دەزانـی فـلان و فـلان گەيشـتونەتە نـاوچەی مەريـوان، زۆر بەسەرسـوڕمانەوە وتـی: نـازانم چـۆن دەربـازبوون؟ چـونكە لە (سـليمانی)يش مـاڵی خـزم و ناسياوەكانيان لە ژێر چاودێريدا بوون.

بە پرسـیارێکی گرفتئـامێزەوە لێیپرسـیم، چـۆنە وا بەو زسـتانە هـاتوومەتەوە بـۆ پێنجـوین؟! وتـم بـاوکم زۆر هـیلاکەو لەبەر ئەو هاتووم، وەکو دواتر بیستمەوە کوڕێکی پێنجوێنی لەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا، لە ژێرەوە پیاوی دەزگای ئەمن بووەو زانیاریی پێداون، ڕۆژێـک لەدوکـانی (حـاجی ڕەشـید کـاکی) دانیشـتبووم، پیـاوێکی بە تەمەن و چـاویلکە لە چـاو، کە زوو زوو (بەکـری حـاجی سـەفەر) لە چنگیان و شارباژێڕەوە ئەینارد بۆ لام بۆ سلێمانی، لێم نزیکبۆوەوەو وتی: ئەمشەو لە ماڵی خزمەکەت لە ڕاوگان (بەفر دێت بۆ لات).

ئەم پیاوە بە تەمەنە کۆنە شیوعی بوو ناسراوی کۆنم بوو، هەر شـتێک پێویسـت بـووایە بـۆ کـاک (بەکـرو مەلا بەختیـار) لە ڕێـگەی ئەوەوە دەمنـارد بو مەلبەندی یەک. ئەو پیاوە لە ماڵی ئیمە بە پیاوە پیرەکە ناسرابوو، کە نامەشم بۆ (بەکری حاجی سەفەر) دەنووسی، بە نـاوی (بەفـر)ەوە دەمنووسـی، ئیتـر تێگەیشـتم و کەوتـمە خـۆ ئامادەکردن، وەلامیشم بۆ (حاجی محەمەد)ی پوورزام نـارد، کە ئەمڕۆ ئێوارە سـەردانیان دەکەم، هەر گەیشتمە ئەوێ (مامە گردە)و (حەمە پەزێ)و هەموو خزمەکانی کۆکردەوەو کردمان بە دانیشتنێکی خۆش.

درەنگـانی شـەو میوانەکـان بلاوەیـانکرد، ئـێمەیش بەرەو ڕووی (قـزڵجە) دانیشـتبووین لە دوورەوە شـەوقێکمان بینـی، خێـرا حـاجی مـحەمەد دەرگەی کـادانەکەی کـردەوە، چـوارپێنج تارمـایی خۆیـان پێـداکرد. حـاجی هـاتەوە بـۆ لام وتـی (بەکـرو مەلا بەختیـارو ئەبـو شەهاب)و چەند کەسێکیتر دەیانەوێ بتبینن.

وتم تەنیا با کاک بەکر بێت، لەگەڵ (بەکر) قسەی خۆمـان کردو لە کونی دەلاقەکەوە قسـەم لەگەڵ ئەوانەیتر کرد، وا دێتەوە یادم، (مەلا بەختیار) وتی ئەوەی تۆ دەیکەیت بۆ شـۆڕش زۆر گرنگەو ئاگات لە خـۆت بێـت، (ئەمـانەت)ێکیش هەیە لەگەڵ خـۆت بیـبە بـۆ سـلێمانی و بیگەیەنە دوکانی (عەبدولکەریمی مەلا عەبدوڵای موفتی).

ئەوان ڕۆیشـتن و منـیش بەیـانیی زوو هـاتمەوە بـۆ نـاو شـاری پێنجوێن و ووای چەند کاتژمێرێک مانەوە بەرەو سلێمانی کەوتمەڕێ. لە (نالپـارێز) ئەفسـەری هەوالگـر لە بـازگەکە وەسـتا بـوو، ئەو (ئەمـانەتە)ی لەگەڵ خۆمـدا هێنـابووم، لە کارتۆنێکـا بـوو، پـڕ بـوو لە بەلاڤـۆک و چـاپکراوی شـۆڕش. هەر لە بەردەمـی خۆمـدا دام نـابوو. ئیتـر خـۆم تێکـنەداو سـەیارەکەم ڕاگـرت، بتلێـک (ویسـکی)م پێبـوو دامگـرت و تەوقەم لەگەڵ کـردو چـووین بـۆ ژوورەکەی خـۆی، بـتڵە ویسکیکەم وەکو دیاری دایەو ئەویش چایەکی بۆ بانگکردم.

پـێش ئەوەی ئـێمە بگەیـنە ژووری ئەفسـەرەکە، بە دەنگـی بەرز قسەیکردو کۆکی، وەکو هێمایەک بۆ ئەو دوو کەسەی لە ژوورەکەدا بوون، بڕۆن و بومـان چـولبکەن. من لەلاوە شیوەی یەکێکیـانم کـرد، لەگەڵ ئەفسـەرەکە کەوتیـنە قسـەکردن، وتـی ئەمشـەو بەکـری حـاجی سـەفەرو هێزێکـی بەکرێگیـراو لە قـزلجەوە بەرەو نـزارە ڕۆیشـتوون، ڕەنگبێ بچنە ئێران، باوکی ئەو ئەفسەری هەوالگرە، لە کاتی خۆیدا لە پێنجـوێن (مەئمـوری ئیسـتهلاک)بوو، تورکمـانی کەرکـوک بـوو نـاوی (ئیسمائیلە فەنی) بوو، نزیکەی شـەش مانگێک لە قوتابخـانەدا پێکەوە هـاوپۆل بـووین، بـۆیە لەگەڵ کوڕەکەیـدا، بە مەبەسـتی ڕاییکردنـی ئیشوکار نێوانێکم دروستکردبوو. گەیشتمەوە سلێمانی و کارتۆنەکەم برد بۆ دوکانی (عەبدولکەریم)، وتـم ئەوە کـاک بەکـری حـاجی سـەفەر بۆی ناردویت، کە کردیەوە ڕەنگی زەردبوو، خەریکبوو دڵی بوەستێ.

پـاش چەند ڕۆژێک شـەهید (دڵشـاد مەریـوانی) بڵاوکراوەیەکی بۆ هێنـام بـۆ فەرمـانگە، هەر هـی نـاو کـارتۆنەکە بـوو، کە خـۆم لە پێنجوێنەوە هێنابووم بۆ سلێمانی. چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێـوە، منـیش دوو کـادیری کـۆمەڵەم لە چنگـی داوودەزگـای بەعـس ڕزگارکرد.

**جەمال جەلال:** کادری پێشکەوتووی کۆمەڵە بوو، بەرپرسـی شـانە نهێنیەکانی ئەو کاتەی شاری پێنجوێن بوو.

## چیرۆکی (١٦)
## یادەوەری لەگەڵ مستەفا چاورەش

کە (قیادەی مەرکەزی) دروستبوو، بڕیاردرا لە شارەکانی عێراق شانەی چەکداریی دروستبکەین. لە سلێمانی چەند شانەیەکی چەکدارمان هەبوو، ناومانلنابوون شۆڕشگێڕانی ناو شار (ثوار المدن)، لێرەدا باسی ئەو شانەیە دەکەم کە (مستەفا چاوڕەش) بەرپرسیان بوو. ئەوان هەندێک چالاکیی گەورەیان لە سلێمانی ئەنجامدا، وەکو تەمبێکردنی چەند کەسێک کە نەیاری شیوعییەکان بوون و دەستبەسەراگرتنی چەکی حکومەت و هەندی جموجولی تر.

شانەکەی (مستەفا چاوڕەش) ئەوەی لە یادمبێت پێکهاتبوو لەم هاوڕێیانە : (ئەکرەمی حەپسە، کەمالە کوێر، جەمالی عەلی فایزو چەند کەسێکی تر).

لە دوای گرتنی (عەزیز حاج)، لە سەرکردایەتییەوە هەوڵێکی زۆرماندا بۆ کۆکردنەوەی ئەندام و دۆستەکانمان، چونکە پەرشوبڵاوبووبووین و دەبوو جارێکی دیکە خۆمان ڕێکبخەینەوە، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی بەشی زۆری شارە گرنگەکانی عێراقمان کرد، لەوانە (بەغداد، بەسرە، ناسریە، کەرکوک و هەولێر)، دوای ساڵێک لە کارکردن بۆ باشتربوونی کاری ڕێکخراوەییمان، کۆنفراسێکمان لە بناری (گڵ) لە گوندی (کانی قادر) کە تەکییەکی گەورەی تاڵەبانییەکانی لێبوو بەست.

لەوێ سەرکردایەتی نوێ هەڵبژێردرایەوەو بووم بە ئەندامی سەرکردایەتی، ساڵێک زیاتر بەم شێوەیە کارمانکرد، شانە چەکدارەکان گەلێ چالاکیی بە زەبریان لە دوژمن وەشاند، گورزی گرانیان لە دەزگاکانی حکومەتدا، لە یەکەمین جڤینی سەرکردایەتی نوێدا لە گوندی (کێلەکان)ی ناوچەی (گەلاڵە)، بەبەشداریی هاوڕێیان:

(موسڵیح جەلالی، ئیبراهیم عەلاوی، ئەبو ئەنیس، ئەبو موحێسن، بەندە - جمال و دوو ئافرەت کە ئەندامی سەرکردایەتی بوون) کۆبونەوە دەستپێکرد، بەلام هەندێک لە هاوڕێیان لەبەر ڕەوشی تایبەت بەخۆیان، نەیانتوانی بەشداربیکەن. لە کۆنفرانسەکەدا ئیش و کارمان بەم شێوەیە دابەشکرد:

١.(موسڵیح جەلالی) لەناو کێلەکان وەکو سکرتێر بمێنێتەوە، چونکە لەناو کێلەکان هێزێکی چەکدارمان هەبوو.

٢.(ئیبراهیم عەلاوی) بەرپرسی بەغداو دەوروبەری، ئەبو محیسن بەرپرسی چەکدارەکانی (ئەهوارو زونگاوەکان).

٣.یەکێک لە ئافرەتەکان بەرپرسی بەسرە.

دوای کۆبوونەوەکە من و ئیبراهیم عەلاوی و مستەفا چاوڕەش گەڕاینەوە بۆ سلێمانی.

لە ڕێگا هێسترێکمان بۆ ئیبراهیم پەیدا کرد، چونکە ئەو نەیدەتوانی وەکو ئێمە بەپێ بڕوات، وابزانم گەیشتبووینە گوندی (پڵنگان)، کات بەهار بوو، ئاوی چەمەکان هاتبوو و لافاو هەستابوو، ئیبراهیم سواری ولاخەکە بوو و لە چەمەکە پەڕیەوە. پێشمەرگەیەک ولاخەکەی هێنایەوە بۆ ئەمبەر، من و مستەفا چاوڕەش هەردووکمان پێکەوە سواربووین، کاتێکمان زانی ئاو گەیشتە کۆپانی هێسترەکە، چەمەکە ١٠-١٥ مەتر بەرە خواری بردین تینمانلێهاتبوو، ئیتر پێشمەرگەیەک پڵنگ ئاسا خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکەو جڵەوی هێسترەکەی گرت و ئێمەی ڕزگارکرد، گەیشتینەوە سلێمانی من ئیبراهیمم بردە لای ئەکرەمی ساڵحی ڕەشەو مستەفایش چوو بەلای کاری خۆیەوە.

لەگەڵ مستەفا چاوڕەشدا کاری زۆرمان کردوە، ئەگەر ئەوانە بنووسرێتەوە هەریەکێکیان داستانێکە بۆ خۆی، جاری هەبووە ٥-٦

مانگ لە شوێنێکدا نەمانتوانیوە، بێینە دەرەوە، مستەفا زۆر ئازاو چاونەترس و بوێربوو، لە هیچ سڵی نەدەکردەوە، لە چالاکییە سەربازییەکانی ناو شاردا زۆر سەرکەوتووبوو، بۆیە لەسەر داوای سەرکردایەتی گواسترایەوە بۆ بەغداد، پەیوەندی بە (سالح عەسکەری) ئەندامی سەرکردایەتی هەبوو، لەوێش گەلێک چالاکیی سەربازییان ئەنجامدا.

پێش ئەوەی مستەفا بڕوات بۆ بەغدا، گومان لەوشوێنە کرابوو کە لێیدەمایەوە، پێیوتم هەوڵبدەم شوێنێکی باشتری بۆ پەیدابکەم، بە ڕێکەوت کاک (عەلی بەگی جاف)م بینی کە دۆستێکی نزیکم بوو، وتی ئێمە سەفەر دەکەین و ماڵەکەمان چۆڵدەبێت، گەڕەکەکەشمان دزیی زۆر تێداکراوە، بۆ ناچیتە ئەوێ ١٥ ڕۆژێکمان پێدەچێت تا دێینەوە، منیش وتم باشە.

من جێگەم پێ لێژدەبوو، لە ماڵی (عەلی بەگی جاف) خۆم دەشاردەوە، ئیتر (مستەفا، ئەکرەم، وابزانم ئیسماعیل و جەمال فائیز)م برد بۆ ماڵی ئەو دۆستەو کردمان بە بنکەی چالاکیی خۆمان، شەوێک دز هاتە سەر گەڕەکەکە، ئێمەش بە تەقە دەرمان پەڕاندن، بەیانی یەک دوو ماڵی دراوسێ هاتن بۆ لامان، منیش چووم بە پیریانەوەو زۆر سوپاسیان کردین، وتیان ئێوە نەبوونایە دز تاڵانیان دەکردین.

منیش وتم، کاک عەلی بەگ ماڵەکەی بە ئێمە سپاردووە، هەتا خۆیان لە سەفەر دەگەڕێنەوە، پارێزگاریی لە ئێوەش دەکەین، ئیتر ئەوە بوو بە خێر بۆمان و چەندجار خواردنیان بۆهێناین، هەر لەو ماڵەوە چەند هێرشێکمان ئەنجامدا لەوانە: هێرش بۆسەر بنکەی (مغاویر) لە گەڕەکی (عەقاری) کە پاسەوانییان لە (دائیرەی ئەمن) دەکرد، تەمێکردنی هەندێ نەیاری حزب، ئەمانە هەمووی بەسەرپەرشتی مستەفا چاوڕەش بوو، شەوێک لە ئیسکان لە ماڵی کاک مەحمود بوو، تەقە لای خانووە قوڕەکانەوە پەیدابوو، مستەفا

خێرا پەلاماری دەمانچەو تفەنگەکەی منیداو دەرپەڕی، وتی تۆ لێرە مەڕۆ، وابزانم چوونەتە سەر وەهابی نەقار (وەهابی پۆلیس) کە هاوڕێ (شێخ عەلی) لەوێیە، شێخ عەلی دەستوەکەرییەکی باشیکردبوو، مستەفایش چەند هاورێیەکی تری بردبوو، فریاکەوتبوون و توانیبوویان شێخ عەلی لە دەست (ئەمن و سەربازو جاش) دەربازبکەن و کوژراو و برینداریشییان پێ بەجێبهێڵن.

ئەمانە چەند کورتە یادەوەرییەک بوون، جیا لەدەیان قارەمانێتی و نەبەردیی نەنووسراوە، وا ئێستا لە تەمەنی حەفتا ساڵی بەرەو ژوورەوە سەیری تابلۆکانی ژیانمان دەکەم، چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، منیش بە دوای تابلۆی رەنگاورەنگی ژیانمدا دەگەڕێم.

# (١٧)
# کەڵەکەکەی تووە قوت و عەمەلیاتی ڕیخۆڵە کوێرە

ساڵانی ١٩٦٦ - ١٩٦٧ لە ناوچەی قەرەداغ و دەربەندیخان کادری حزب بووین، لە گوندی عەزەبان لە کۆبوونەوەیەکدا ئازارێک لە گەدەو ڕیخۆڵەکانمدا دروستبوو، دوای چەند کاتژمرێک توانای هەڵسان و دانیشتنم کەمبووەوە، بە سواری کەرێک ناردیانم بۆ گوندی ئەحمەد برنە. هاورییەک لەگەڵم هات. چوینە ساڵی ئەحمەد بەگ چەند ڕۆژێک لەوێ پشومدا، بەڵام تەندروستیم لە خراپەوە بەرە خراپتر چوو، تەنانەت خواردنیشم کەم بۆ دەخورا، زۆر لاواز بووبووم، گوێم لێبوو ژنی خاوەن ماڵەکە بە مێردەکەی ئەوت خەریکە ئەمرێت بۆ چارەسەرێکی بۆ ناکەن، ئیتر حزب بڕیاریدا بمنێرن بۆ هەڵەبجە.

لەگەڵ ماڵی ئەحمەد بەگ، خۆی و خێزانی و دوو منالی بە سواری کەرە سپی کەوتینەڕێ، لەگەڵ دوو منالەکە بەنۆرە سواردەبووین تا گەشتینە کەڵەکەکەی توە قوت.

چەند خێزانێکی تر چاوەڕێی کەڵەکەکەیان دەکرد، ڕووبەری کەڵەکەکە (٣-٤) مەتر ئەبوو، بەلام لە پیاوو ژن و منال و کەلوپەل، باری پیکاپێکی بارکردبوو. سەرباری ئەمانەش کەرە سپی، چەند مەترێکی مابوو بگەینە وشکانی کەرە سپی تەکانیداو هەڵسایە سەرپێ، کەڵەکەکە لاسەنگ بوو، کەمێکی مابوو نوقمبین، قاوو قیژی منال و ژن هەموومانی ژپرزەکرد، وەکو ئەڵێن: لغريق يتشبث بالحشيش).

ئیتر هەر ژن و منداڵ بوو دەسیان بەو کەسانە ئەگرت بە پێوە وەستابوون، تا خۆیان پێوە بگرنەوە، من کاتێک هاتمەوە سەرخۆ، بینیم کەسێک دەستی بەخوار پشتێنەکەمەوە گرتووە، هەر چەندە من لەتاو ئازارو بێ حەواسی ئاگام لە دنیا نەمابوو!

گەشتینە هەڵەبجەو چوینە ماڵی عەلی حاجی سمایل. ئێوارە موزەمیدێکیان بۆ هێنام، هەندێ حەبی ئازارشکێن و دەرزییەکی لێدام، بەڵام تەندروستیم هەر بەرەو خراپی بوو، دواتر بردیانم بۆ ماڵی سەید کەریمی باخەوان، لەوێ معاون طبی و پەرستارێکی لەگەڵ بوو، هەندێ کەلوپەلی عەمەلیاتیان هێنابوو، پشکنینێکی باشی بۆ کردم، گوێم لێبوو بە هاوڕێکانی وت: ئەگەر عەمەلیاتی بۆ نەکەین ئەمشەو ئەمرێت، چونکە ڕیخۆڵە کوێرەی زۆر ئاوساوەو لە عان و سەعاتایە بتەقێت، وتی: بەڵام دەرمانی بێهۆشیم پێ نییە، لە هەڵەبجە دەستناکەوێت، ئەوەی هەیە لای فلانەو سەر بەحوکمەتە، ناوێرم داوای لێبکەم.

گوێم لە هاوڕێ عومەری ئەحە خورشە بوو، وتی: من لە ماڵەوە قاپێک ئارەقم هەیە با بیخواتەوە ئاگای لە خۆی نامێنێ، ئێوەش عەمەلیاتی خۆتان بکەن.

هاوڕێ سەید تۆفیق وتی: هاوڕێ جەمال گیان مۆرفین لە هەڵەبجە بەهیچ شێوەیەک دەستناکەوێت، ئەگەر تۆش ئەمشەو عەمەلیات نەکرێیت ئەمریت، ئەگەر بتبەینە خەستەخانە ئاشکرائەبیت، حوکمەت هەر لەوێ ئەتکوژێت یان لەسێدارەئەدرێیت.

وتم باشە چیئەکەن بیکەن، وتیان وەسێت؟ وتم ئەگەر مردم بمبەنەوە بۆ پێنجوێن، دەست و قاچیان گرێدام، کەوچکێی داریان خستە دەمم، قاپێک عارەقی فەلیان کرد بە قورگما، معاون طبی و موزەمید منیان عەملیاتکرد، ئازاری زۆرم چەشت تا لە هۆشچووم،

ئەوەندەی ئاگاداربووم، ئەیانوت: خۆت ڕاگرە تۆ ئازای، تۆ لە ناو شاری هەڵەبجە وتارتدا، تۆ لە بنکەی بەمۆ وە لەسمت بەرگریتکرد، ئیتر بە دەم ئازارەوە بێهۆشبووم، دەمەوە بەیان بە ژانێکی گەورە خەبەرمبووەوە، پاش دوو هەفتە هەڵسامە سەرپێ.

هەندێ سەرنج:

○لەگەڵ حەمەی سەید کەریم چوینە سەر ئەو کەلاوەیە کە ماڵی باوکی بوو چەند وێنەیەکمان گرت.

○ئەم چیرۆکەم بۆ دایکم ئەگێڕایەوە لەم دوایایە، ئەی وت قەیناکە خوا لە گوناحی عارەقەکەت خۆش ئەبێت، چونکە ئازاری زۆرت کێشاوە .

○ئەو کەسانەی ئەم عەمەلیاتەیان بۆکردم هەندێکیان ماون.

○حەمەی سەید کەریم ئەم چیرۆکەی چەندجار بۆ عومەری مەکتەبە گێڕاوەتەوە، منیش ئەم چیرۆکە پێشکەش ئەکەم بە براو دۆستی بەڕێزم جەمیل بەگ، کە ئەو بە بیری هێنامەوە.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، منیش بە قاپێک ئارەقی فەل لە ئازاری ڕیخۆڵە کوێرە ڕزگارم بوو.

# (١٨)
# ڕادیۆی ئیسرائیل و پرسەی هونەرمەند تەها خەلیل

دوای ئەوەی زۆرینەی (قیادەی مەرکەزی)و (عەزیز ئەلحاج) کەوتنە دەست بەعس، لە ئەنجامی ورە بەردان، نهێنی درکاندن و خۆبەدەستەوەدان، ڕێکخستنەکانمان لە سەرتاسەری عێراقدا لەبەریەک هەڵوەشان و شتێک بە ناوی حزبەوە نەما، بەڵام لە کوردستاندا ڕەوشەکە هەندێک جیاوار بوو، چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی و کۆمەڵە کادیرێک لە کوردستانەوە دەستمانکرد بە گرێدانەوەی شانەو ڕێکخستنەکان، ئەوەی توانیمان لە سەرتاسەری عێراقدا پێکمان هێنایەوە، لە دوای چەند چڤین و کۆنفرانسێک توانیمان پەیکەری حزب لە نوێوە دروستبکەینەوە.

لەسەردانێکمدا بۆ بەغداد چووەمە دیداری (جەبهەی شەعبی تەحریری فەلەستین) کە (جۆرج حەبەش) سەرکردایەتی دەکرد، پەیوەندیمان لەگەڵیاندا دروستکردو شاندێکی سێ کەسییان هاتن بۆ سلێمانی، بریتی بوون (ئەبو نیزال و دوو کەسی تر).

چەند ڕۆژێک لای ئێمە مانەوەو داوایانکرد بیانبەین بۆ ناو شۆڕش، بردمن بۆ لای خوالێخۆشبوو (فاخیر مێرگە سووری)، ئەو کاتە لە سلێمانی بەرپرسی لقی (٤)ی پارتی بوو، ئەویش گەیاندینی بۆ گەلاڵە. پاش ماوەیەک لەلایەن (جبهەی شەعبی)ەوە داوامان لێکرا شاندێک بنێرین بۆ عەممانی پێتەختی ئوردون، بۆ بینینی (جۆرج حەبەش)، منیش لە(لیژنەی پارێزگا) بانگهێشتنامەکەم بۆ خوێندنەوە، بڕیارماندا هەردوو هاوڕێ (تەها خەلیل، فەرەجی مەلا ئەمینی

هەڵەبجەیی) بنێرین. لەبەغدا (جەبهەی شەعبی) ناسنامەی خۆیانیان بۆ دروستکردبوون، لە نیوەی ڕێگا هاوڕێ (فەرەج)یان گەڕاندبووەو وتبوویان نەوەک لە بازگە عێراقییەکان گومانت لێبکەن، چونکە ئەو هاوڕێیەمان عەرەبییەکەی باش نەبوو، پەیوەندیشمان لەگەڵ فەلەستینییەکاندا زۆر بە نهێنی بوو.

دوای نزیکەی دە ڕۆژ لە سەفەری هەردوو هاوڕێمان، لە ڕادیۆی ئیسرائیلەوە گوێمان لێبوو وتی: تەها خەلیل و یاوەرەکەی لە سنووری فەلەستین - ئوردن کوژروان. خێرا هاوڕێیانم کۆکردەوەو هەواڵەکەم بۆ باسکردن. ئەوانیش زوربەیان بیستبوویان. ئیتر کەوتینە خۆ چۆن ماڵەوەیان ئاگاداربکەین؟ چۆن پرسە دابنێین؟ چۆن تەرمەکەی بگەیەنینەوە سلێمانی؟ ئێمە سەرقاڵی ئەم قسەو باسەبووین لە بەغداوە وەڵامم بۆ هات کە بە پەلە بچمە ئەوێ، ئێمەش هاوڕێیانی سلێمانی وامان لێکدایەوە، کە وا تەرمەکەی لەوێیە، بە مەبەستی هێنانەوەو گەڕاندنەوەی بۆ سلێمانی بە دوای منیاندا ناردووە، هەر گەیشتمە بەغداد، هاوڕێیان وتیان ئەمشەو شاندێکی (جەبهەی شەعبی وجەبهەی دیموکراتی) دەگەڕێنەوە بۆ ئوردن تۆش لەگەڵیاندا بڕۆو لەوێ هاوڕێ (ئەبو عامل) نوێنەری ئێمەیە و پرۆگرامی کارەکانت بۆ ڕێکدەخات، ڕۆژی دواتر گەیشتمە ئوردن.

چووینە ئوردوگای سەرەکی (فەتح) ئەو ڕۆژە پشوومداو ڕۆژی دوایی بردیانم بۆ بارەگای (جۆرج حەبەش)، دیدارێکی تێرو تەسەلم لەگەڵ جۆرج حەبەشدا کرد، پاش چەند سەعاتێک هاوڕێ(تەها خەلیل)یان بە زیندوویی هێنا، ئیتر منیش قسەو باسەکانی سلێمانیم بۆ گێڕایەوە، وتی ئێمەش ئەو هەواڵەمان بیست، بەڵام ئەو تەها خەلیلە جەنگاوەرو فیداییەکی فەلەستینی بووە.

چەند ڕۆژێک بەناو ئۆردوگاکانیاندا گەڕاندیانین، ئێمە قسەمان لەسەر ڕەوشی سیاسی عێراق و کوردستان دەکرد، ئەوانیش پرسیارەکانیان لە سەر شۆڕشی کوردستان بوو، ئەم شۆڕشە بەرەو کوێ دەچێت؟ دەوڵەتانی دراوسێ چەند کاریگەرییان بەسەر شۆڕشەوە هەیە؟ ئایا شۆڕش بۆ ئۆتۆنۆمیە یان سەربەخۆیی؟ ئێمەش بە گوێرەی زانیاریی خۆمان و سیاسەتی حزب وەڵاممان دەدانەوە.

دیدارێکی (یاسر عەرەفات) یان بۆ ڕێکخستین و نزیکەی بیست خولەکێک لای دانیشتین، هەوال بۆ (یاسرعەرەفات) هات کە شەڕ لە نێوان سوپای مەلیک و فەلەستینییەکان لەو ناو شاری عەماندا گەرمە، ئەوە ڕۆژە فەلەستینییەکان (٧٠٪) شاری عەمانیان خستە ژێردەستی خۆیانەوە. ئیتر بە پەلە ئێمەیان ڕەوانەی بەغداد کردەوە.

**هەندێ سەرنج:**

١. جگە لە(یاسرعەرەفات)و (جۆرج حەبەش)و (نایف حەواتمە)و گەلێک سەرکردەی ترمان بینی، لەوانە (یاسر عەبد ڕەبە) کە پیاوێکی زۆر ڕووناکبیرو سیاسی بوو، دەیوت: وا باشە هەموو شۆڕشگێرە چەپەکانی کورد بچنە ناو شۆڕشەوەو خەبات بۆ پێکهێنانی دەوڵەت یان قەوارەیەک بکەن.

٢. (جەبهەی شەعبی)و ڕەوانشاد (فاخیر مێرگە سووری) یارمەتی باشی مەعنەوی حزبی ئێمەیاندا، هەر لەڕێگەی (فاخیر)ەوە بوو توانیمان بگەینە لای مەلا مستەفای بارزانی، شاندەکەمان لە (بەندە، موسڵح ئیبراهیم، عەلاوی و ئەبو ئەنیس) پێکهاتبوو، بە (بارزانی)مان وت: حزبەکەمان ماوەو ئێمە بەڕێوەی دەبەین، داوای

هەندێک یارمەتیمان کردو بەیانێکمان نووسی و لە رادیۆی(دەنگی کوردستان)وە خوێنرایەوە.

٣. رۆژی دواتر لە گوندی ناو کێلەکان رەوانشاد (سامی عەبدولرەحمان) هات بۆ بارەگاکەمان و پیکابێک ئازوقەی بە دیاری بۆ هێناین، لەگەڵ (من و ئیبراهیم و موسلح) کۆبوونەوەیەکی دوو سەعاتی ئەنجامدا.

٤. لە بەیروت چووین بۆ لای( یاسرعەرەفات)، منیان وەکو کوردێک لە سلێمانییەوە ناساند، منیش ئەو رۆژەم بە بیر هێنایەوە کە لە عەمان چوومە خزمەتی، ئینجا ئەو باسی کوردو شۆرشی کوردی کرد، وتی: هەتا شەری عێراق و ئێران من یارمەتی جولانەوەی کوردم بە پارەو چەک و مەشقپێکردن داوە، بەلام لەگەڵ شەری عێراق و ئێراندا ئیتر پەیوەندییەکان گۆرانیان بەسەرداهات.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوەی خۆشەویست، منیش بە دیداری سێ کەسایەتی گەورەی شۆرشگێر شادبووم لەوانە: مەلا مستەفای بارزانی، یاسر عەرەفات و جۆرج حەبەش. لە ساڵەکانی ١٩٦٤، ١٩٦٤، ١٩٦٦.

# (١٩)
# بزنەکەی ئەڵلایی خەریك بوو ملمان بکات بەپەتا!

ئەو کاتەی وەستا (لالۆی پێنجوێنی) لەگەڵ کۆمەڵە وێستگەی پەیوەندیم بوو، لە شاخەوە هەر پەیام و نامەیەکم بۆ هاتبا، لە ڕێگەی لالۆوە بەدەستم دەگەیشت و نامەو پەیامی منیش لە هەمان ڕێگەوە دەگەیشتەوە برادەرانی شاخ، هەر کاتێک لە سلێمانییەوە چووبام بۆ هەولێر، پێشتر سەرێکی لالۆم دەداو هەر چییەک هەبووایە لەگەڵ خۆمدا دەمبرد، یەکەم بەلاڤوک و نوسراوی (نوسەرانی شاخ) من بردم بۆ هەولێرو دامەدەست (ئازاد جوندیانی)، ئەو کاتە بەشێکی پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای متمانەو پاشخانی فیکری و چەپگەرایی دادەمەزران، هەتا خزمایەتیش ڕۆڵی خۆی دەبینی!!

ڕۆژێک لە حەوشەی سەرای پارێزگای کۆن ڕەوانشاد (شازاد سائیب)م بینی و ڕاگەیەندراوێکی (کۆمەڵەی ڕەنجدەران)ی کردە گیرفانمەوە، مامۆستا لالۆی پێنجوینی باسی منی لا کردبوو، ئیتر لەگەڵ شازاددا نێوانێکی خۆشمان بۆ دروستبوو، ڕۆژێک شازاد هات بۆ (بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و جەماوەر) وتی: برادەرێکمان لە هەولێر فەرمانی گرتنی هەیە، خۆی شاردۆتەوەو دەمانەوێ بیهێنین بۆ سلێمانی، وتم باشە سبەینێ سەعات هەشت وەرە بۆ دەوام و پێکەوە دەچین بە سەلامەتی دەیهێنین.

لای خۆمەوە فەرمانێکی کارگێڕیم بە (ئیفاد) نووسی و هەموو ئامادەکارییەکم کرد، لە کاتی خۆیدا شازاد بە زەردەخەنە جوانەکەی و دەنگە نەرمەکەیەوە هات، وتی ئەمشەو برادەرانی هەولێر کاک (کۆسرەت ڕەسوڵ)یان گەیاندوەتە گوندی (بێستانە)، سەفەرەکەی ئێمە پێویست نییە، ئەمانە هەر بۆ بیر خستنەوەی مێژوو بوون!!

هەر جارێک کە بە ئیشی بەڕێوەبەرایەتی دەچووم بۆ هەولێر یەک دوو لە نووسەرو هونەرمەندەکانم لەگەڵ خۆمدا دەبرد، خۆ تام و لەزەتی ئەو سەفەرانەی لەگەڵ (دکتۆر شۆو فەرەج فەرید)و زۆرێک لە نووسیارو ڕۆشنبیران دەمکرد هەر لەیادناچن !!!. ڕۆژێک شەهیدی جوانەمەرگ (دڵشاد مەریوانی) هات بۆ لام وتی هەرکاتێک چویت بۆ هەولێر، منیش دێم و هەندێک شمەکی گرنگم لایە دەبێت بیگەیەنمە ئەوێ، ئێوارەی پێش ڕۆژی سەفەر سەرم لە ڕەوانشاد وەستا لالۆدا، وتی هەندێک شت لە شاخەوە هاتووە لە هەولێر بیگەیەنە دەست (عوسمان دزەیی) کە بە عوسە سوور ناسرابوو، لالۆیش دەیزانی من و عوسمانە سوور نێوانیکمان هەیە، بەیانییەک بەو هەموو شتە یاساغ و نهێنیانەوە لەگەڵ هەردوو ڕەوانشاد(دلشاد مەریوانی و ڕەئوف حەسەن) کەوتینەڕێ، جانتاکەی(دڵشاد مەریوانی) دەمانچەیەکی بێ دەنگ و چەند نارجۆکێکی تیابوو، لوولەی دەمانچە بێدەنگەکە خۆماڵی دروستکرابوو، زۆر قورسبوو.بەمجۆرە کەوتینەڕێ و نزیک گوندی (ئەڵلایی)، ڕانە بزنێک لە جادەکە دەپەڕینەوە، ماشینەکە خۆم لێمدەخوڕی، هێواشم کردەوەو ڕانە بزن پەڕینەوە، لە ناکاو یەکێکیان گەڕایەوەو خۆیکرد بە ژێر پێکابەکەداو شێلام، شوانەکە بە هاوار هاوار گالۆکەی ڕاوەشاندو بانگی لە سەربازەکانی نزیک شەقامەکە کرد، کە لە زرێپۆشێکدا پاسەوانی ڕێگەکەیان دەکرد، ئەفسەرێک و دوو سەرباز هاتن و ئەفسەرەکە بە تووڕەییەوە وتی ماشینەکەیان بپشکنن دڵشادو ڕەئوف (دڵەو ئوفە) شڵەژان، منیش بە پەلە فەرمانی کارگێڕییەکەم پیشاندا کە تێیدا (ئیفاد) بووین بۆ هەولێرو ناسنامەی خۆمم پێداو خۆم پێ ناساند، ئیتر سەربازەکانی گەڕاندە دوواوە. شوانەکە دەیوت بزنەکەم بایی پانزە دینارە، پارەکەم دایەو کەوتینەوە ڕێ، دڵشادو ڕەئوف حەسەن کەوتنە قسەی خۆش و نوکتەو شیعر خوێندنەوە تا گەیشتینە هەولێر، بەو هەموو شتەوە نەموێرا بچینە ناو شار، هەر لە ڕێوە بڕیرماندا ببینە میوانی کاک (مومتاز حەیدەری)، ئەویش هەر سەیری دەکردین و دەیوت شتێکتان لەبن سەردایە، بۆ

بەیانییەکەی هەرکەس ڕۆیشت بەلای کاری خۆیەوە، من (عوسە سوور)م لە بیرۆی پاریزەرێک بینی کە بە تەنیشتی نۆرینگەی ڕەوانشاد (نافیع ئاکرەیی)یەوە بوو. دلشادیش ئەمانەتەکەی خۆی دابووە (ئازاد جوندیانی). ئێوارە هەردووکیانم برد بۆ شەقلاوە، وتم بیرەی سارد بخۆنەوە، وا بزانن لە بەهەشتدان، چونکە ئەگەر شوانەکە ڕازینەبووایە بەپارەو سەربازەکان ماشینەکە بگەڕانایە، ئێستە ئێمە دەبوو وەسێتنامە بنووسین.

**هەندێ زانیاری:**

- **دکتۆر شۆ:** شاعیری میللی بەناوبانگ دکتۆر(شکوری)ە.
- **فەرەج فەرید:** هونەرمەندێکی سلیمانی بوو، بە فەرید ئەترەش سەرسامبوو.
- **عوسە سور:** چالاکوانێکی ئازای کۆمەلە بوو، لە حوکمی سێدارە بە لێبووردنی گشتی ڕزگاری بووبوو، لە سەر لیستی یەکێتی بووبووە ئەندام پەرلەمان، لە هەولێر تیرۆرکرا، لەگەل کاک عوسمان دزەیی چەند سالێکی خۆشمان گوزەراند لەبەرلین. پیاوێکی زۆر مەجلیس خۆش بوو .
- **وەستا لالۆ:** وەستا (عەبدولڕەحمان)ی پێنجوێنی تێکۆشەرێکی دێرینە، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و نوێ بوو، ئەگەر دەتانەوێ باشتر بیناسن کتێبکەی بخوێننەوە (پەنجا سال بۆ نیشتمان)
- **ئەللایی** گوندێکە لە ڕۆژئاوی سلێمانی .
- **وەستا لالۆ و دلشاد** زۆر جار ئەو شتە مەترسیدارو نهێنیانەیان دەهێنا لە کۆگای بەڕێوەبەرایەتی من دایاندەنا. لێپرسراوی کۆگا(گێلاس خان) خوشکی شەهیدێک بوو و جێگەی متمانەو باوەڕمان بوو.

چەپکێک گول و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوەی خوێنەری فەیس بووک، ئێمەش شەوێک لە شەقلاوە بە ئارامی خەوتین.

## (٢٠)

# بەکری حاجی سەفەر و کۆبوونەوەکەی هەڵەبجە

بیرەوەرییەکان زۆرن، بەڵام کەمیان دەبنە نەخشی سەربەرد، یان دەبنە داستان و چیرۆک و بە نەمری دەمێننەوە.

لەگەڵ(بەکری حاجی سەفەر)، هەر لە منداڵییەوە هاورێ و هاوبیرو هۆگری یەکتربووین، بەشی زۆری ژیان و گوزەرانمان هەر پێکەوە بوو. لە ماڵدا هاوسێ بووین. لە تەمەندا خوارو ژوور بووین. بۆیە لە شەرەگەڕەک و دەستەگەریشدا هەر پێکەوەبووین، لە قوتابخانەدا ئەو پۆلێک لە پێش منەوە بوو. وەکو دێتەوە بیرم ساڵانی (١٩٥٦و ١٩٥٧) بوو، لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووین، کومەڵەیەکمان بە ناوی(کاوە) دروستکرد، ئەویش تێیدا چالاکبوو.

لە جڤینێکماندا لە گردەکەی پشتی (حەسناوا)، من بە سەرۆکی کۆمەڵەو هەر یەک لە بەکری حاجی سەفەرو شێخ عەلی نزارە بەجێگر هەڵبژێردراین.

مانگانە دووجار کۆدەبووینەوە، بەلاڤۆک و ئەدەبیاتی حزبی شیوعی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستانمان لە ناو کۆبوونەوەکاندا دەخوێندەوە، ئەدەبیاتی حزبی شیوعی لە ڕێگەی (قادر ڕەشید ناسک)و هی پارتیش لە ڕێگەی (حەمەی ڕەشید بەحری)یەوە بە دەستمان دەگەیشتن.

لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنماندا، بەکر بووە پارتی و منیش بوومە شیوعی، بەڵام پەیوەندیی و نزیکیمان هەر وەکو خۆی مایەوە. لەگەڵ کامڵ بوونماندا لە ڕووی فکرییەوە، بەکر مارکسیستێکی کلاسیکی ڕادیکاڵی لێدەرچوو، منیش چەپێکی شەیدای ئازادیی.

دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، بەکر گەڕایەوە پێنجوین و دوکانی مریشکفرۆشی دانا، دەیوت من پۆلیتارم، منیش بەڕێوەبەری(ناحیەی گەرمک)و بریکاری (قایمقامی پێنجوین) بووم، بەڵام باوەڕو متمانەی بێسنوورمان بە یەکتری هەبوو، گەیشتبووینە ئەو (ڕا)و باوەڕەی پێویستە خەباتی نەتەوەیی و چینایەتی بە ڕابەرایەتی حزبێکی مۆدێرن لێکبدرێ و لەسەر ئەم بنەمایە شۆڕشی چەکداریی بەڕێوە ببردرێت.

ڕۆژێک ڕەوانشاد بەکری حاجی سەفەر هاتە لام و وتی: ڕێکخستنێکی تازە هەیە ناوی(کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ە، بە دوای (جەلالی) یە کۆنەکاندا دەگەڕێن تا سەرلەنوێ ڕێکیان بخەنەوە، داوای لە من کرد کۆنە شیوعییەکانیان پێبناسێنم، منیش هەر بە ئۆتومبێلی فەرمانگە لە شارەزوور، دەربەندیخان، سلێمانی و هەولێر، چی کۆنە شیوعی هەبوون، بەتایبەتی ئەوانەی(قیادەی مەرکەزی) هەموویانم پێناساند.

بەکری حاجی سەفەر کۆبوونەوەیەکی لە کۆنە شیوعی، چەپەکان و جەلالییە کۆنەکان لە ماڵی (مەلا ڕەئوف) لە هەڵەبجە ڕێکخستبوو، لای ئەوان ناوی منی هێنابوو، داوای لێکردم پێکەوە بچین و بیگەیەنمە شوێنی مەبەست، کاتێک بە ئۆتۆمبێلی فەرمانگەو پاسەوانی پۆلیسێک (عیزەت، لە کۆنە شیوعییەکانی قرگە بوو) گەیشتینە بەردەگای ماڵی (مەلا ڕەئوف)، هەر بابا بوو ڕایدەکرد، چونکە ئەوانەی لەوێ بوون کاتێک ئۆتۆمبیلێکی فەرمانگەو پۆلیسیان بینی، وایان لێکدابۆوە کە کەوتوونەتە تەڵەوەو بە سەریاندا داون، هەتا کاک بەکر فریاکەوت و هێوریکردنەوە.

دوای سێ چوار کاتژمێر بەکر هاتەوە بۆ کەبابخانەی(عەلی حاجی سمایل)و لە وێوە پێکەوە هاتینەوە، منیش لەڕێگەی (جەمال جەلال و شازاد سائیب)ەوە، دوورو نزیک ئاگاداری چالاکیی و جموجۆڵی کۆمەڵە بووم.

بەکر بڕیاری چوونە شاخی دابوو، بۆ ئەم مەبەستە لەماڵی خۆیان یەکترمان بینی، هاوین بوو لە حەوشە دانیشتبووین، بە دەم ئەم باس و خواسەوە هاتینە دەرەوە، لە تاریکایی بەر دەرگەدا لووتمان بوو بە لـووتی (ناسـراو)ێکەوە، پێدەچوو گـوێی بـۆ قسـەکانمان هەڵخسـتبێ، دەمـانزانی سـیخوڕی بـۆ(مەنزوومەی ئیسـتخباراتی شـیمالی) دەکـات، ئێمە لێـی سـڵەمینەوە، کـابرای پێنجـوێنی سـێخوڕیش بە دیتنـی ئـێمە پەشۆکا، من ترسام بەڵام بەکر دڵنایی دامێ کە ئەو سـیخوڕە نـاتوانێ هیچ خراپەیەک بەرانبەری من بکات.

کاک بەکری هـاوڕێی منداڵی و گیـانیم، لە پێشـمەرگایەتیدا بـوو بە لێپرسـراوی مەڵبەنـدی (یەک)ی یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان لە شـارباژێڕ، بە زۆری لە هەر دوو گونـدی بـاراوو چنگیـان دەمـانەوە، هەر چییەک پێویسـت بـوایە لەڕێـگەی (پیـاوە پیـرەکە)ەوە، کە کـۆنە شیوعییەکی گوندی چنگیان بوو، دەنگمان دەگەیشـتە یەک و ئیشـەکان ڕایی دەکران، وەکو پێداویستی فیشەک و دەرمان و پارە.

هـاوینی سـاڵی ٢٠٠٣، بۆ یەکەمجـار کە لە ئەڵمانیـاوە هـاتمەوە بۆ سلێمانی، بە ئامـادە بوونی بەڕێز (سـەلاح ڕەشـیدو ڕەوانشـاد دکتـۆر کەمـال فـواد) بە دیداری سـەرۆک(مام جەلال) گەیشـتم، دوای هەمـوو قسـە کردنێـک فەرمـووی چـی داخوازیـت هەیە، چـی پێویسـتیت هەیە تاکو بۆتی جێبەجێبکەم، وتم داخـوازی من گرنگیدانە ئاوەدانکرنەوەی پێنجوێن و لاکردنەوە لە هەردوو تێکۆشـەر (جەمـال جەلال و بەکـری حـاجی سـەفەر)، بەڕێـز مـام جەلال بە پێکەنینـەوە وتـی، خـۆت چیـت دەوێ؟ منیش هەمان داخوازی خۆمم پاتە کردەوە.

دوای ماوەیەک لە دیدارێکدا، لە سـەیرانگەی بلکیان(بەکرو جەمـال) سوپاسـگوزار بـوون، بەڕێـز مـام جەلال لە چارەسـەرکردنی کێشەکانیاندا هاوکاریکردوون، بەکریش بە پێکەنینەوە دەیـوت زەمـان گـۆڕاوە، کە مـن لای بەڕێـز مـام جەلال، داوامکـردووە کێشـەکانیان چارەسەر بکرێت.

- لەسـەر ڕاپـۆرتی سـیخوڕەکەی پێنجـوێن، دوو جـار لە (ئەمنـی عامەی بەغدا)، بۆ لێپێچانەوە بانگیانکردم.
- ئەو کـاتە مـاڵی بەکـری حـاجی سـەفەر، لە کـۆڵانەکەی نزیـک ماڵی(حاجی عەبە ڕەحا) بوو.
- ئەو کـاتەی بەکـرم گەیانـدە مـاڵی مەلا ڕەئـوف، لە هەڵەبجـە کاتژمێرەکەی بەکر وەستابوو، کاتژمێرەکانمـان گۆڕییەوە، بەکر وتـی ئەم کـاتژمێرە پەڕلە(نهێنی)بێـت لە نێوانمانـدا، هەر کەسـێک باسـی کاتژمێرەکەی نەکرد، باوەڕت پێینەبێت.
- ئەم نووسـینە بـۆ سـاڵوەگەری کـۆچی دوایـی هـاوڕێ و بـرام بەکری حاجی سەفەرەوە نووسراوە.

چەپکێـک گـوڵ و چەپکێـک نێرگـز بـۆ ئێـوە، منـیش دوو هـاوڕێی تەمەن بە جێیان هێشتووم.

## (٢١)
# بە بۆنەی ڕۆژی (کۆبانی)یەوە
# ئێمەیش لە سەرکەوتنی کۆبانی ئاگادار بووین!!

کۆبانی و شەڕڤانەکانیان یەکەم هێزبوون بە تیرۆری داعشیان وت نـا، نـا. ئێوە دەبێت بڕوخێن و نەمێنن، ئێوە شێرپەنجەن لە لەشی مرۆڤایەتیدا، دەبێت ڕیشەکێش بکرێن.

کۆبـانی لە ژێـر دروشـمی سـەرکەوتن، یـان سـەرکەوتن، یـان سەرکەوتن، بڕیاری بەرخودانی هەتا مردنیدا، شەڕ درێژەی کێشاو گەرمبوو، هەموو دنیاو ئەو دەوڵەت و هێزانەی لە ناوچەکەدا بوون، چاویـان لەوە بـوو بـزانن ئایـا شـەڕڤانەکانیش وەک هێـزە عێراقـی و کوردییەکان دەبەزن، چەک فڕێدەدەن و دەیقوچێنن؟

دوو (فـرقە) لە سـوپای عێـراق بە هەمـوو چەکێکـی مـۆدێرن و تەکنەلۆژیـای سـەردەم پـڕچەک بـوون، دوو (هێـز)ی پێشـمەرگە لەبەرانـبەر (٣٠٠ - ٤٠٠) چەکـداری تیـرۆر هەڵبـێن، گەمەیەکـی سەرسوڕهێنەربوو، گاڵتە نەبوو .

لە دیدی شارەزاو شرۆڤەکارانی سەربازیدا جێگەی پرسیار بوو. ئەنجـامەکەی جینۆسـایدی (ئێزیـدی)یەکان و هەراجکردنـی نـاموس و کەرامەتیان بوو، لەبەر ئەمە هەموو جیهان چاوی بڕیبووە کۆبانی.

شـەڕ درێـژەی کێشـاو بەرخـۆدانی شـەڕڤانان هەمـوو هێـزو دەوڵەتانی شۆک کرد، هەموو سەرسامی خۆیان بەرانبەر بەم داستانە بێ وێنەیە هێنایە زمـان، بەتـایبەتی ئەمەریکاو ئەورووپا، بۆیە هێزی هاوپەیمانـان کەوتـنە ئەوەی چـۆن پەیوەنـدیی لەگەڵ شـەڕڤاناندا دروستبکەن .

بۆ ئەمە، بەرپرسێکی بڵند لە باشوور پێوەندی پێوەکردم و وتـی: هاوپەیمانـان دەیانەوێـت پێوەنـدی لەگەڵ شـەڕڤاناندا بـکەن و داوای

زانیاریی دەکەن لەسەر چۆنیەتی شەڕ، ئەوکاتە تێکەڵیم هەبوو، لە کۆبانی ئاگاداری ڕەوشەکە بووم، هەمان کات لە ولاتێکی ئەورووپاوە کەسایەتییەکی کورد بە تەلەفۆن ئاگاداری کردم (ئەمریکییەکان داوای تەلەفۆنی تۆیان کردوەو ئەیانەوێت قسەت لەگەڵدا بکەن)، بەلام کێشەکە ئەوە بوو زمانی (ئینگلیزی)م نەدەزانی، پاش چەند تەلەفۆنێک کەسێکیان هێنا بەعەرەبی قسەیدەکرد، ئیتر کارەکە ئاسان بوو.

وتی: ئێمە دەمانەوێت یارمەتی کۆبانی بدەین و کەسێکمان دەوێت لە ناو شەڕەوە بە ئینگلیزی لەگەڵی بئاخڤین، تا بەڕاستی (احداسیات) مان بداتی و بزانین، ئێمە دەتوانین چی بکەین بۆ کۆبانی، چونکە ئێمە نامانەوێت کۆبانی وەکو شەنگالی لێبێت.

ئەم پەیامەم گەیاندە شەڕڤانەکان و بە تەلەفۆن پێوەندییم بە هەڤاڵ (ساڵح موسلیم) کرد، کە لە ولاتێکی ئەورووپا بوو، زۆر سەرسامبوو بەو هەواڵانەی پێمگەیاند، لە ماوەیەکی کەمدا کارەکان جێبەجێکران، لەڕێگە بەرپرسێکی بالای (یەکێتی)ەوە، لەگەڵ ژوورێکی ئۆپەراسیۆنی(ئەمەریکی، عێراقی و کوردی) لە کوردستان پەیوەندییان بۆ دروستکردم، ئیتر بە بەردەوامی ڕەوشی بەرخۆدان و بەرگری دەگەیشتە ژووری (ئۆپەراسیۆن)، لە ڕێگەی ئەو پێوەندییە سێ قۆڵییەوە.

ڕۆژێک هەرچی ئامێری ئەلیکترۆنی هەبوو لەلای من هەمووی لەکارکەوت!! ئەو هەڤاڵە دەستڕۆیشتووەی (یەکێتی)م ئاگادارکردەوە، وتی: دەرفەتێکم بدەرێ بزانم چییە؟ بەلام تۆ شوێن و جێگەکەی خۆت بەجێبهێڵە، بە تەلەفۆن و ژمارەی دیکە کارەکەت بکە، هەر وامانکرد پاش نزیکەی دە کاتژمێر ئامێرەکان کەوتنەوە کار، دەوڵەتێکی زلهێز کە لەکوردستاندا دەزگای هەواڵگرییان هەیە، ویستبوویان بزانن ئەم هەموو کۆنێکشنە چییە لەم گەڕەکەدا.

ئێستەش ئەو نامەیەی شەڕڤانەکانی ناو (کۆبانی)م ماوە کە دەڵێت: ئێمە لە یەک کیلۆمەتر چوارگۆشەدا گەمارۆ دراوین و بڕیارمانداوە بەرخۆبدەین و بە دوا فیشەک ماڵئاوایی لە کوردو کوردستان بکەین!!

ئەم نـــامەیەم گەیانـــدە هەمـــوو لایەک، نـــاوەڕۆکی نـــامەکەو وەرگێـڕدراوە ئینگلیـزییەکەی، لە ژووری (ئۆپەراسـیۆنەوە) گەیشـتە پـایتەختی ئەمەریکـاو دەوڵەتە ئەوروپییەکـان، زیـاتر لە بیسـت ڕۆژ، شەوانە دوو یان سێ کاتژمێر کاتم هەبووە بۆ خەوتن .

ئیتر کەوتینە کۆکردنەوەی پێداویستی شەڕو ئەو شمەکانەی ئەوان داوایـــانکردبوو، لە سـلیمانی هەشـــت تـــۆن لەلایەن (یەکێتـــی)ەوە کۆکرایەوە، (پـارتی) چوارتـۆن. هاوپەیمانـانیش هەشـت تـۆن، کشـتی بیســـت تـــۆن لەژووری(ئۆپەراســـیۆنەکان) کـــۆکراوە، تورکەکـــان بەمەیـانزانی، ویسـتیان ڕێگری لەنـاردنی بکەن، بەڵام(فەڕەنسی)یەکان پێداگری زۆریان کرد بۆ ناردنی، هاوپەیمانان پاش چەند ڕۆژ گفتوگۆ بڕیاریاندا بە فڕۆکە هەر بیست تۆنەکە وەکو یارمەتی شـەڕ بخەنە خوارەوە، هەر بیست تۆنەکە زۆر بە دیقەت کەوتبوونە ناو سەنگەری شەڕڤانانەوە، ئەوەی جێگەی سەرسامی بوو، پەڕەشووتێک کەوتبووە ناو سـەنگەری داعشـەکانەوە من زۆر غەمبـاربووم پەیوەندیم، لەگەڵ بەرپرسە باڵاکەی یەکێتی کرد وتی دوایی باسی لێوەدەکەین، تـومەس ئەمە کـاری (CIA)بـووە، بـۆ هەر پـارچە چەکێـک (GPS)یـان لێبەسـتووە، بەو هـۆیەوە زۆر حەشـارگەی(داعش)یان بـۆ فڕۆکەکـانی هاوپەیمانان ئاشکرا کرد .

ئیتـر پاش ئەم ئۆپەراسـیۆنە، دەوڵەتـی تـورک ناچاربوو ڕێگەبدات هێزی پێشمەرگە بچێت بۆ یارمەتی کۆبانی، تورکەکان لەوە دەترسـان پرسی کۆبانی بکرێت بە کێشەیەکی نێودەوڵەتی، ئەو کـاتەی کە تفـاقی شـــەڕ لە ئاســـمانەوە بەردەدرانەوەو دەکەوتـــنە دەســـت شـــەڕڤانان، بەرپرســـەکەی یەکێتـــی لە دەرەوەی کوردســـتان بە تەلەفـۆن پێیـوتم ئەمشەو تێر بنوو، کۆبانی ناکەوێت.

دوا نامه له (کۆبانی)و هەڤالانەوە بۆم هات دەڵێت: ئەو یارمەتییانە، مۆراڵی شەڕوانانی زۆر بەرزکردەوەو گیانی بەرخۆدانی گەیاندە ئاسمان.

سەرنج:

١ -بۆیە ئێستا ئەم نهێنیانەم ئاشکرا کرد وتم نەکا لەگەڵ خۆمدا بیبانبەمە ژێر گڵ!!

٢-زۆر وردەکاری تر هەن لە بیرەوەرییەکانی تردا باسیان لێوە دەکەم.

٣ -لەسەر داوای خۆیان ناوی ئەو کەسایەتییانەمان نەهێنا، کە باسمان لیوە کردوون.

٤ -فەرەنسییەکان، ئەمە یەکەمجار نییە هەڵوێستی مێژوویی و مرۆڤانەیان بەرانبەر دۆزی کورد هەیە، بۆ نمونە مەسەلەی دژەفڕین و ناوچەی ئارام بۆ باشوور، پێشنیاری فرانسۆ میتران و فەرەنسا بوو. ئێستاش هەڵوێستی زۆر باشیان بەرانبەر بە ڕۆژئاوا هەیە.

چەپێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوەی ئازیز. هەزار چەپکە گوڵ بۆ (ژەنڕاڵ) منیش لەپردی باشوور -باکوور پەڕیمەوە بۆ ڕۆژ ئاوا.

# (٢٢)
# میكانیزمەكانی پرۆسەی ئاشتی
# زنجیرەی یەك

**نامەی هەڤاڵ جەمال (موراد قەرەیەلان) بۆ پادشای ئۆردن:**

لەگەڵ (هەڵۆی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد) پێوەندی و دۆستایەتی باشمان هەبوو، ئەو دەیزانی من و باوكی لە ساڵانی(١٩٩٣ - ١٩٩٥) نزیكی یەكتری بووین و پێكەوە كارمان بۆ ئاواكردنی (پەرلەمانی دەرەوەی وڵات)و (كۆنگرەی نەتەوەیی)دەكرد، بەندە یەكەم كوردی باشوور بووم لەو مەیدانەدا چالاكیم دەنواند.

لە درێژەی ئەو هەوڵانەمدا، لە لەندن سەردانی مامۆستا(ئیبراهیم ئەحمەد)م كردو كارئاسانیشم بۆ كرد كە بچێتە (بیقاع) لە لوبنان و بە دیداری سەرۆك (ئاپۆ) بگات. لەگەڵ كاك (هەڵۆ)شدا پێوەندیمان گەرمبوو، زوو زوو سەردانی یەكتریمان دەكرد.

ڕۆژێك وتی: بەرپرسی دۆستێی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە دیوانی مەلەكی ئوردون، بە نوێنەرایەتی مەلیك، میوانی بەڕێز(مام جەلال)ە، لە بارەی كوردەوە پرسیاری زۆری لە من كردووە، بە تایبەتی شۆڕشی كورد لە باكووری كوردستان و ڕۆڵی پ.ك.ك.

كاك (هەڵۆ) وتی: نوێنەرەكەی مەلیك دەیەوێت،كەسێك لە (پ.ك.ك)ەوە سەردانی (عەمان) بكات و لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بكەن، منیش ناوی تۆم پێداون، دەڵێیت چی ؟

بۆ ئەم مەبەستە سەردانی شاخم كردو هەڤاڵ (موراد قەرەیەلان)م بینی، بەو هەواڵە دڵخۆشبوو،(ڕا)ی خۆمم پێوت، كە نامەیەكی نەرم و دیپلۆماسییانە لەگەڵ خۆمدا ببەم، ئەوە بوو دوای چەند ڕۆژێك لە ڕاوێژی نێوان خۆیان هەڤاڵ (دەنیز) بە نامەیەكی كراوەوە كە بە زمانی عەرەبی بۆ خاوەن شكۆ نووسرابوو، گەیشتە لام .

زۆر بە کورتی ناوەرۆکی نامەکە ئاوا بوو: (ئێمە بزاڤی شۆڕشگێڕی گەلی کوردین زیاتر لە بیست ساڵە تێدەکۆشین بۆ ئەوەی لە دەستووری تورکیادا بوونی گەلی کوردو مافەکانی بسەلمێنرێت، چونکە دەوڵەتی تورکیا نکوڵی لە بوونی گەلەکەمان دەکات، کە نزیکەی ٢٥ تا ٣٠ ملیۆن دەبین، داوا لە جەلالەتتان دەکەین هەوڵبدەن ئەم کێشەیە بە ئاشتی چارەسەر بکرێت، ئێمە ئامادەی دیالۆگ و ڕێگە چارەی ئاشتیانەین.

نامەکە بە ناوو مۆری (کۆما جڤاکی کوردستان)و واژۆی هەڤاڵ (موراد قەرەیەلان)ی بەسەرەوە بوو ،کە ئەو کاتە سەرۆکی کۆنسەی بەڕیوەبەری کوما جڤاکی کوردستان بوو ..!!

کاک هەڵۆ بلیتی فڕۆکەی بۆ من ئامادەکردو ئەوانیشی ئاگادارکرد، ناوو ژمارە تەلەفۆنی (ساڵح) ناوێکی پێدام، لە کاتی خۆیدا گەیشتمە فڕۆکەخانەی(عەمان)، بینیم کەسێک ناوی منی بە دەستەوە گرتووە، هەتا وشەی پێنجوێنییەکە بە هەڵە نوسرابوو پێنج نییو!! کەسەکە خۆی پێناساندم جەنەراڵ (ابو فلان) لە دائیرەی(موخابەراتی گشتی) .

بردمیان بۆ هۆتێل شیراتۆن لە شوێنی میوانەکانی مەلیک دایاننام، وتیان:(تۆ میوانی مەولانا مەلیکیت هەتا ١٥ ڕۆژ بۆت هەیە لێرە بیت، دوایی خۆمان بۆ جێبەجێکردنی کارەکان، دێینەوە بە شوێنتدا).

ئیتر ئەو دەپانزە ڕۆژەی وەکو میوانی مەلیک لە هۆتێل مامەوە، بۆ من دەرفەتبوو چی شوێنەواری ئەغریق و ڕۆمان و ئەمەوییەکان هەیە بە سەر بکەمەوە، ئەو شۆفێرو پاسەوانەی بۆ یارمەتیدانی من نێردرا بوون، لە دیوانی مەلەکییەوە هاتبوون، زۆر هاوکارییان کردم، هەتا چووین بۆ شوێنەواری (بەترا)، کە شوێنەوارێکی گەشتیاری سەرسووڕهێنەری مێژووییەو دوو کاتژمێرو نیو لە عەممانی پایتەختەوە دوورە، ئەو ماشێنەی بۆ منیان دانابوو ژمارە(٣)ی دیوانی مەلەکی پێوەبوو، شۆفێرو پاسەوانەکەش لە هێزە تایبەتییەکانی مەلیک بوون!!.

دوای چەند ڕۆژێک پشوو، بردمیان بۆ (دیوانی فەرمانگەی گشتی هەواڵگری)، لەوێ نامەکەمدا بە سەرۆکی دەزگاکە (ئەلزوهبی) کە خزمی نزیکی مەلیک بوو، چەند پرسیارێکی لێکردم، ئەوەی لەبیرم مابێت وەکو خۆی دەینووسمەوە:

١ -تۆ ئەندامی پەکەکەیت؟ نەخێر من دۆستیانم
٢ -فەلسەفەی پەکەکە چییە؟ کۆمۆنیست و مارکسین؟ نەخێر، ڕێبازی فیکرو کاریان فەلسەفەی (ئۆچەلان)ە .
٣- فەلسەفەی ئۆچەلان چییە؟ تێکەڵکردنی خەباتی نەتەوەیی و چینایەتییە بۆ ڕزگارکردنی نیشتیمانی داگیرکراو بە شۆڕشی چەکداری.
٤- کێ لە عێراقییەکان لە هاتنت ئاگادارە بۆلای ئێمە؟ کەس نازانێت.
٥ -پێوەندی تۆ لەگەڵ حزبی تاڵەبانی و بارزانی چۆنە؟ باشەو ئاساییە.
٦ -چی داواکاری و پێداویستیت هەیە لێرە بۆت بکەین؟ گەیاندنی نامەکەو هەوڵی (جەلالەتی مەلیک) بۆ ڕێگە چارەیەکی ئاشتییانەی دۆزی کورد لە تورکیا.

پاشان زۆر بە ڕێزەوە بەڕێیان کردم هەتا بەردەرگا.
چەند ڕۆژێک دوای دیداری (ئەلزوهبی) بردمیان بۆ بەندەری (عەقەبە) بۆ ماڵی پادشا (عەبدوڵڵا کوڕی حوسین)، لە دیدارێکی کورت و تەشریفاتیدا، بە دەم قاوە خواردنەوەوە چاوم بە خاوەن شکۆ کەوت، بەڵام پێشتر پێیان وتبووم کە مەلیک کاتی کەمە، چونکە دەچێت بۆ (بەترا) ڕێز لەوانە دەگرێت کە لە ئاستی دنیادا براوەی خەڵاتی بە نێوبانگی (نۆبل)ن.
هەر ڕۆژێک دوای دیداری (خاوەنشکۆ)، منیان بردەوە بۆ دەزگای هەواڵگری، لێم پرسین ئەگەر من گەڕامەوە چی بە (موراد قەرەیەلان) بڵێم، وتیان: مەولانا فەرموویەتی انشاءالله خێر ئەبێت، هەر ئەوەندە.

سکرتێرەکەی (ئەلزوهبی) پێیوتم ئێوە چۆن شتی وا دەکەن؟؟ وتم بۆچی بووە بەڕێز؟ ڕۆژنامەیەکی دایە دەستم، فەرموو بیخوێنەرەوە، لە گۆشەیەکدا نوسرابوو(داود باغستانی لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا دەڵێت: نامەی پەکەکەم گەیاندە ناتانیاهۆ)، سکرتێرەکە وتی: ئەمە مانای چییە ئوستاز، موراد تۆ بۆ لای ئێمە دەنێریت و داود باغستانیش بۆ ئیسرائیل، چۆن کاری وا دەبێت)، وتم من هیچ ئاگام لێ نییە.

ئەوە کارەکەی منی زۆر ئاڵۆز کرد، من ئەو ڕۆژنامەیەم هێنایەوەو دامە دەست هەڤاڵ موراد، زۆر نارەحەت بوو، وتی: من نە داودم ناردوە، نە نامەم بۆ ئیسرائیل نووسیوە، داود هاتوتە لای ئێمەو وتویەتی دەچم بۆ تەلئەبیب لەوێ بەرپرسە گەورەکان دەبینم، چیتان هەیە تا بیگەیەنم، پێمانوتووە ئێمە شۆڕش دەکەین و لە ژێر ستەم و زۆرداری دەوڵەتی تورکداین، هەر کەس یارمەتیمان بدات سوپاسی دەکەین.

ئەو کاتەی لە هوتێل شیراتۆن بووم بەڕێز (هۆشیار زێباری) وەزیری دەرەوەی ئەوسای عێراق، بە سەردانێکی فەرمی هاتبوو بۆ ئۆردون، لە هوتێلەکە منی بینی زۆر دیقەتی دامێ نازانم ناسیمی یان نا.

هەروەها دکتۆر (موفەق دەرگەڵەیی)م بینی کە ڕاوێژکاری ڕۆژنامەوانی بەڕێز (مام جەلال) بوو لە بەغداد، پێکەوە گەڕانێکی باشمان بە ناو شاری (عەممان)دا کرد، کە گەڕامەوە کوردستان جەنابی (مام جالال)م لەم سەفەرە ئاگادار کردەوە، زۆر زۆری پێخۆشبوو، پێی وتم تۆ پیاوی ڕۆژی تەنگانەیت.

دوای سەفەرەکەی من بە ماوەیەک، ئەردۆگان بە سەردانێکی فەرمی چوو بوو بۆ ئۆردون، بە تەلەفۆن پێیانوتم خاوەن شکۆو ئەردۆگان باسی پرسی کوردیان کردووە.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، منیش لە ناساندنی دۆزە ڕەواکەماندا کەمتەرخەمیم نەکرد.

# (٢٣)
# میكانیزمەكانی پرۆسەی ئاشتی
# زنجیرەی دوو

**<u>كێشەی دوانزە سەربازەكە</u>**

لە یەكێک لە شەڕە قورسەكانی نێوان گەریلاكان و سوپای توركیا، لە ساڵی ٢٠٠٦ -٢٠٠٧دا، دوانزە سەربازی تورک بە دیلی كەوتنە دەست گەریلاكانی پەكەكە، ئەوسا لە توركیا تا ڕادەیەک ئازادیی ڕۆژنامەگەری هەبوو و وەكو ئێستا سانسۆر لەسەر ڕۆژنامەكان نەبوو، دوای ئەو ڕیسوایییەی لەشكری توركان، دوو ڕا دەركەوتن، هەندێكیان داوای شەڕ وەستاندنی نێوان پ.ک.ک و دەوڵەتیان دەكرد، یاخود هەبوون داوای چارەسەری پرسی كوردیان لە بێخەوە دەكرد، لە هەمبەردا میدیای نەژادپەرست ڕەخنەی زبریان لە دەوڵەت دەگرت و لەشكری توركیایان بە بێكارەو بوودەڵە ناودەبرد، ئەوانە ڕەوشی ئاڵۆز و نائارامییان لە توركیا خولقاندبوو، لە لایەكی تریشەوە میدیاكانی سەر بە پەكەكە زوو زوو ئەو سەربازانەیان دەهێنانە سەر شاشەو گفتوگۆیان لەگەڵ دەكردن.

پرسی سەربازە دیل كراوەكان، ئاكپارتی و دەوڵەتی خستبووە ژێر پاڵەپەستۆیەكی گرانەوە، هەراسان بووبوون، بە هەموو لایەكدا پەلیان دەهاویشت، لە چەند كەناڵ و ڕێگەوە پێوەندییان لەگەڵ سەركردایەتی پەكەكە كردو هەوڵیان بۆ ئازادكردنی ئەو دوانزە سەربازە دەدا. لەڕێگەی هەولێرو (سەركردایەتی پارتی)یەوە، لەڕێگەی جەنابی (مام جەلال)ەوە كە ئەو كات سەركۆماری عێراق بوو، هەتا پێوەندییان بە باڵیۆزخانەی ئەمریكا لە بەغداد كردبوو.

لەم كەناڵانەوە پێوەندییان لەگەڵ مندا كرد، خواست و داوای هەموویان هەوڵدان بوو، بۆ ئازادكردنی سەربازەكان، كاک (مەلا

بەختیار) پێوەندی پێوەکردم و وتی: (مام جەلال بە جددی داوا لە تۆ دەکات، هەوڵی تایبەتی خۆت بخیتەگەڕ بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە)، چووم بۆ (قەندیل) هەڤاڵ جەمال (موراد قەرەیلان)م بینی، سلاوو پەیامی (مام جەلال)م پێگەیاند، زیاتر لە مانگێک هاتووچۆی (هەولێر، سلێمانی، بەغداد و قەندیل)م کرد، لە سەر داوای (مام جەلال) لە دوو دیداری جیاوازدا لە بەغدا، جارێکیان بەرپرسێکی بڵندی ئەمریکاو جارەکەی تریش باڵیۆزی ئەمریکا بەشداری دیدارەکەمان بوون، لە هەردوو جارەکەدا ئاراستەی داواو قسەکان بەوە دەشکانەوە بە زووترین کات بچمە قەندیل و بە سەرکردەکانی پەکەکە بڵێم (ئەگەر ئەو سەربازانە ئازاد نەکەن، تورکیا هێرشی باشوور دەکات و لە پێش هەموو شتێکدا فڕۆکەخانەی هەولێرو سلێمانی بۆمبباران دەکات)، باڵوێزەکەی ئەمریکا ڕوویکردە من و وتی: (مستر پێنجوێنی ئەمە قسەی وەزیری بەرگری و ئەرکانی تورکیایە کە بەنامەی فەرمی و بە تەلەفۆن من و سەرکۆمارو کاک مەسعودیان ئاگادار کردۆتەوە)، منیش ئەمانەم لای خۆم تۆمار کرد، دوای ئەوەی ڕوخسەتم لە مام جەلال وەرگرت، ڕوومکردە کابرای ئەمریکی وتم: ئەی هەڵوێستی ئەمەریکا چی دەبێت؟ چونکە ئاسمانی کوردستان لە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکا دایە، لە وەڵامدا وتی: (ئێمە ناتوانین شەڕی ئەندامێکی ناتۆ بکەین لەبەر ئێوە)، (مام جەلال) وتی: سبەی زوو بگەڕێوە، بچۆ بۆ قەندیل بەناوی منەوە پێیان بڵێ (ئەو سەربازانە بەربدەن و بیکەن بە "عەرەبوون" بۆ شەڕ وەستاندن و پرۆسەی ئاشتی).

چوومەوە قەندیل پەیامی ئەوانم گەیاندە سەرکردایەتی پەکەکە، هەر لەو سەروبەندەدا کاک (هەڵۆی ئیبراهیم ئەحمەد) هاتە لام، وتی: دوو بەرپرسی ئەمریکا میوانی منن، دەیانەوێ بتبینن، منیش چووم زۆر پرسیاریان لێکردم، وتیان بە ناوی ئێمەوە ئەم پەیامە بگەیەنە بە قەندیل(ئێمە لە واشنتۆنەوە هاتووین، ئەگەر ئەم کێشەیە چارەسەر نەکرێت پرۆسەی سیاسیی باشوور دەکەوێتە مەترسییەوە، ئێمە

ئاگادارین تورکەکان دەیانەوێت کێشـەیەک بـۆ ئـێمە لەم نـاوچەیە دا دروستبکەن و ڕەوشە سیاسییەکە لە باشـوور ئاڵۆز بکەن). هەر لەو ڕۆژانەدا بەرپرسێکی پەکەکە بە نـاوی (ئەسـەد) بۆ ئەم کێشـەیە هـات بۆلای من، هەموو شتەکانم بۆ باسکرد، ئەویش هەندێ تێبینی خۆی پێـوتم، دیـدارم لەگەڵ کـاک هەڵـۆدا بـۆ ڕەخسـاند، گفتوگـۆی زۆر لە نێوانیادا هەبوو، شەوێک بەرپرسێکی ئەمریکی بە خۆی و دەستەیەک مـارینزەوە خۆیـان کـرد بە مـاڵی ئـێمەدا، حەوشـەو سـەربان و دەرو دەرگایان کۆنترۆڵکرد.

من دڵم داخورپا وامزانی بۆ گرتنی هەڤاڵ ئەسـەد هـاتوون، ئیتر کـاک هەڵـوو کـابرای دریـژی ئەمەریکـی بە پێکەنـین و هەلەو هەلەو خۆیان کرد بە ژووردا، بە هەڤاڵ ئەسـەدم وت ئەوە دەرفەتی چاکەو قسـەی خۆتـان بکەن، هەڤاڵ ئەسەد وتـی مـن ڕێگەپێدراو نـیم لەگەڵ ئەمریکیـدا دابنیشـم، کـابرای ئەمـریکیش دەیـوت مـن نـامەوێ لەگەڵ بەرپرسـی پەکەکە دابنیشـم، چونکە ئەوان لە لیسـتی تیـرۆر دان، ئیتـر مـن و کـاک هەڵـۆ لە نێـوان دوو ژووردا زیـاتر لە دوو کـاتژمێر لە هــاتوچۆی نێوانیانــدا بــووین، بە هەر دووکیــانم وت ئێســتە ئێــوە دیوارێکتـان لە نێـوانە بـۆچی یەکتـری نـابینن؟. ئەمـریکیەکە دەیـوت: ئەبێـت پـرس بە واشـنتۆن بـکەم، ئەسـەدیش دەیـوت: دەبێـت قەنـدیل ڕازیبێت، ئەم بێنەو بەردەیە زیاد لە چەند مانگێکی خایاند.

هەڤـاڵانی پەکەکە ئاگاداریـان کـردمەوە کە بڕیـاری ئـازادکردنی سـەربازەکانیان داوە، هەندێ لە برادەرانی یەکێتی پێیان دادەگرت لە دەڤەری سلێمانییەوە ڕادەستی تورکەکان بکرێنەوە، منیش پێم وتـن: بەڕێزان جەنابی مـام جەلال هەمـوو ڕۆژێـک دەڵـێ پەکەکە لە سنوری ئێمەدا نییە، من چۆن دەتوانم لە سنووری زاخۆ - باکوورەوە بیانهێنم بۆ سلێمانی، ئایا بیرتان لەوە کردۆتەوە مام جەلال شتێکی تر دەڵێ؟.

هەموو لایەنەکانی گفتوگۆ لەسـەر ئەوە ڕێکەوتین لە گوندێکی سـەر سـنووری باشـوورو بـاکوور لە ژێـر چـاودێری خـاچی سـووری

نێودەوڵەتیدا بە ئاگاداری یەکێتی و پارتی بە پرۆتۆکۆل، نوێنەری پەکەکەو تورکیا واژۆی بکەن، ئینجا سەربازەکان ئازادبکرێن، ئەوە بوو لە سلێمانیەوە عوسمانی حاجی مەحمود، لە هەولێرەوە کەریم سنجاری لە مەراسیمەکەدا ئامادەبوون، پێش ئەمە کێشەیەکی تر ڕوویدا، دوو لە سەربازە دیلەکان کورد بوون، حەزیان دەکرد لە شاخ بمێننەوە، ئەوەشمان چارەسەر کرد.

دوای ئازادکردنی سەربازە تورکەکان، (مام جەلال) ناردی بە شوێنمدا بۆ بەغداد، وتی(بڕۆ بە موراد قەرەیلان بڵێ نامەیەک بنوسێ بۆ ئەردۆگان، چونکە لەم ماوەیەدا ئۆردۆگان بۆ پیرۆزبایی دێت بۆ لام، هەروەها نامەیەکیش بۆ ئۆباما بنوسێ، لە هەردوو نامەکەدا باسی ناگربەستی دوو لایەنە بکەن و ئامادەیی نیشانبدەن بۆ چارەسەری ئاشتیانەی مەسەلەی کورد لە تورکیادا.

چوومەوە بۆ شاخ هەڤالانم بینی، پێشنیارەکانی (مامم) پێوتن، شەوێک لە گوندێکی بناری قەندیل مامەوە، ڕۆژی دواتر نامەکانیان هەر بە خۆمدا نارد بۆ مام جەلال، نامەی ئەردۆگان بە تورکی و هی ئۆبامایش بە ئینگلیزی بوو، نامەکەی ئۆبامام دا بە کاک هەڵۆ، کۆپییەکی لەبەر هەڵگرتەوە بۆ ئەوانەی سلێمانی، منیش هەردوو نامەکەم گەیاندە دەستی مام جەلال، لە شوێنێکی تردا، باسی ئەو نامانەم بە درێژیکردووە.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، منیش لە بەڕێز (مام جەلال)ەوە نازناوی پیاوی ڕۆژی تەنگانەم وەرگرت، وەکو یادەوەری ماندووبوونی ئەو ڕۆژانە پێنووسێکی نایاب لە باڵیۆزی ئەمریکاو کاتژمێرێکی دەستی لە هەڤال جەماڵەوە پێشکەشم کرا، لای خۆم پاراستوومن.

## (٢٤)
# میکانیزمەکانی پرۆسەی ئاشتی
## زنجیرەی سێیەم

زەوینەی ئاگربەست و ڕێگەچارەی ئاشتییانەی پرسی کورد لە تورکیا، کەشوهەوایەکی سیاسییانەی باشی لای سەرانی ئاکپارتی و دەوڵەتی تورکیا هێنایەئاراوە، لای سەرۆکایەتی پەکەکەش هەلەکە بە باش زانرا بۆ پرۆسەی ئاشتی!..

چونکە(ئەردۆگان و عەبدوڵڵا گویل) لە گەڕی ڕیکلامی هەڵبژاردندا باسیان لەوە کردبوو، کورد لە تورکیا هەیەو کێشەی کورد کێشەیەکی سەرەکییەو ئێمە دەمانەوێ چارەسەریبکەین، ئەمەش بۆ ڕاکێشانی دەنگدەری کورد بوو، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ سەرکردایەتی پەکەکە کەوتبوونە پێوەندیکردن.

ڕۆژێک جەنابی(مام جەلال) بانگیکردم بۆ دەباشان، وتی (ئەردۆگان پێیوتووم: دەمانەوێ بزانین پەکەکە ئامادەیە بۆ ئاگربەست؟ دەیانەوێ بەگفتوگۆو ئاشتی چارەسەری ئەم کێشەیە بکرێت؟ دەمانەوێت کەسێک ببینین ڕاستگۆبێت و شارەزا بێت لەسیاسەتی پەکەکە، بۆ ئەوەی ڕاستییمان پێبڵێت، مام جەلال فەرمووی ناوی تۆم داوە کە بچیت بۆ ئەنقەرە. وتم: باشە، با پرسی هەڤالان بکەم.

چووم بۆ قەندیل هەڤالانم بینی وتیان: باشە بڕۆ بزانین دەڵێن چی؟ وەکو پرنسیپێکی دەسپێکی گفتوگۆ، هەڤالان وتیان(دەمانەوێ مافی کورد لە دەستووردا جێگیربکرێت، ئامادەین بۆ ئاگربەست و گفتوگۆی کراوەو ئاشکرا)، چوومە ئیستەنبوڵ، لە فڕۆکەخانە بەهرۆز گەلالی(نوێنەری یەکێتی) پێشوازیلێکردم و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ ئەنکەرە، لە فڕۆکەخانەی ئەنکەرە کەسێک بە ناوی (ئۆریەل) کە بە

عەرەبی قسەیدەکرد چاوەڕوانی دەکردین، بردمیان لە هۆتێلێک لە نزیکی کۆشکی کۆماری دایاننام، ڕۆژی دواتر ئۆریەل بردمی بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەواڵگریی (میت).

ئەوسا بەڕێز (ئەمرە تەنەر) کەسی یەکەمی دەزگای (میتی تورکی)بوو، تورکەکان خۆیان بە ساین موستەشار بانگیاندەکرد، جگە لەخۆی دوو کەسی دیکە لە ژوورەکەدا دانیشتبوون، ساین موستەشار ئەوانی بە من ناساند، پیاوەکە بەڕێوەبەری گشتی هەواڵگری سەربازیی (مدیری عامی ئیستخباراتی عسکەری)و ژنەکە بەڕێوەبەری گشتی هەواڵگریی ناوخۆ (ئەمنی داخلی) بوون، مستەشار تەنەر وتی ئێمە سێ دەزگای هەواڵگریمان هەیە: دەرەوە، ناوەوە، سەربازی.

ئێستە لە ڕێگای کامێراو ڤیدیۆوە، بەڕێزان سەرکۆمارو سەرۆەزیران و هەندێک لە ئەندامانی (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) دەمانبینن و قسەکانمان دەبیستن، لەوانەیە پرسیاریشمان لێبکەن، تۆیش ئازادی لە وەڵامدانەوەدا!!!.

**ئێستە دەمانەوێ بزانین پەکەکە چی دەوێت ؟**

وتم (بەڕێز موراد قەرەیلان و سەرکردایەتی پەکەکە سڵاویان هەیە بۆ سەرکۆمارو سەرۆەزیران، چونکە لەدوای مستەفا کەمالەوە، یەکەم بەرپرسی باڵای دەوڵەتن، بڵێن کورد هەیەو کێشەیەکی نەتەوەیی هەیەو دەمانەوێ چارەسەریبکەین، ئەوان هیوادارن بەڵێنەکانی ئەم دوو بەڕێزە وەکو بەڵێنەکانی مستەفا کەمال نەبێت، هەڤاڵانی پەکەکە دەڵێن: ئامادەین ئاگربەست ڕابگەیەنین و ئەم کێشەیە بەچاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان، بەدیالۆگ چارەسەربکەین، بەڵام کلیلی چارەسەر لای بەڕێز ئۆچەلانە.

پێشنیارمکرد لیژنەیەک یان گروپێک لە شارەزایان و پسپۆڕانی سیاسی و یاسایی لە کورد و تورک پێکبهێرێت بۆ دانانی میکانیزم و وردەکاری ئەم پرۆسەیە، ئەم کۆبوونەوەیەمان نزیکەی کاتژمێرێکی

خایاند، دوای پشوودانێک بۆ قاوە خواردنەوە، کۆبوونەوە دەستیپێکردەوە، بەهۆی ئەو جیهاز(بیستۆک)ەی لە گوێی جەنابی موستەشاردا بوو چەند پرسیارێکیان لێکردم.

لێیان پرسیم، تۆ لەو باوەڕەدای پەکەکە بەڕاستی دەیەوێت ئاگربەست بکات و هەنگاوی یەکجارەکی بۆ وەستاندنی شەڕ بنێن؟

وتم: بەڵێ.

**پرسیار: تۆ باوەڕی تەواوت هەیە قەندیل گوێڕایەڵی ئۆجەلانن؟**

وتم: بەڵێ لە سەدا سەد.

**پرسیار: دەکرێت پێمان بڵێی پەکەکە ئەو پارانە لە کوێدێنن؟**

وتم: ئەوە نهێنییە من ئاگاداری نیم، بەلام پێتاندەڵێم: پەکەکە سالانە ٢٠ ـ ٢٥ ملیون دولار لەریگەی کوردی تاراوگە کوددکاتە. بەو پارەیە دەتوانن چەک و ٣٠ -٤٠ هەزار گەریلا بەڕێوەدەبەن، وتم: بەڕێز موستەشار ئەم پرسیارانە هەڵگرن بۆ ئەو کاتەی دەکەونە دیالۆگەوە.

وتم: حەزدەکەم بۆچوونێکی خۆمتان بۆ باسبکەم و ئەو بەڕێزانەش کە گوێیان لێمانە ئاگایان لە قسەکانم هەبێت، ساین موستەشار وتی فەرموو: وتم... ئەگەر ئێوە بتانەوێت ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە سیستەمێکی ئیسلامی مۆدێرن زیندووبکەنەوە، لەولایشەوە ئێران خەریکی سیستەمێکی ئیسلامی شیعە مەزهەبەوە، هەردوکتان پێویستتان بە کورد دەبێت، چونکە پێگەی ئابووری ئەم دوو هەوڵەی ئێوە بێنەوت و گازی کوردستان سەر ناگرێت، کورد لە (شەڕی چاڵدێران)ەوە دەرسیوەرگرتووە، کێشەی ئایین و مەزهەب بە پلە یەک نابینێت، چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی لای کورد مەبەستە، کێ کێشەی نەتەوەیی لە ڕەگەوە چارەسەربکات کورد سۆزو دەنگی خۆی بەو لایەنە دەدات، گوێم لە بیستۆکەکەی گوێی ساین موستەشار بوو، داوایان کرد ئەو بابەتە جارێکی تر دووبارە بکەمەوە، منیش بەوردەکارییەکی زیاترەوە دووبارەم کردەوە.

وتم فەرموون ئێوە چیتان دەوێت بە قەندیلی بڵێم؟ وتیان:

١) ڕاگەیاندنی ئاگربەست.

٢) گواستنەوەی هێزی گەریلاو چەکدار بۆ دەرەوەی سنووری توركیا.

٣) لێبووردنی گشتی بۆ هەموویان دەردەکەین، بێجگە لە (٦٠) ئەنـدامی پەکەکە نەبێـت، ئەوانەیـش لەمـاوەی (٥)سـاڵدا یـان بەر لێبـووردنێکی گشـتی دەکەون، یـان دەیـاننێرین بـۆ وڵاتێکی ئەورووپی بێجگە لەئەڵمانیا، یان بچنە باشووری کوردستان.

وتـم: بەڕێز موستەشـار ئەگەر پەکەکە ئەم داواکارییـانەی ئێوەیان جێبەجێکردو ئێوە هیچتـان نەکرد؟ پێکەنـی و وتـی: منیش دەچمە قەندیل و چەک هەڵدەگرم!

هەروەهـا وتـی: پێیانبڵێ ئەگەر ئەردۆگان ڕازیبێت، بە نیازم خۆم بچمە قەندیل و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەم.

گەڕامەوەو چومە قەندیل لە ئەشکەوتێکی خۆشکراوی هەڵکەوتوو لەقوتکەیەکی چیای قەندیلدا هەڤاڵ(موراد و سۆزدار ئاڤێستا)م بینـی، باسی سەفەرەکەم بەدرێژی بۆ گێڕانەوەو قسەکانی ئەوان و منییان بەلاوە پەسـندبوون، بەڵام گومانییـان لە قسـەکانی ئەوان هەبـوو، هاتمەوە بۆ هەولێر جەنابی (مام جەلال)م لەماڵی کاک کۆسرەت بینـی، دکتور خەسرەو گوڵمحەمەدیش ئامادەی دانیشتنەکەبوو.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بـۆ ئێوە، منیش لە پێناو کۆتـایی پێهێنانی شەڕو مافی نەتەوەکەمدا، سەرم بەماڵی دوژمنیشدا کرد.

# (٢٥)
# میکانیزمەکانی پرۆسەی ئاشتی
## زنجیرەی چوارەم

لە هەولێـــر بەڕێـــز (مـــام جەلال)م بینـــی، بە کـــورتی باســـی سەفەرەکەمم بۆ کرد، لە وەلامدا وتی: (بە قەندیل و بە تورکەکانیش بڵێ من ئامادەم نەک شەست کەس، بەڵکو شەش سەد کەسیش بن، لە قەلاچـوالان، لای خـۆم نیشـتەجێیان بـکەم، هەر یەکەیـان ١٥ بـۆ ٢٠ پاسەوانیان بۆ تەرخاندەکەم، ئیتر بۆچی بچن بۆ ئەوروپا، ئەگەر ئەم مەسـەلەیە بەمە چارەسـەردەبێت، مـن ئامـادەم هەمـوو هاوکارییەکیـان بکەم، ئەمە قسەی مام جەلال بوو بۆ مێژوو با هەموو کەس بیزانێت، چونکە (ئەمرە تەنەر) لە دیداری یەکەمجاردا وتی: بۆ ئەم مەسـەلەیە قســـەم لەگەڵ بەڕێزان(بـــارزانی و تاڵەبانی)یـــدا کـــردووەو خۆیشـــم هـــاتوومەتە باشـــوورو زۆر لە ســـەرکردەکانی کـــوردم بینیـــووەو ڕای ئەوانیشم وەرگرتووە.

لەو سەروبەندەدا ئاگربەست ڕاگەیاندراو پۆلێک گەریلا بە چەک و تفاقی شەڕو قیافەتی گەریلاییەوە بۆ نیشـاندانی نیازپاکی و گەیاندنی پەیامی ئاشتی، تا بۆ هەموو دنیای بسەلمێنن پەکەکەو قەندیل ئامادەی دیـالۆگ و بەئاشـتی چارەسـەرکردنی پرسـی کـوردن، لە باشـوورەوە دەربازی تورکیا بوون.

کاتێـک ئەو شـەڕەوانانە گەیشـتنە سـلۆپی نـزیکەی یەک ملیـۆن کوردسـتانیی لە پێشـوازییاندا بـوون، لەو کاتـانەدا بـوو لە ئۆسـلۆی پێتەختـی نەرویـج دانوسـتاندن لە نێـوان پەکەکەو تورکیـا بە نهێنـی دەستپێکرد.

له قەندیلیشـەوە یەکێک لە سـەرکردەکانی پەکەکە بە هەلیکـۆپتەر، زۆر بەنهێنـی گەیاندرایە ئۆسـلۆو چەنـد دیدارێکیان لەگەڵ نـوێنەرانی دەوڵەتی تورک پێکهێناو (ساین مستەشار) یش بەشداری تێداکردبوو، ئەم نهێنیە لەلایەن کەسێکی سەر بە(فەتحوڵلا گیولەن)ەوە ئاشکرا کرا، ئەمە کێشەیەکی گەورەی ناوخۆیی بۆ ئاکپارتی دروستکردو ماوەیەک پرۆسەی ئاشتیی سستی تێکەوت.

ئۆریەل (کابرای وەرگێڕ) بە تەلەفۆن پێیوتم: (سـاین موستەشـار) چاوەڕێی وەڵامـی قەندیلە، تکـایە سـەردانمان بکەرەوە، پاش ئەوەی هەڤـاڵانی قەنـدیلم ئاگـادارکردەوە، چـوومەوە بـۆ ئەنـقەرە، لە فـڕۆکە خـانە.(ئۆریەل) چاوەڕییـدەکردم بردمــی بـۆ هوتێلێـک لە شـەقامی ئیسـتقلال نزیـک کۆشـکی (چـان قـایە)، ڕۆژی دواتـر بردمیـانەوە لای جەنابی موستەشار، ئەم جارەیان کەسێک لە تەنیشتەوە دانیشتبوو بە منیـان ناسـاند، (یاریـدەدەر)ی سـاین موستەشـار (ئەمـرە تەنەر)بـوو، پرسـیاریان لەبـارەی وەڵامـی قەنـدیلەوە کـرد، وتـم: قەندیل ئامـادەی دیـالۆگ و بەرەوپێشـچوونی پرۆسـەی ئاشـتییە، بەڵام لەسـەرئەوە سـوورن ئەم پرۆسـەیە دەبێـت لە ئیمـرالییەوە دەسـتپێبکات، بەڕێـز (ئۆچەلان) کلیلی چارەسەری پرۆسەکەیە.

بە سـاین موستەشـارم وت: ئەوە ئـۆچەلان لای خۆتـانەو لێتـانەوە نزیکە، بۆ ئاسانکاری ناکەن و لەوێوە دەستپێناکەن؟

مستەشـار وتـی: (ڕاسـتە، بەڵام ئـۆچەلان سـەرباز حوکمیـداوە، دامەزراوەی سـەربازیی هێشـتا زۆر بە هێـزەو دەترسـین کودەتامـان بەسەردا بکەن، وتی بەڕێز پێنجوێنی ڕۆژی سـەربەخۆیی تورکیات بە چاوی خـۆت لە ئـوتێلەکەوە بینـی، هەر ئەو ڕۆژە بەهەزاران ژەنەڕاڵ چونەتە سەر گۆڕی ئەتاتورک و سوێندی (موقەدەس)یان خواردووە، ئەوان سەربازی ئەتـاتورکن و فەلسـەفەو بیروبـاوەڕی ئەو دەپـارێزن. لەبەرئەوە بەقەندیل بڵێ: دەرفەتێکمان پێویستە، من خانەنشـین کـراوم، بەڵام بە فەرمانی بەڕێز ئەردوگان شەش مانگیان بۆ درێژکردومەتەوە

بـۆ ئەوەی هەوڵبـدەین چارەسـەرێک بـۆ کێشـەی کـوردو پەکەکە بـدۆزینەوە، پێیـانبڵێ: نامەوێـت هەڵەبجەیەکـی تـر دووبـارە ببێـتەوە، ئەگەر ئەم کێشەیە ئێستا چارەسەر نەکرێت، کورد تووشـی زیـانێکی گەورە دەبێت، ساین مستەشـار ڕاسـتیکرد، لەو هەلەی بۆیـان ڕەخسـا ئەردۆگـان تـوانی سـوپا لە ڕێکخـراوی (ئەرگەنەکـۆن) پاکبکـاتەوە، گلادوێ هەموو ژەنراڵە نەیارەکانی خۆی لە سوپا خانەنشین کرد و لە کاروبـاری سـەربازی دووری خسـتنەوە.هێزی پـۆلیس کە سـەر بە گوڵنیەکان بوو، ئەوانیشی تێکوپێکداو داودەزگای پەروەردەو دادگای لە هەر نەیارێکی سیاسی خۆی پاککردەوە، یان لە کار دەریکردن، یا خانەنشینیکردن، بەم جـۆرە پێگەی خـۆی لە هەمـوو دامەزراوەیەکـی دەوڵەتیدا بەهێزکرد.

بەڕێز(مـام جەلال) بـانگیکردم بـۆ بەغـداد پرسـی بـۆچی پرۆسـەکە وەسـتاوەو بەسسـتی دەڕوات؟ وتـم: لەبەرئەوەی قەنـدیل سـوورە لەسـەر ئەوەی دیـالۆگ لەڕێگە(ئـۆچەلان)ەوە بێـت، (سـاین موستەشـار)یش دەڵـێ: لە ترسـی ژەنـراڵە کەمالیسـتەکان نـاوێرین ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ ئـۆچەلان گفتوگـۆبکەین و ترسـمان لێنیشـتووە کودەتامـان بە سـەردابکەن، مـام جەلال وتـی: ئێسـتە بگەڕێـوە بـۆ میوانخانەو پشووبدەو سبەی یەکتر دەبینینەوە.

ئەوشـەوە تـا بەیـانی مـن تلمـداو خەوم نەبـوو، بیـرم لەوە دەکردەوە(مـام) چۆن ئەم گرێکوێرەیە دەکاتەوە؟ ڕۆژی دواتـر (مـام جەلال)م بینییەوە، وتی برۆ بۆ لای کاک (نێچیرڤان بـارزانی)، چونکە بـاوەڕم بە ئەردوگـان نەمـاوە، بەڵێنـی زۆر شـتی پێـداوم، هیچـی جێبەجێنەکـردووە، وتـم تـا ئێسـتە هـیچ ئاشـنایەتیم لە گەڵیـدا نیـیەو ڕووبەڕوو نەمـدیوە، ژمـارە تەلەفـۆنێکی پێـدام و وتـی لەگەڵ ئەو تەلەفۆنە قسـەبکە! هەر لە بەغـدادەوە تەلەفـۆنم کـرد، بەڕێـز (کەریـم شەنگالی) وەلامیدامەوە، وتی: ڕۆژی .... کاتژمێر.... وەرە بۆ وەزارەت

و دیداری ڕێزدار (نێچیرڤان بارزانی) ڕێکخست و وردەکارییەکانم بۆ باسکرد، چوونی ئەنقەرەو قەندیلم بۆ گێڕایەوە، زۆر ڕێزی لێگرتم و وتی: (ئەمە کارێکی مێژووییە دەستتان پێکردووە، منیش هەوڵدەدەم تەواوی بکەم)، بۆ مێژوو دەیڵێم بە هەوڵی ڕێزدار (نێچیرڤان بارزانی) بوو، پرۆسەی ئاشتی لە ڕێگەی(ئیمرالی)یەوە دەستپێکرد، ئیتر ڕێگە بۆ شاندی هەدەپ (سەلاحەدین دەمیرتاش، پەروین بوڵدان و ئیدریس بالۆکان) کرایەوەو کەوتنە جوڵەی مەکوکی لە نێوان ئەنقەرەو ئیمرالی، باشوورو قەندیلدا، بەڕێز ئۆچەلانیش بە گەرمی پێشوازی لە پرۆسەکە کردو گرنگییەکی زۆری پێدا. ئەو بوو بە(مخاتبی) فەرمیی پرۆسەکە، هەر لەو سەروبەندەدا دیدارێکی (پارتی - پەکەکە) ڕێکخرا، شاندی پارتی لە بەڕێزانە(نێچیرڤان بارزانی، مەسرور بارزانی و ئازاد بەرواری) پێکهاتبوون، شاندی پەکەکە لە(موراد قەرەیلان، سەبری ئۆک، دەنیز) پێکهاتبوون، بەندەیش وەک چاودێر بەشداربووم، ئەم کۆبونەوەیە گوڕێکی تری بە پرۆسەی ئاشتیداو هیوایەکیشیدا بە هەردوولا بۆ چارەسەری کێشەی کورد لە تورکیاو باکوری کوردستان .

چەند مانگێک دوای ئەم کۆبوونەوەیە (ئاژانسی فورات نیوز) دیدارێکی لەگەڵ مندا ڕێکخست، تێیدا وتبووم: (ئەمرە تەنەر دەڵێت: ئەگەر دەوڵەت بەڵێنەکانی بەجێنەهێنا، دەچمە چیاو چەک هەڵدەگرم). پاش دوو ساڵ ئەم ساین موستەشار(ئەمرە تەنەر)یان بۆ لێپێچینەوە بانگکردە پەرلەمان و بە ناپاکی تۆمەتباریان کرد، لەوەلامی ئەو لێپێچینەوەو تۆمەتبارکردنەدا وتبووی: (هەر لەسەر قسەی خۆم سوورم، کێشەی کورد بەچەک چارەسەرناکرێت، ئەگەر سەد ساڵی تر شەڕ بکەین، هەردەبێت بە دیالۆگ و ئاشتی چارەسەری بکەین).

من لێرەدا باسی ئەوە ناکەم چۆن پرۆسەکە تێکچوو؟ کێ تاوانبارە؟ هەر ئەوەندە دەڵێم ئاکەپە لە بەڵێنەکانی پەشیمانبووەوە، لە

ڕاگەیانــدراوی (دۆڵــمە بــاغچەلی) پەشــیمانبووەوە، کە نــوێنەری ئەردۆگــان و نــوێنەری هەدەپە لە تەلەفزیــۆنی فەرمیــی حکومەتــدا خوێنــدیانەوە، دواجــار کە مستەشــارم بینــی پــاش تەواوبــوونی دیدارەکەمان لەگەڵ وەرگێڕەکە(ئۆریەل) چووینە ژوورێکی بچکۆلانەی هێلکەیــی، مستەشــار ڕوی تێکــردم و وتــی: (بەڕێــز پێنجــوێنی حەز دەکەین لەهاتووچۆتدا بۆ ئەوروپا جارجار سەرمان لێبدە، وەرگێڕ لە خزمەتتــدایە، ئەگەر بتەوێــت پاســپۆرتی (ســووری دیپلۆماســی)یت دەدەینێ، کەبێ ڤیزا هەموو جیهان دەگەڕێیت و جێگەو ڕێگەی نایابت بــۆ ئامــادەدەکەین و هەر پێویســتییەکی تــرت هەبــوو بــۆت جێبەجێدەکەین)، منیش وتم بەسەرچاو، با پرس بە(مام جەلال و موراد قەرەیلان) بکەم، ئینجا سەرێکی باداو دەستیکرد بە پێکەنین.

لە گەڕانەوەمدا بۆ فڕۆکەخانە، بە کوردی لە وەرگێڕەکەم پرسی: ئەوە ساین موستەشار چیوت؟، بۆت نەکردمەوە عەرەبی؟ وتی: موستشار وتویەتی قسەکانی(کالسیف القاطع) واتە قسەکانی وەکو شمشێر ئەبڕێت و ڕاستن، من وەرگێڕەکەم ناسییەوە، تورکمانی کەرکوک بوو، پێموت: تۆ کوڕی فلانی ناویشت ئۆریەل نییە، باوکیشت لە کەرکوک دەرمانخانەی هەبوو، کوردیش باش دەزانیت. ئەم بابەتە وردەکاری و نهێنی زۆری هەیە، لەکاتی خۆیدا ئەوانیش دەخەینە بەرچاوی خوێنەران.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە ئێمەش بە سەربەرزی گەڕاینەوە بۆ قەندیل.

گلادیــۆ: ئەو ڕێکخــراوەیە کە ســی ئــای ئەی لەنــاو دامەزراوە سەربازییەکانی ئەندامانی ناتۆدا دروستیدەکرد.

# (٢٦)
# شەڕی (یەکێتی و پەکەکە)و
# چوار پارێزگار + یەك بۆ سلێمانی

ساڵی ٢٠٠١، ئەو کاتەی لە ئەڵمانیا بووم، سەرقاڵی چالاکیی سڤیل، سیاسی، دیپلۆماسی و ڕووناکبیری بووم. بەڕێز (ئۆچەلان) لەو بوارانەدا هەموو دەسەڵاتێکی دابوومێ، لێرەدا چەند نموونەیەک بۆ ئێوە دەگێرمەوە: سەردانیمان بۆ لای سەرۆکی نەتەوە یەگرتوەکان، پاپای ڤاتیکان، پەرلەمانی ئەورووپاو سەرۆکایەتی کۆنسەی ئەورووپا، ... هتد.

ژمارە تەلەفۆنی تایبەتی بەڕێز (ئۆچەلان)م لابوو، زۆرجار بە تەلەفۆن پرسوڕام پێدەکرد، بەندەو دکتۆر (عیسمەت شەریف وانلی) هاوسەرۆکی ئینستتیوتی بەرلین بووین، هەر مانگەی لە وڵاتێکی ئەورووپیدا چالاکیی دیپلۆماسی و ڕووناکبیرمان دەنواند، چالاکییەکانمان بە ناوی (ئینستتیوتی کوردی)یەوە ئەنجامدەدا، لەو کاتانەدا بوو شەڕی (یەکێتی و پەکەکە) هەڵگیرسا، ئەو شەڕە بڕیارێکی زۆر نێگەتیڤ بوو لە ناو جوڵانەوەی شۆڕشگێڕیی و بزاڤی چەپی کوردستاندا، بالانسی ڕەوتە نەتەوەییەکەی لاسەنگکردو کەلەبەرێکی گەورەی کردە ویژدانی نەتەوەیی هەر چوار پارچەی کوردستان.

بە ئاشکراو بە نهێنی دوو دەوڵەتی داگیرکەری (ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای) کوردستان دەستی باڵایان لە هەڵگیرساندن و درێژەدانی شەڕەکەدا هەبوو.

هەرچەندە هەر لایەک بیانوی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ بەرپابوونی شەڕەکە، بەڵام لە گشت ڕوویەکەوە بڕیارێکی نەخوازراو بوو.

زۆر جـاران له (سـلێمانی)یەوە دۆسـت و بـرادەر تەلەفۆنیـان بـۆ دەکـردم و لۆمەیانـدەکردین، کە بـۆچی هەوڵ بـۆ ڕاگرتنـی شـەڕەکە نـادەین؟ بـرایەکم بە تەلەفـۆن پێیـوتم: هەر مزگەوتێکـی سـلێمانی پرسەیەکی تێدایە، خەڵک زۆر لێتان بێزارە، تۆیش ئەوەندە لە Med ) TV(دەرمەکەوە!!!

ئەو کاتە دکتۆر (کەمال فوئاد) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە بەرلـین دەژیـاو زوو زوو یەکتریمـان دەبینـی، تەلەفۆنمـان بـۆ یەکتردەکردو ڕەوشـی شـەڕمان شـرۆڤە دەکرد، ڕۆژێک داواملێکرد یەکتری ببینین و چووینە کافتریای (Adnawar plats)، لیمپرسی ئەم شـەڕە بـۆچی؟ چ سـوودیک بە کـورد دەکەیەنـی؟ وتم:(پرۆسـەی سیاسی لە باشووری کوردستاندا بەرەو ئاڵۆزی و لەناوچوون دەبات، ئایا دەزانی سەدام لە قەرەهەنجیر هێزێکی گەورەی کۆکردۆتەوەو بە نیـازی هێرشـی سـەر (سـلێمانی)یەو پارێزگـارێکی کـوردی بە نـاوی (فـایەقە سـوور)ەوە بـۆ داناوە؟،(پـارتی)ش هێزێکـی لە (دێـگەڵە)وە کۆکردۆتەوەو پارێزگـارێکی بە نـاوی (فـایەقە ڕەش)ەوە بـۆ دانـاوە؟، ئیسلامییەکانیش لە (هەڵەبجەو سەیدسادق) دەسـەڵاتیان گرتۆتەدەست و بەتەمـان (مەلا فـایەقی مـۆتێ) بـکەن بەپارێزگـاری سـلێمانی؟. (پەکەکە)یش چیای کورتەک و سەنگەسەری بە شـەڕگرتووەو بەرەو (ڕانیە) پێشڕەویدەکەن؟ کاک کەمال پێمناڵێی ئێوە خەریکی چین؟ تەنیا (سـلێمانی)تان بە دەسـتەوە مـاوە. بۆیشـم گێـڕایەوە کە (عوسـمان ئۆچەلان) تەلەفـۆنی بـۆ کـردووم و پێیوتـووم: خـۆم ئامـادەبکەم بـۆ قایمقام(جێنشین)ی ڕانیە یان سلێمانی، منیش پێموتووە:(هەڤاڵ فەرهاد بە دوای فایەق ناوێکدا بگەڕێن، با ببن بە چوار)!

کـاک (کەمـال) بە هێواشـی قـومێکی لە قاوەکەیـداو بە زەردەخەنەیەکی نەرمەوە وتـی:(وەرە ئەمـانەم بـۆ بـکە بە نـامەیەک، بەیانی مەکتەبی سیاسی کۆبوونەوەیان هەیە، نامەکە بە فاکس دەنێرم بۆ مام جەلال).

ئەو کـاتە مـن کـۆمپیتەرم نەبـوو، چـووم بـۆ لای (موحسـین عوسمان)ی دراوسێمان نامەکەی بۆ تایپکردم، ناوەڕۆکی نامەکە زۆر بە کورتی: (جەنـابی مـام جەلال ئەگەر ئێوە هەتـا ١٠ -١٥ ڕۆژی تـر ئەم شـەڕە ڕانەگـرن، ئەوا فـایەقە ڕەش یـا فـایەقە سـوور یـان مەلا فایەقی مۆتی یا ئەو فایەقەی تر کە هەتا ئێستا دیار نییە کێیە، دەبێتە پارێزگـاری سـلێمانی)، باسـی هەمـوو ئەو هەڕەشـەو نەهامەتییـانەم کردبـوو لە ئەگەری شـەڕ ڕانەگرتنـدا بەرۆکـی کـورد دەگـرن، نـاوو واژۆی خـۆم لەسـەر نـامەکە دانابوو، ڕەنگە ئەو نـامەیە لە ئەرشـیفی مەکتەبـی سیاسـی یـان لە ئەرشـیفی (مـام جەلال)دا مابێت، ڕۆژێـک (سەلاح ڕەشید) تەلەفونی بۆ کردم و وتـی: ئەوە برادەرێک دەیەوێت قسـەت لە تەکدابکات، جەنـابی (مـام جەلال)بـوو بە زمـان شـیرینیی و قسـە خۆشـەکانی وتی:(ها پێنجوێنی لەگەڵ سـەرمای ئەڵمانیا چۆنی؟ پـاش چـاک و چـۆنی، وتـی: نـامەکەی تۆمـان لە مەکتەبـی سیاسـی خوێنـدەوەو هەڵسـەنگاندنی باشـمان بـۆ کـردو بڕیارمانـدا شـەڕ بوەسـتێنین، دە تۆیش (کـوڕی تەنگـانە) لای خـۆتەوە خەریکبە)، هەر ئەو شەوە تەلەفۆنم کرد بۆ قەندیل، عوسمان ئۆچەلان هاتەسەر خەت و پێمـوت: (مـام جەلال) ئامـادەی ئاگربەسـتە، بە لـووت بەرزی و بەدەنگێکی بەرز وتی:(شەڕ ڕاناگرین تۆیش خۆت ئامادەبکە، تـاتۆڵەی شەهیدەکانی قەرەداخ نەسێنین وازناهێنین).

من زۆر گاڵتەم بەو قسـەیەی هـات و بەزەییم بە خـۆم و کورددا هاتەوە، کە چۆن ئەمانە بە جۆش و خرۆشەوە یەکتری دەکوژن؟ ئایا ئەوانە دەتوانن کورد بە ئامانجەکانی بگەیەنن؟!

دوای چەند ڕۆژێک (مـام جەلال) تەلەفۆنی کردەوە، من قسـەکانی (عوسـمان ئـۆچەلان)م پێـنەوت، هەر دەمـووت خەریکـم لەم ڕۆژانەدا ئاگربەسـت ڕادەگەیەنرێـت، جـارێکیتر تەلەفـۆنم کـردەوە بـۆ قەنـدیل، ئەمجارەیـان هەڤـال جەمـال(موراد قەرەیەلان) هاتەسـەر خەت، بە درێژی باسـی تەلەفۆنەکانی (مـام جەلال)م بـۆ کـرد، هەڤـال (جەمـال)

وتی: برۆ بۆ برۆکسل باکۆنگرەی نەتەوەیی ڕاگەیاندراوێک دەربکات و داوای شەڕ ڕاگرتن لە (پەکەکەو یەکێتی) بکات، ئێمەش ئاگربەست ڕادەگەیەنین.

هەر وامانکرد وابزانم (١٢/١١ یان ١٢/١٢) بوو پەکەکە لەڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە ئاگربەستیان ڕاگەیاند، لە ڕاگەیاندراوی ئاگربەستەکەوە ئاماژەیاندابوو لەسەر بانگەوازی کۆنگرەی نەتەوەیی و هەوڵی کەسانی خێرخوازو ئاشتیخواز بڕیارماندا لە هەموو بەرەکانی شەڕ ئاگربەست ڕابگەیەنین.

یەکێتی دەنگی نەبوو، تەلەفۆنم بۆ (مام جەلال) کرد، وتی:(ئێمە لەبەر پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانمان ناتوانین لە میدیاکانەوە ئاگربەست ڕابگەیەنین!!!! بەلام ئەو بروسکانەی بۆ هێزەکانمان ناردووەو داوای ئاگربەستمکردوە بۆ فاکس بۆت دەنێرم). منیش فاکسەکانم نارد بۆ جێی خۆی و ئەوانیش گەیاندیانە قەندیل، من پرسیارێکم لە خۆمکرد: ئایا گیانی ئەو هەموو گەریلاو پێشمەرگە نەبەردانە لە ئەستۆی کێدایە؟

جارێکیان لە دوکانێکی سەر جادەوە تەلەفۆنم کرد بۆ قەندیل، قسەکانم لەسەر شەڕ وەستاندن لەگەڵ هەڤاڵ(جەمال) درێژەی کێشا، کە تەلەفۆنەکەم داخستەوە بایی ٣٥٠ مارک بوو، ئەو پارەیەی پێمبوو، تەواوی نەدەکرد، ناچاربووم کاتژمێرەکەم لە جێیدانا، بەو مەرجەی هەموو پارەکەیم بۆ برد، کاتژمێرەکەم بداتەوە، کاتژمێرەکە ئاڵتون بوو، نرخێکی پڕ مانای هەبوو لای من، چونکە هی دایکی منداڵەکانم بوو، لە خەلاتی یەکەمی کۆلیژی ئەدەبیاتدا وەریگرتبوو هەتا هاتمەوە بۆ دوکانەکە، کارمەندەکە ڕۆیشتبوو و یەکێکیتر لە جێگەی بوو، هەر وەلامیشی نەدامەوە.

چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز بۆ ئێوە، ئێمەش توانیمان کۆتایی بە خوێنڕشتنی نێوان کوردان بهێنین و داخی لە دەستچوونی مانای سیمبۆلی کاتژمێرێک لە دڵمدا چەقی.

# (٢٧)
## پرۆژە مێژووییە نێودەوڵەتیەکەی (مام جەلال) بۆ ئاشتی و ئازادکردنی ئۆچەلان!

چەند جارێک لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆنەوە یان لە نووسینەکانمدا، کەم تا زۆر باسی ئەو پرۆژە گرنگەی (مام جەلال)م کردووە.

پرۆژەکە بریتی بوو لە ڕێکخستنی کۆنفرانسێک لەسەر ئاستی سەرۆک دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و جیهان بۆ ئاشتی لە تورکیاو ناوچەکەدا.

پوختەی چیرۆکەکە وەکو خۆی دەخەمە بەردیدەی ئێوەی ئازیز:

ڕۆژی ١٢/١٥ لە سکرتاریەتی (مام جەلال)ەوە لەبەغدا ئاگاداریانکردم ڕۆژی ١٢/١٦ لای (مام جەلال) ئامادەبم، هەر بەو جۆرە ڕۆژی ١٢/١٦ چوومە بەغداو ئەو شەوە لە میوانخانە تایبەتییەکەی نزیکی ژووری نووستنەکەی پشوومدا.

ڕۆژی ١٢/١٧ کەمێک زووتر لە دیدارەکانی جاران، یەکێک لە کوڕەکانی لای (مام جەلال)، بە ئاگایهێنام، ئەگەر هەڵەنەبم وابزانم (بارزانی قادری پشکۆ) بوو.

وتی: نیوکاتژمێری تر (مام جەلال) دەتبینی، بە پەلەپەل بەرچاییەکم کردو چوومە دیداری بەڕێزیان، ئەمجارەیان جیا لەجارەکانیتر بینیم (لە ژوورێکی بچکۆلەدا دانیشتبوو، بیجامەیەکی ڕەنگشینی ژاکاوی لەپێدابوو، سەروڕیشی نەتاشیبوو، ڕووی گرژو نارەحەت دیاربوو، مێزێکی جوانی خنجیلەی لە بەردەمدا بوو، لەسەر مێزەکەی کۆمەڵێ کاغەزو دۆسیە هەبوون، لیستێکی ئامادەکراو بە ناوو ژمارە تەلەفۆنەوە لەبەردەمیدا هەبوو، وتی: (بۆیە زوو ناردومە

بەشوێنتدا هەتا کارەکانمان تەواوبکەین و تۆ بگەڕێیتەوە بۆ شارە حەیاتەکە، چونکە ئەمڕۆ لە سەعات ١٢ تا ١٠ی شەو، هەموو کاتم گیراوەو یەک لە دوای یەک میوانم هەیە، سەعات ٦ نووری مالیکی (سەرۆک وەزیران) دێت بۆ لام، ئەو توورەو منیش بێتاقەت خوا چاکیبکات.

من هەرگیز پرسیارم لێنەدەکرد، ئەو جارە پێم بە جەرگی خۆم داناو پرسیم خێرە؟

وتی: (لە هەرێمەوە نامەیەک بۆ مالیکی هاتووە، داوایان لێکردووە بە زووترین کات، هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی دیجلە پاشەکشێ پێبکات و کاربکات بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوورو گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕێندراوەکان بۆ سەر خاکی هەرێم.

دواتر وتی: بابێینەوە سەر کارەکانی خۆمان، دەمەوێ کۆنفراسێکی نێودەوڵەتی بۆ ئاشتی لەڕۆژهەلاتی ناوین لەبەغدا سازبکەم، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ (بانکی مۆن) سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لەو ماوەیەی پێشوودا لە بەغدا بوو، قسەمکردووەو خۆشحاڵبوو. بۆ هەمان مەبەست سەرۆکی فەرەنسا، جۆرج پاپاندریۆ سەرۆکی یۆنان، سەرۆکی یەکێتی ئەورووپا، پەرلەمانی ئەورووپاو لە ڕێگەی وەزیری دەرەکی ئەمریکا (کۆندالیزا ڕایس)، سەرۆکایەتی ئەمریکاشم ئاگاداركردووە، هەروەها تورکەکانیشم دواندوەو بەم هەوڵانەم دەزانن. هەر لەو بارەیەوە یاداشتێکم بە سەرۆکایەتی (سۆسیال دیموکرات ئینتەر ناسیۆناڵ) داوە، کە خۆیشم جێگری سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە جیهانییەم. لەو کاتەدا سۆسیال دیموکراتەکان لە زۆر دەوڵەتی ئەورووپیدایان دەسەلاتیان بە دەستەوە بوو، یان بەشداری دەسەلات بوون.

وتم بەڕێز ئەركی من چییە؟ وتی ئەمڕۆ ١٢/١٧ بگەڕێوە بۆ سلێمانی، منیش سەری ساڵ ١/١ دێمەوە بۆ ئەوێ، هەتا من دێمەوە تۆ ئەم كارانە بكە:

١) لە توركیا (ئەحمەد تورك، سەلاحەدین دەمیرتاش لەیلا زاناو ئافرەتێک لەخێزانی (ئۆچەلان) ئاگاداربكە ١/١ لە سلێمانی بن .

٢) لە(قەندیل)ەوە دوو كەس (فلان و فلان) بانگبكە، ئەم پرۆژەیان بۆ باسدەكەم، ئەگەر ڕازیبوون ئەوكاتە دەستبەكاردەبین .

٣) هەتا خۆم دێمەوە بۆ سلێمانی تۆ ناونیشان و ناوی ئەو كەسانەم بۆ وەرگرە كە خەڵاتی ئاشتی نۆبلیان وەرگرتوە لەجیهاندا.

وتیشی لیژنەیەكی ئامادەكاریی بۆ كونفرانسەكە بە سەرپەرشتی خۆی پێكهێناوەو منیشی كردووە بە سكرتێری لیژنەكە.

ئەمەش پرۆگرامی كۆنفراسەكە بوو :

١. گفتوگۆی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

٢. گفتوگۆی شەڕی كوردو دەوڵەتی توركیا.

٣. ئازادكردنی (ئۆچەلان) یان هێنانە دەرەوەی لە زیندان و جێگیركردنی لەجێیەكی تایبەتیدا، تا بتوانێت دەستكراوە بێت لەكاركردنیدا بۆ ئاشتی.

٤. هەوڵدان بۆ وەرگرتنی بڕیاری ئاگربەست لە توركیاو ناچاركردنی دەوڵەتی تورك بە دانوستاندن لەگەڵ پەكەكە.

(مام جەلال) ئەم پرۆسەیەی ناو نابوو پرۆسەی ماندێلا

پرۆسەی ماندێلا: ئەوەبوو لە بەندیخانە هێنایەنە دەرەوە، لە شوێنێكی تایبەتی جێگیریان كرد، لەوێوە كەوتە پەیوەندی لەگەڵ حزبەكەی و شۆڕشگێران، لە ئەنجامدا پرۆسەی ئاشتی لەباشوری ئەفریقا دروستبوو .

زۆر حەیف و مخابن سەعات ٧ ئێوارە، گوێم لە ڕادیۆی (بی بی سی)بوو، وتی سەرکۆماری عێراق (جەلال تاڵەبانی) جەڵدەی دەماغ لێیداو گەیەنرایە خەستەخانە، منیش بە نائومێدییەکی زۆرەوە چوومە لای هەڤالانی (قەندیل)و چیرۆکەکەم بۆ گێڕانەوە، زۆر قسەمان لە بارەی شەڕو ئاشتییەوە کرد، وتم: ئەم پرسی کوردە وەکو نەفرەتی فیرعەونەکان وایە، هەر کەس دەستی بۆ ببات دەمرێت، ئەوە (تۆرگۆت ئۆزال) ویستی چارەسەری کێشەی کورد بکات جەڵدە لێیدا، ئەوە ژەنەراڵ (ئەشرەف بەدلیسی) هەر ئەوەندەی وت کە کێشەی کورد بە چەک چارەسەرنابێت فرۆکەکەی لە ئاسمان گریگرت و سووتا، ئەوە بەڕێز (ئۆچەلان) ویستی دەولەتی کورد لە مەنفا دروستبکات، بە گەلەکۆمەکێی نێودەوڵەتی ڕادەستی تورک کراو لە گرتیگەدایە، ئەوە (مام جەلال) ویستی کۆنفرانسی ئاشتی بۆ پرسی کورد لە تورکیا پێکبهێنێت، جەڵدەی دەماغ لێدا و لەگۆکەوت !!!

ئەوە(مسعود بارزانی) تەنیا ویستی ڕیفراندۆم بکات بۆ باشووری کوردستان، لەسەدا پەنجای خاکی کوردستانیان بە هێزی چەک لێسەندینەوە.

چەپێک گوڵ و چەپێک نێرگز بۆ ئێوەی ئازیز.

مام جەلال و پرۆژەکەی چوونە ژێر گڵ، منیش زۆر گەشبینم بە سەرکەوتن.

# (٢٨)
# بەشداریمان لە یەکەم کۆنگرەی پاسۆك

من لەگەڵ برای بەڕێز (عەبدوڵڵا ئاگرین) دۆستایەتیمان بەهێزبوو، زیاتریش لە ڕێگەی کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبیەکاندا بوو، گەیشتبووە ڕادەیەک متمانەمـــان بە یەکتربـــوو، ئەو بە شـــیعرە نەتەوەیـــی و شۆڕشگێڕییەکانی من و بەو چالاکییە کولتووریی و ڕۆشنبیرییانەی لە چوارچێوەی کاری (بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی و جەماوەری) لە سلێمانی ئەنجامماندەداو دەچوونە خزمەت هزری نەتەوەیی و بردەدان بە سیاسـەتی کوردایەتی، سەرسـام بـوو، بـۆ نمـوونە: یـادکردنەوەی شـاعیرە گەورەکانی کـورد وەکو: قـانع، مـوفتی پێنجوێنی، بێکەس و گۆران...هتـد.خـۆ یـادکردنەوەی ٢٠٠ ســاڵەی بونیاتنـانی شـاری (سلێمانی) لەوکاتەداو ئەو هەمـوو سـیمنیارو وتـارانەی بۆ مـاوەی ٣ ڕۆژ بەردەوامبوو، هەموویشی باسی مێژوو و خەباتی کوردبوون و بە چـالاکیی نمـوونەیی دەخوێنـدرانەوە، ئەمـانە بە ئەرک و مانـدبوونی چەنـد ڕوونـاکبیرێکی لاوی ئەو سـەردەمە بـوو، وەکـو (ئـازاد عەبدولواحید، شـەهاب عوسـمان، شـەهید دڵشـاد مەریـوانی، سـەلاح مـحەمەد عوسـمان شـەیداو ئومێد ئاشـناو چەنـدانی دیـکە). لەگەڵ (عەبدوڵڵا ئاگرین) باسی سیاسەت و هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و کارو چـالاکیی شۆڕشـگێڕیی بکەیـن، ئەوەی لای مـن درکانـد کە ئەو پەیوەندی لەگەڵ شاخ هەیەو داوای هەندێ هاریکاری لەمنیش کرد، منیش ئەوەی پێمکرا دەستم نەگێڕاوە.ڕۆژێک وتـی: کۆبـوونەوەیەکم ڕێکخســتووە حەزئەکەم تـۆیش بەشـداریمان بکەیـت، چـوینە مـاڵی مامۆستا (ئەحمەد هەردی)، بەشداربووەکان بریتی بوون لە ( ئەحمەد هەردی، دکتۆر ئیحسان فوئاد، عەبدوڵڵا ئاگرین و بەندە)ە.

لەوێ هەمــوو پەســنی ئەو چــالاکیە کولتوورییــانەی ئێمەیانــدا، پێکهـاتین لەسـەر ئەوەی هەتـا پێماندەکرێت ئاڕاستەی ئەم چالاکییانە

بەرەو خزمەتــی بیــری کــوردپەروەری بەریــن، بە جۆرێــک ورەی رووخـاوی خەڵـک بەرزبکـاتەوەو لایەنە نیشـتمانپەروەرییەکەی بەرەو پێشەوەببەین و ئاگالێکبوون لە نێوانماندا هەبێت .

لە دوای راپەرین من ماڵم لە هەولێر بوو، (عەبدوڵلا ئاگرین)یش بووبـوو بە ئەنـدامی (بەرەی کوردســتانی یەکگرتــوو)، پێوەنــدی و دۆستایەتیمان هەر بەر دەوامبوو، لە رێگەی ئەوەوە ناسیاویم لەگەڵ (مولازم کەریم سـەلام)و هەندێ کەسایەتی تری (پاسۆک) پەیداکرد، رۆژێک (عەبدوڵلا ئاگرین) وتی: ئەمشـەو لەگەڵ هاوبیرەکانم میوانی تۆ دەبین، ئەوەش لەکاتی (قات و قری)یەکەدا بوو، ئاوو کارەباو نان و پـارە نەبـوو.منـیش لە لای خـومەوە (بەدران ئەحـمەد حەبیـب)، کە دۆستایەتی و برادەرایەیتمـان خۆشـبوو، ئاگادارکردەوە بێت بۆ مـاڵی ئـێمەو بەشـداریێ دانیشـتنەکەمان ببێـت، میوانەکـان بریتـی بـوون لە: (عەبدوڵلا ئاگرین، مولازم سـەید کەریـم و مژدە یان مـولازم شـوان) بــوو، مــن و بەدران لەگەڵیانــدا کەوتیــنە گفتوگــۆو شــرۆڤەکردنی سیاســەتی رۆژ. وتیــان: کۆنگرەمــان هەیەو حەزدەکەیــن ئێــوەش بەشداربین، خۆیان هەندێک ئامادەکاریان بۆ کۆنگرە کردبوو، ئێمەیش لە نەخشەی بەرێوەبردنی کۆنگرەکەدا هەندێ بۆچوون و پێشنیارمان خستە بەردەمیان، ئەوانیش بە دڵخۆشییەوە لێیان وەرگرتین .

لە ٧ ئەیلولی ١٩٩١دا لە (قەلاچوالان) کـۆنگرەی یەکەمـی پاسـۆک دەستپێکرد، کۆنگرە ٣ رۆژی خایاند، بە رێکوپێکی بەرێوەچوو، لەوێ هەنـدێ کەسـایەتی نەتەوەیـیم ناسـی وەکـو (ســەعەی گەوهەر)، مـن دەموچاوی خۆمم داپۆشی بوو، لەبەر هەندێ هـۆی تایبەت بە خـۆم، نەمدەویست هەموو ئەندامانی کۆنگرە بمناسن، لە کاتی پشوودا لەگەڵ بەدران دەچــووینە ژووری تــایبەتی، لە رۆژی دووەمــی کــۆنگرەدا مـولازم کەریـم و عەبدوڵلا ئاگرین وا بـزانم مژدەشـیان لەگەڵـدا بـوو، هـاتن بـۆ لامـان و داوایـانکرد کـاری رێکخسـتنیان لەگەڵـدا بکەیـن، بە منیان وت: تۆ ئەگەر بتەوێ دەتکەین بە ئەندامی سەرکردایەتی.

وتمان زۆر سوپاستان دەكەین، وەكو میوان هاتووین، دەمانەوێ وەكو میوان بگەڕێینەوە، بەڵام هەركارێكی ڕۆشنبیریتان هەبێت ئێمە ئامادەین، مولازم كەریم ڕوویكردە من وتی: ئاخر من لەوتارەكەمدا باسی تۆم كردووەو وتوومە (هاوبیرێكمان لە كاتی حوكمی دیكتاتۆردا لەناو شار، گەلێك كاری گرنگی بۆ كردووین، یارمەتی شۆڕشی داوە، دەمانەوێت بیكەینە ئەندامی سەركردایەتی) كەس نارازی نەبوو، مەبەستیشم تۆ بووە، هەموو دەنگیان بۆ داویت، منیش وتم زۆر سوپاستان دەكەم، یەكەم بۆ ئەوەی بانگهێشتتان كردووین بۆ كۆنگرەكەتان، دووەم بۆ ئەو متمانەیە كە كارتان لەگەڵدا بكەم، بەلام باودر بكە من تەمەنی حزبایەتیم نەماوە..(عەبدوللا ئاگرین) بو نوكتە هەموو جارێك دەیوت پێمانئەڵێن هەموویان بە یەك مەنجەڵ یاپراخ تێردەخۆن و لێیان دەمێنێتەوە، بەلام ئەوە ٣ رۆژە، رۆژی ٤ ئاژەڵ سەر دەبرین، بەشمان ناكات. منیش دەمووت خوا بەرەكەتی تێكات .ڕێگەیان بە من و ( بەدران)دا، لە كۆنگرەكەیاندا وتار پێشكەشبكەین، من وتم (پێویستە ئەم حزبە هەندێ گۆرانكاریی لە فەلسەفەو هزری خۆیدا بكات و سیاسەتی خۆی بەرەو كرانەوە ببات، بۆ ئەوەی لەم قاوغە تەسكەی ئێستەی دەربچێت و مەودای ڕێكخستنەكانی فراوانبكات. ناوەكەشی بگۆرێ بۆ پارتی دیموكراتی سەربەخۆی كوردستان یان پارتی سۆسیالیستی دیموكراتی كوردستان، وتم پێویستە بەرنامەو فەلسەفەی كوردایەتی ببێتە ئایدیالی حزب ئەوسا دەبێتە حزبێكی كاریگەر)، هەندێ پێیان ناخۆشبوو دەیانوت وشەی "دیموكراتی هی ماركسییەكانە. بەم شێوەیە كۆنگرە تەواوبوو، بۆ ئێمەش ئەزموونێكی نوێ بوو، سڵاو بۆ ئەوانەی لە ژیاندا ماون و لە هەر حزبێك و لە هەر جێگەیەكدا هەن، گیانی ئەوانەیش شادبێت كە ژیانی خۆیان لە پێناوی كوردستاندا بەخشی.

چەپێك گوڵ و چەپكێك نێرگز بۆ ئێوەی ئازیز، سۆزێكەو پێوەی پێبەندم، لە هەر شوێنێك بتوانم خزمەتی گەل و وڵات بكەم بە دڵسۆزییەوە دەیكەم.

# (٢٩)
# بۆچوونی جیاواز لە بارەی ناوی پێنجوێن

تا ئێستە زۆر نوسەرو مێژوونوسی کورد، بەتایبەتی هەندێ لاوی پێنجوێن، لەسەر ناوی پێنجوێن بابەتیان نوسیووەو ڕای خۆیان بڵاوکردۆتەوە. منیش چەند جارێک، بە شیعر یان لە میانی گفتوگۆدا لە تەلەفزیۆنەکانەوە لەم بوارەم دواوم.

١. لە ساڵی هەشتاکاندا لەگەڵ شێخ کاوەی شێخ لەتیف چووینە سەردانی شێخ عەبدونکەریم کەسنەزانی، دانیشتنەکە گەرم و تەردبالغ بوو، شێخ کە منی بینی کەوتە باسی پێنجوێن و ناوی پێنجوێن، وتی: شێخی گەورە، شێخ مەحمودی مەلیک بۆی گێڕاومەتەوە کە پادشایەک یان فەرمانڕەوایەک لە پێنجوێندا هەبووە، پێنج ژنی جوانی ناوازەی هەبووە، ئەوەندە جوان بوون، وەکو وێنەی ڕەنگاوڕەنگ وابوون، هەر لەوەوە ناونراوە (پێنج وێنە)، هەر بۆ زانیاری لەناوچەی شلێری پێنجوێن گوندی (وێنە، شێروێنە) هەیە، وادیارە ئەو کاتە (وێنە) بەکارهاتووە بۆ ئاماژەکردن لە دیمەنی جوان.

٢. مێژوونووسی گەورە(محەمەد ئەمین زەکی بەگ) پێیوایە لە خۆرهەڵات تا خۆرئاوا بوون ئەگەر کەسێک سەرنج لە سروشتی ئەو کاتانەی سێبەرو هەتاو بدات، پێنج وێنەی ڕەنگاوڕەنگ لە هەست و نەستی مرۆڤدا بەرجەستە دەبێت.

٣. لە کتێبەکەی (مەلا ئەحمەدی کادر)دا، لە زمانی مامۆستای گەورەو هێژاوە (عەبدولکەریمی مودەریس) دەڵێت: لە پێنج شوێنەوە هاتووە، واتە ئەو کاتە پێنج گوند یان پێنج نیشتەجێی بچووک لەو دەڤەرە هەبووە، وەکو (حەسەن ئاوا، قوڕەڕەشە، دێ کۆنی چوارباخ، قەڵادێ و پێنجوێن خۆی)، بەو هۆیەوە ناونراوە پێنجوێن یان پێنج شوێن ئەمەیان ڕێیتێدەچێت. حەزدەکەم لەسەرئەم بابەتە زانیاری

بدەم، لە ساڵی هەشتاکاندا لە بەغدا لە کۆڕی زانیاری لای (حەمەی مەلا کەریم ) دانیشتبووم، مامۆستا (جەمال بابان) هات لە منی پرسی: ئەریّ پێم ناڵێی ناوی پێنجوێن لە چیەوە هاتووە؟ منیش هەر پێنج بۆچوونەکەم بۆ باسکرد، وتی خۆت لەسەر کام لەم بۆچوونانەی؟ وتم زیاتر لەسەر پێنج شوێنەکە، مامۆستا جەمال بابان لە کتێبی(أسماء المدن والآثار والمكان القديمة في العراق) بەناوی منەوە بڵاویکردۆتەوەز

٤. بۆچوونێکی تریشم هەیەو دەڵێم لەوانەیە لە (پێنج یۆنانی)یەوە هاتبێت، هەندێ بەڵگەش لەم بوارەدا هەیەو دوای داگیرکردنی ئێران، ئەسکەندەری مەکدونی گەڕایەوە بۆ بابل. لەوانەیە ڕێگەی گەڕانەوەی لە دەڤەری (پێنجوێن)ەوە بووبێت، چونکە لە گوندی (کۆڵێتان)ەوە کە دەچیت بۆ گوندی (کانی سێف)، ڕێگەیەک هەیە هەتا ئێستاش پێیدەڵێن (ڕێگەی ئەسکەندەر)، ڕێگەیەکی پان و تەختە، گوایە ئەسکەندەر بە گالیسکەکەیەوە سەرکەوتووەتە چیای (سورێن)، تا لەوێوە سەرنجی شارەزور بدات و ڕێگەی گەڕانەوە بۆ شاری (بابل) هەڵبژێرێت، هەر لەسەر ئەو ڕێگەیە جووتیارێکی (کانی سێف)، پارچە ئاسنێک دەدۆزێتەوە، ئەو ئاسنە هێنرایە مۆزەخانەی ئەتنۆگرافی زانکۆی سلێمانی، دەرکەوت ئەوە مەدالیای ئەسکەندەر بوو، چونکە ڕەسمی ئەسکەندەری بەسەرەوە بوو، خۆم ئەو مەدالیایەم بینی بوو، لە ڕاپەڕین مۆزەخانەکە تالانکرا، مەدالیاکەش دزراو لە سوید فرۆشرا، هەروەها لە نزیک گوندی (میشیاوە)وە لوتکەیەکی بەرز هەیە پێدەڵێن (لوتکەی ئەسکەندەر) یان (پۆپەی ئەسکەندەر)، پرۆفیسۆر (جەمال ڕەشید) مێژوونوسی ناوداری کورد دەڵێت: (ئەسکەندەر لە شارەزوور تووشی نەخۆشی مەلاریا دەبێت، هەر بەو نەخۆشیە لە بابل دەمرێت و لاشەکەی لەناو کوپەیەکی گەورەی پڕ لە هەنگویندا، بۆ ئەوەی بۆن نەکات، دەبەنەوە بۆ مەکەدۆنیا، جگە لەمانە یەکێک لەفەرماندە هەرە ناودارەکانی بە ناوی

(کەڵۆس)بووە، گوندی (کەولۆس)مان هەیە لە ڕۆژئاوای پێنجوێن، هەروەها فەرماندەیەکی تری بە ناوی (مالیمۆس) ئێستە لەناوچەی شلێر بووە بە شەخس و پەرستگا!!! لە کتێبی (ئەنا باسیس) گەڕانەوەی دە هەزار سەربازی لەشکری ئەسکەندەر بۆ یۆنان، باسدەکات کە هەندێک لە سەرکردەکانی لەشکری ئەسکەندەر یاخیبوون، هەڵگەڕانەوەو ون بوون!!! کێ دەڵێت پێنج لەو فەرماندانە پێنجوێنیان ئاوەدان نەکردۆتەوە؟.

٥. (پێنجوین یان پێنج وێن) کەمینەیەکی جولەکە لە پێنجوێندا هەبوون، ماڵێکیان بەناوی (خواجا یوسف) دراوسێی ئێمە بوو، هەموو جارێک دەیوت: پێنجوین ئێمە ئاوەدانمانکردوتەوە، پێنج بنەماڵەی جولەکە بووین ئەم شارەمان دروستکردووە، نزیکەی ٣٠ –٤٠ ماڵ دەبوون، هەندێکیان لە ژێر فشاری ئیسلامدا بوون بە موسوڵمان.

ئێستەش دوو هۆزی گەورەمان لەپێنجوێن هەیە (مخە، بارام) مخە لە میخایلەوە هاتووە، چونکە مخە لە زمانی کوردیدا هیچ مانایەکی نییە، ئەوی تریش بارامە.

لە ئیسرائیل شوێنکی پیرۆز هەیە بەناوی (بارام) لەناو (موسایی)ەکاندا ناو بارام زۆرە، کوڕێکی (بارامی پێنجوێنی) چوو بوو بۆ ئیسرائیل، لەبەر ئەوەی پاشناوەکەی (بارامی) بوو، زۆر ڕێزیان گرتبوو، بردبوویان بۆ ئەو شوێنەی پێیدەڵێن (بارام)، (ئەلیاسە فرە) کە ئێستە بووەتە نەزرگەی ژنان و زیارەتی دەکەن، کێ دەڵێ یەکێک نەبووە لە(حاخام)ەکانی جووەکان؟ چونکە ناوی ئەلیاس، لای جولەکە زۆرە، پیرەکانمان بۆیان دەگێڕاینەوە (ئەلیاس) برای (حاجی شێخ) بووەو لەگەڵ حاجی شێخدا زویربووەو فڕیووە بۆ ئەوبەر، ئەمەش هەر فێڵی جوولەکەکان بووە، بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان نەچن گۆڕەکەی تێکبدەن، گوایە گۆڕەکەی شتی بەنرخی تێدایە. جارێک ئەمەم لە تەلەفزیۆنەوە باسکرد، هەندێک لە خزمانی (بارام و مخە) لێم ڕەنجان، وتم: ببوورن من باسی مێژووم کردووە.

ئەمـــانەی باســـمکردن هەموویـــان بۆچـــوونن، لەبەرئەوەی لێکولینەوەی زانستی، مێژوویی و ئارکیۆلۆژی نەکراوە، ناتوانین بە شێوەکی گردەبڕ بلێین کامیان ڕاستە، ئاشکرایە پێنجوێن و گوندەکانی زۆر لە کـۆنەوە جـێگەی نیشـتەجێبوون و ئـاوەدانیبوون، ئەو لەتە سـوالەت و گـۆزەلەو کـوپە گلێـانەی لەنـاو (مەسـۆ، پێنجـوێن و دەوربەری هەرگێنە) دۆزرانەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە پێنجوێن لەزەمـانی مـاد و ساسـانییەکان و پێشـتردا شـارو ئـاوەدان بـووە، بـۆ نمـوونە ئەوکـاتەی لەپێنجـوێن بـووم سـەرە ڕمێکیـان بـۆ هێنـام درێـژیەکەی نیـو مەتـر دەبـوو لە گـردەکەی سـەر چەم دۆزرا بـۆوە، پیشـانی شوینەوارناسـەکانی سـلیمانیمدا وتیـان تەنیـا لەشـکری ئەسکەندەر ئەمجۆرە ڕمەی بەکارهێناوە.

لە (قەلای کچێ) بەردێکیان دۆزیبۆوە، وێنەی سوارێکی لەسەربوو بەڕوخسارو جلەکانیدا هـی سـەردەمی مادەکان بوو، لەکاتێ بەردێکی گردەکەی پشتی (حەسـەن ئـاوا)دا سـێ گورزی ئاسنیان دۆزیبـۆوە، هێنایـان بـۆ دوکـانی (حـاجی نەسـرولای ئاسـنگەر) دەیـان وت گورزەکـانی ڕۆسـتەمی زالـن، دیمەنـی ئەو گـورزانەم ئێسـتەش لەبەرچاون، یەکێکیان لە شێوەی سەرە مێکوتەدا بوو، یەکێکی تریـان سێگۆشـەیی بـوو، دەسـکی یەکێکیشـیان لـوتەی تیژبـوو لە شـێوەی کوتەکدا بوو.

چەپێک گوڵ و چەپێک نێرگز بـۆ ئێوە. منـیش ئەمـانەم کـرد بە چامەیەکی شیعری بەناوی (پێنجوێنەکەم) کاتی خۆی بلاوکرایەوە.

## (٣٠)
## دروستکردنی پەرلەمان لە دەرەوەی وڵات

ساڵی ١٩٩٣، جارێکی دیکە چوومەوە بۆ (بیقاع) بۆ لای عەبدوڵا ئۆچەلان، ئەو کاتە تازە رێکخراوە فەلەستینییەکان لەبیقاع بەرەو تونس وەدەرنرابوون، بۆ ئەوەی مۆراڵی فەلەستینییەکان نەرِوخێ (یاسر عەرەفات) (ئەنجومەنی نیشتیمانی فەلەستینی) لە تونس پێکهێنا، ئاپۆ شەوانە کە دادەنیشتین بیری لەوە دەکردەوە کوردیش پێویستە شتێکی وەها پێکبهێنێ.

باسی ئەوەم بۆ کرد لە شەڕی گیتی دووەمدا، پۆلۆنیەکان و فەرەنسییەکان (پەرلەمانی دەرەوە)ی ئەو دوو وڵاتەیان دامەزراندو لەوێوە مۆراڵیان دەدا بە شۆڕشگێرانی وڵاتەکەیان، هەتا لە دەست ئەڵمانیای نازی داگیرکەر، خۆیان ڕزگارکرد.

سەرەتای مانگی ئازار بوو بە پێشنیاری سەرۆک ئاپۆ، گەشتێکی باشمان لە ڕۆژئاوای کوردستاندا کرد، منی ڕاسپارد کۆبوونەوەی جەماوەریی لە شارەکانی (سەری کانی، قامیشلو، ئامودە، ترپە سپی، گوندەکانی ئەو ناوچانە) ساز بکەین، ئەوکاتە نزیکەی مانگێک مامەوە، ئاپۆ ڕۆژانە میوانی زۆربوو، ئەوەی لە یادمبێت لەکوردی کازاخستان پرۆفیسۆر (نادری نادرۆڤ) لەکوردی ئەرمەنستان (کارلینی چەچان)و ژنەکەی، لە کوردی ئازەربێجان (محەمەدی بابایف)و گەلێکی تر.

ئاپۆ ڕایسپاردم ئەو میوانانە بەناو دیمەشقدا بگێرم و لەبارەی شۆڕشی باکوورو ڕەوشی باشوور قسەیان بۆ بکەم!!.

گەلێ سوود و زانیارییم لەوان وەرگرت، بە تایبەتی لە بارەی کوردی وڵاتی سۆڤیەت و چوونیان بۆ سنوورەکانی ئەرمەنستان و تێکەڵبیان لەگەڵ کوردی ئازەربێجان و هەتا بڵاوبوونەوەیان بەناو کۆمارەکانی ڕوسیادا.

(ئاپێ نادر) زۆر بە وردی باسی ئەوەی کرد چۆن لە کاتی شەڕی گێتی دووەمدا، لاوی کورد یاخی دەبوون لە حوکمەتی سۆڤیەت و نەدەچوون بۆ سەربازیی و بەرەی شەڕ!! .

هەروەها وتی: لە گوندی( قشقە بلاخ) کەلە ٩٠٪ کوردبوون ئەشکەوتێکیان نیشاندایین وتیان لێرەدا گەنجە هەلاتووەکانی کورد خۆیان دەشاردەوە، منیش شەڕی نەگریسی (ئێران و عێراق)م، بیرهاتەوە کە چۆن لاوەکانمان لەکاتی شەڕدا لەئەشکەوت و چیاکانی کوردستان خۆیان حەشاردەدا، یان دەبوون بە پێشمەرگە.

چیرۆکەکەمان (پەکەدەوە)یە پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی ولات. لەپاش هەولدانیکی زورو پیوەندی لەگەل کوردی هەر چوار پارچە، توانیمان یەکەم کۆبوونەوە لە مانگی ٤ی ١٩٩٤ لە هۆڵی شارەوانی ئەمستەردام لە هۆڵەندا ببەستین(لە کۆمیتەی ئامادەکار تەنیا بەندە کوردی باشووربووم)، کۆبوونەوە بە ئامادەبوونی دەیان دەزگای میدیایی ئەوروپا (تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە) کرا، پاش سوێند خواردنی یاسایی سەرۆک، کۆنسەی بەڕێوەبردن هەڵبژێردران، کۆنسەکە پێکهاتبوو لە ١٣ یان ١٤ کەس، کارەکان بەم شێوەیە دابەشکرا:

١. یەشار قایا سەرۆک.

٢. ئەرکەکانیش بەم شێوەیە: دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی سەرۆکی کۆمیسیۆنی پێوەندییەکانی دەرەوە، دکتۆر ڕەمزی قرتاڵ سەرۆکی پەروەردەو تەندروستی، بەڕێز مەحمود قلنج کۆمیتەی دادپەروەری و یاسا، زوبێر ئایدار کۆمیتەی ناوخۆو هەواڵگریی، هەڤاڵی حاجی کۆمیتەی ئەوقاف و کاروباری ئاینی، بەندە کۆمیتەی کولتوورو هونەر.

من و دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، نامەیەکی تایبەتیمان بۆ سەرۆک(ئۆچەلان) نووسی و پێشنیارمان کرد ئەم کۆنسەی بەڕێوبردنە بکەین بە حکومەتێک لە مەنفا، چونکە هەموو کات ئاپۆ بە

ئێمەی دەوت: کورد لەم قۆناغەدا پێویستی بە ئەدرێسێکی سیاسی و دیپلۆماسی هەیە، بۆ ئەوەی گرنگی بەکاری دیپلۆماسی کورد بدات و هەوڵبدات بۆ دروستکردنی لۆبیەکی چالاک لە جیهاندا.

لەماوەی چوار ساڵی خولی یەکەمدا گەلێک کارو چالاکیی بەنرخ ئەنجامدران، توانیمان دەنگی کورد بگەیەنینە هەموو ئۆرگانە سیاسیەکانی جیهان، چونکە هەر ٦ مانگ جارێک کۆبوونەوەکانمان لە وڵاتێکی ئەوروپا سازدەکرد، ئەو کۆبوونەوانەی لای من گرنگی هەبوو:

• کۆبوونەوەی رۆما لە هۆڵی فەرمی پەرلەمانی ئیتالیا کرا، چەندین ئەندام پەرلەمانی ئیتالیا لە پارتەکانی دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن بەشدارییان تێداکرد.

• کۆبوونەوەی مۆسکۆ لە هۆڵی فەرمی ئەنجومەنی (دۆما)، جێگری پەرلەمانی روسیاو زۆربەی سەرۆکی فراکسیۆنەکانی ناو پەرلەمان بەشداربوون.

• کۆبوونەوەمان لە هۆڵی فەرمی شارەوانی ئەمستەردام، کە چەند ئەندام پەرلەمانی ئەو وڵاتە تێیدا بەشداربوون.

• کۆبوونەوەکانی برۆکسل کە هەندێجار لە هۆڵە فەرمییەکانی پەرلەمانی ئەوروپادا دەکرا.

• کۆبوونەوەی گرنگی ناو هۆڵی پەرلەمانی دانیمارک لەکۆپنهاگن، کە بەشێوەیەکی فەرمی پەرلەمانەکەیان لە گەڵماندا بەشداربوون.

رۆژانی گرێدانی ئەم کۆبوونەوانە دەبوونە هۆکارێکی باش بۆ ناساندنی دۆزی کوردو مافە رەواکانی، چونکە میدیاکانی ئەو وڵاتانە مەسەلەی کوردیان ئەهێنایە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و لاپەڕەی رۆژنامەکانیان.

تورکەکانیش بەوە نارەحەت دەبوون و دەکەوتنە پرۆتستۆکردنی ئەو دەوڵەتانە و ئەوانیش وەڵامیان دەدانەوە، ئەمەش دەبووە هۆی زیاتر ناساندنی رەوشی کورد لەجیهاندا.

هەندێ تێبینی و سەرنج:

١) محمدی بابایڤ لە کوردی ئازربایینجان بوو، گەیشتبوو پلەی جەنەڕاڵ و چالاکەوانێکی پلە بەرزی KGB بوو، وەکو خۆی لە دانیشتنێکدا بۆ ئاپۆی باسکردو لەوێ بووم دەیوت: (ئەو کاتەی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دامەزرا من ڕێکخەری پێوەندییەکانی کۆماری کوردستان و سۆڤیەت بووم، لەکاتی هاتنی بارزانییەکاندا بۆ سۆڤیەت من لە ستالینەوە بڕیارم بۆ دەرچوو سەرپەرشتی کاروبارەکانیان بکەم).

٢) لە زەمانی سۆڤیەتدا تورکیا بووبووە بنکەی هەواڵگریی سەربازیی ئەوروپاو ئەمریکا. لەوێوە پیلانیان دژی سۆڤیەت بەڕێوەئەبرد.

٣) سۆڤیتییەکان وەکو کارتێکی فشار دەستەیەکیان لە (محەمەدی بابایڤ، وەکیلی مستەفایڤ و حاجی جوندی)و چەند کەسایەتیەکی تری کورد پێکهێنابوو، لە ڕێگەی ڕادیۆی (یەریڤان و ڕۆژنامەی ڕێیا تازە)، باسیان لەمافەکانی کورد دەکرد لە تورکیا، تورکەکانیش لەوە دەترسان و سۆڤیەتییەکانیش کارتی کوردیان لە تورکیادا وەکو وەلامدانەوەی بنکە هەواڵگری و سیخوڕییەکانی تورکیا بەکاردەهێنا.

چەپێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوە، ئێمەش لە خەباتی خۆمان کۆڵنادەین.

# (٣١)
# دەنكە شقارتەکەی باڵیۆزی ئەمریکاو پیازەکەی مام مەجید

بەگێـڕانەوەی ئەم چیرۆکـانە، خـوێنەرە ئازیزەکـان و خۆیشـم دەگێـڕمەوە ئەو سـەردەمانەی حزبـایەتی و نیشـتمانپەروەری بـۆ ڕۆشـنگەری بـوو، خەبـاتبوو لە پێنـاوی گەلـداو ئەرکێکـی پیـرۆزی مرۆڤایەتی بوو!!..

لەبەرچالاکی سیاسی خویندنیان لی قەدەغە کردم، منیش لەناو حزبی شیوعیدا خۆم تەرخانکرد بۆ کاری سیاسی، وەک گەنجێکی خوێنگەرم و بێباک لە هەر مەترسییەک، کەوتمە گەڕان و جموجۆڵ، وامـدەزانی بە دەسـتهێنانی بڕوانـامەی شۆڕشـگێری لەخوێنـدنەکەم پیرۆزترو نەمرترە!!!

زۆربەی ناوچەکانی کوردستان هەر لە پێنجـوێنەوە تـا هەڵەبـجە، شارەزور، قەڵادزێ، ڕانیە، چۆمان، قەرەداغ، کەلار، سلێمانی، کەرکوک و هەولێـر گەڕاوم و کـاری حـزبیم تیـاکردوون، وەکـو عاشـق و شەیدایەک کارمدەکرد، هەتا پێڵاوەکانم نەدڕایە، داوای پێڵاوم لەحزب نەدەکرد، گوێمـان بە سـەرماو گەرمـاو هـیچ جۆرە ترسـێک نەدەدا، لە حزبدا باڵی (قیادەی مەرکەزی)، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووم.

لە پێنجـوێن قاچـاخ بـووم، بە نهێنـی کارمـدەکرد، بەیانیـان زوو لە شار دەردەچوین بۆ چوارباخ، بە تایبەتی باخەکەی (مـام مەجید)، مـام مەجیـد لەبەر جۆگەیەکـدا هەنـدێ تەرەپیـازی چانـدبوو، جارجـار دەسکێکی بە عـانەیەک لێدەفرۆشـت، ئافرەتێک بە کۆڵێ دارەوە هـات، وتـی: مـام مەجیـد دەسـکێ تەرە پیـازم بەرێ! مـام مەجیـدیش بە تـوڕەییەوە وتـی: تەڕە پیـاز نەمـا هەمـووی شـیوعی خـواردی، ژنەکە

وتـی: ئەی بـۆچی دەرمـانی (دی دی تـی) پێـداناکەی و هەموویـان بکوژێـت، ژنەکە وایـدەزانی شـیوعی گژوگیـاو گیـانەوەرە، منـیش ڕوومکردە(قالەی حاجی حوسێن و سەلامی عەلی ئەحە ڕەش)، وتـم سەیرکەن خەڵکیش بە دەعبامـان ئەزانـی، ئایـا بەم شـێوەیە ئەتـوانین ئەقڵیەتی ئەم کۆمەڵگایە بگۆڕین؟

جارێک لە کۆبوونەوەی قەزای پێنجوێن هەواڵی هـاوڕێ (حەمەی تامین)م پرسـی، وتیان وازی هێناوە، لیژنە بڕیاریدا بچمە سەردانی، بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ نـاو حزب، لە دوکانەکەیدا دوو بە دوو قسەمان دەکرد، لەو کـاتەدا دەرویشـیکی زۆری سـنەو سەریـوان، لە گەردکـی (بەرکێو)ەوە بەرەو نـاو بـازاڕ کەوتبـوونە ڕێ، یەکێک مـاری لە ملـی خۆی ئالاند بـوو، یەکێک دوو پشـکی ئەخـوارد، یەکێک (زەرکـی) لە گوپی دابوو و لەولاوە دەرچوو بوو، یەکێک بە شمشێر هەموو لەشی خـۆی خوێنـاوی کـرد بـوو، بەریتمـی دەف هەڵـدەبەزینەوە هـاوارو قیژەیان ناو بازاڕی شاری خرۆشـاندبوو، هەمـوو خەڵک لەو لایانەوە کەوتنە هەڵبەزینەوە، ئینجا هـاوڕێ حەمەی تـامین وتـی هـاوڕێ گیـان باوەڕبکە هەموو بن دار گوێزێکی پێنجوێن مارکسیێکی تیابێت، ناتونێت قەناعەت بەو خەڵکە بکات سۆسیالیزم لە بەرژەوەندی خەڵکدایە، وازم لێبێنـە بـا دوو عـانە پەیـابکەم بـۆ منـداڵەکانم، تـۆش بـڕۆ بە لای خوێندنەکەتەوە، من ئیتر (ئاسنی سارد ناکوتم).

گـامێش تەپە گونـدێکە لە شـارەزوور نزیکـی سـەید سـادقە، هەموویـان عەشـیرەتی (وردە شـاتری جـاف)ن، کوێخـا مەحمـود سەرۆک هۆزیان بوو، حەمە ڕەشیدی کوری شیوعییەکی چالاکبوو، لەبەرئەوەی حەمە ڕەشی کوریان شیوعی بوو، ئەوانیش هەموویان یان شیوعی بوون یان دۆستی حزب بوون، منیش ئەو کاتە ئەندامی لیـژنەی قەزای هەڵەبـجە بـووم، جارجـارە بە ئەرکـی حـزب بەشـارەزووردا دەگەڕام و کۆبـونەوەی جەمـاوەرییم ڕێکدەخسـت،

جارێـک لە مــزگەوتەکەی گـامێش تەپە زۆربەی خەڵکــی ئـاواییەکە هـاتبوون، هەتـا نزیکی بەیانی قسـەم بـۆ کـردن، لە تاریک و ڕووندا یەکێکیان چوو بانگیدا، بە تەمەنەکەیان وتی: هـاورێ (بیـوڕۆ بیـوڕۆ) هەرچی خوا نەیکات ناوێ.

ئەمانەو گەلێک سەرگوزەشتەی تر بیری منیان ئاڵۆزدەکرد، زۆر بیرم لە ئاوەزو شێوەی ئەو ژیانە کۆمەلایەتییەی جڤاک دەکردەوە، لە خـۆمم دەپرسـی ئایـا ئـێمە دەتـوانین بەو شـێوازی خەبـاتە کـۆمەڵگە بگـۆڕین یـان بە شۆڕشـێکی چەکداریی درێژخـایەن گۆڕانکـاری دێتە مەیدان؟.

لەسـەرەتای سـالانی شەسـتەکاندا، ئەمریکا ئەمبارگۆی خسـتبووە سەر وڵاتی (کوبا)، ئێمەش بۆ نارەزایی دەربڕین، یەک ملیۆن واژۆمان لە کوردســتان کۆکردبــۆوە، وەکــو هاوســۆزییەک لەگەڵ کوبــادا، (کوبا)یەک هەزاران کیلۆمەتر لێمانەوە دووربوو، ڕەنگە ناوی کورد و کوردســتانیان نەزانیبێــت، ئەم بــابەتەم لە چیرۆکێکــی تــردا بــۆ باسکردوون چۆن لەمانگی ١٠ ساڵی ١٩٦٣دا بەو یەک ملیۆن واژۆوە چـووینە لای بـاڵیۆزی ئەمریکـا لەبەغـدا، بـاڵیۆزەکە وتـی: یەک ملیـۆن واژۆکەتـان بەرانـبەری ئەم دەنـکە شـقارتەیەیە. ئیتـر هەمـوو ئەمـانە وایکـرد گـۆڕینی ئەو شـێوازەی خەبـات بـۆ شۆڕشـی چەکـداریی بە پێویست بزانم.

چەپێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوە، خەبات بۆ ئازادی هەر بەردەوامە.

# (٣٢)

## وەقفی شێخ سەعیدی پیران، وەقفی ئایینی نەتەوەیی و کوردستانی

تەڤگەری ئازادیی باکووری کوردستان هەرگیز لایەنی کۆمەڵایەتی و ئایینی کۆمەڵی کوردەواری فەرامۆشنەکردووە، هەوڵیداوە هەموو وزە شاراوەکانی هەناوی جڤاکی کوردەواری بەڕووی دوژمندا بتەقێنێتەوە. بەتایبەتی لەناو ڕەوەندی ئەورووپادا. ئەو شارانەی ڕەوەندی کوردی تیا بووە، کۆمەڵی فۆلکلۆری بۆ هەڵپەڕکێ و موزیک و گۆرانی پێکهێناوە، لە زۆربەی شارەکاندا تیپی شانۆیی هەبوو، هەروەها کۆمەڵی جڤاکی بۆ عەلەویەکان و ئێزیدییەکان پێکهێنابوو.

لەو شارانەی ڕێژەی موسڵمان زۆربوون گرنگی بە بزاڤی ئیسلامی دابوو، مزگەوتی تایبەتی بۆ کردبوونەوە، ئەمە جگە لە ئینیستیتیوتی کوردی لەبەرلین و ئەکادیمیای هونەری کوردی لە ئەڵمانیا.

ئەم وزە شاراوانە هەموو دەخرانە خزمەتی شۆڕشەوە، لەناو ئەو سازیانەدا سەدان کوڕو کچ پەروەردە دەکران و دەگەڕانەوە بۆ چیاکانی کوردستان دەبوون بە (گەریلا).

هەر لەو ئۆرگانانەدا وانەی وڵاتپاریزی، شۆڕشگێڕیی و خۆبەختکردن و کۆڵنەدان فێردەکران، خەڵکەکەیان وا ڕاهێنابوو خۆیان و منداڵەکانیان بێنن بۆ ئەم سازی و دامەزراوانە، هەتا منداڵەکانیان بپارێزن لەشەپۆلی هەڵخلیسکانی مادەی بێهۆشکەرو لادانی بەدڕەوشتی، ئەوکاتە لە پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات، بەرپرسی هونەری و ڕوناکبیری بووم، لە هەموو ئەورووپاو

ئەستەنبوڵ و ئامەد سەرپەرشتیاری ئەو جۆرە چالاکییانەم دەکردو دەپەژراند.

بەڕێز (عەبدولڕەحمان دوڕڕە) لە کاتی خۆیدا موفتی فەرمیی ئامەد بوو، لە ئەنجامی دانپێدانانـدا دەرکەوتبـوو ئەنـدامێکی چـالاکی پـارتی کرێکـارانی تورکیـایە، پـاش زینـدانیکردنی بە چەنـد سـاڵێک، هـاتبووە ئەڵمانیا، لەنـاو بـزوتنەوەی ئیسـلامی سـەر بە پەپەکەدا ڕۆڵـی گرنگـی هەبـوو، جـگە لەمـانە شـاعیرو نووسـەرو وتـاربێژێکی چـاکبوو، لە پەرلەمـانی دەرەوەی وڵاتـدا ئەنـدامی کۆنسـەبوو، ڕۆژێـک باسـیکرد بـۆچی وەقفێـک بـۆ شـێخ سـەعیدی پیـران دانەمەزرێنـین؟ ڕێککەوتـین بانگهێشتی(ئەحمەد مەلیک فورات) بەوەی شیخ سەعیدی پیران بکەین بۆ ئەڵمانیـا، مەلیک فورات کەسـایەتییەکی بەناوبانگ و ڕۆشـنبیرێکی بەتوانـا بـوو، کـورد پەروەرێکـی ئـازابوو، چەنـدجار وەکـو کەسـی سـەربەخۆ لە پەرلەمـانی تورکیـادا ئەنـدام بـووە، ئەم باسـەمان لەگەڵ مەلیـک فـورات باسـکردو لای پەسـەندبوو، بەمجـۆرە بە شـێوەیەکی فەرمـی لەشـاری کـۆلن، مـۆڵەتی کـردنەوەی وەقفەکەمـان پێـدرا، ئەنـدامانی وەقـف پێکهـاتبوون لەمـانە: (مەلیـک فـورات سـەرۆکی وەقف...بـاکووری کوردسـتان، مەلا عەبـدوڵا سـەرۆکی بـزوتنەوی ئیسلامی کوردستان... ڕۆژئاوای کوردستان، عەبدولڕەحمان دوڕڕە... باکووری کوردستان، عەلی کوری پێشەوا قازی محەمەد...ڕۆژهەڵاتی کوردستان، محەمەد ئەمین پێنجوێنی...باشـووری کوردسـتان، عەدنان دیندار ژمێریاری وەقف ... باکووری کوردستان.

ئەم وەقـفە ڕۆڵێکـی باشـی هەبـوو لەکـۆکردنەوەی موسـڵمانە کوردەکـانی تـاراوگەو خـزمەت و یارمەتیدانی کەسـانی بێدەرەتان و بێدەرامەت و پەککەوتەی موسڵمانانی بێلانەو بێ جێگەو ڕێگە. لەم ڕێگەیەوە توانرا گیانی کوردپەروەری و کوردستان خۆشەویستی لە دڵی ئەو خەڵکە موسڵمانانەدا ببوژێنێتەوە.

## (٣٣)
# سەردانی پاپای ڤاتیکان پۆلسی سێیەم

لەپێشتردا ئاماژەم بە دیداری پاپای ڤاتیکان کردووە، لێرەدا لایەنێکی تری ئەم سەردانە ئاماژە پێدەکەم.

جیا لە پێوەندی حزبی بە ڕەوانشاد (ڕەئوف زوهدی) ناسیاوی باشم لەگەڵیدا هەبوو، بنەماڵەی ڕەئوف زوهدی لە شاری سلێمانیدا ناسراون، ڕۆڵیکی بەرچاویان لە بزاڤی نیشتمانپەروەری و خەبات بۆ ئازادی کوردستان و بە دەستهێنانی مافی ژنان هەبووە،(خانم زوهدی و ئەنجوم زوهدی: دۆتمانی یەکبوون)، نموونەی ئەو خەباتەن. لە بزاڤی سیاسیی و نەتەوەیی کوردستاندا چالاک و ناو بەدەرەوە بوون، لە پێناو بە دەستهێنانی مافی ئافرەتاندا زۆر تێکۆشاون.

مامۆستا ڕەئوف زوهدی لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا نامەیەکی دەستخەتی خۆی پیشاندام کە بۆ پاپای نووسیبوو، (رسالة الى حبر الاعظم)، لە بارەی چەوساندنەوەی کوردو ئەو ڕەوشە ناهەموارەی داگیرکەرانی کوردستان بەسەر کوردیاندا هێناوە، لەسەر ئەم نامەیە بوو لەناو بازاڕی شاردا بە دەمانچەی بێدەنگ تیرۆریانکرد.

لەبەڵگەنامەکانی (دائیرەی ئەمن)، دوای ڕاپەڕین نامەی کەسێک بەردەستکەوت کە بۆ بەرپرسەکەی خۆی نووسیبوو لەشاخ، بە شانازییەوە دەڵێ ئەو کافرەمان بە جەهەننەم سپارد! ئەو کەسەی نامەی بۆ پاپای کافرەکان نووسیبوو لە ناومانبرد، ئەو تیرۆریستە سەر بە ئەمن بوو، ئەندامی ڕێکخراوێکی سیاسیی کوردی بوو.

من ئەو کارەساتەم هەر لە یادبوو، ئەو کاتەی لە بەرلین لەگەڵ دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی هەردووکمان هاوسەرۆکی ئینستتیوتی

بەرلین بووین، بیرمان لەوە دەکردەوە چۆن دیدارێک بۆ لای پاپا ڕێکبخەین؟ سەفەرەکە پێکهات، ئێمە یەکەم شاندی کوردی بووین لە مێژووی گەلی کورد چووینە دیداری پاپا لە ڤاتیکان.

لەبارەی کوردو دۆزە ڕەواکەیەوە قسەمانکرد، شاندەکەمان لە (دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، موفتی عەبدولڕەحمان دوڕڕە، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، دڵبەخون دارا)، من بە جلی کوردییەوە چووم، پاپا زۆر سەرنجی لە جلەکانم دەدا.

بەناوی ئینستتیوتی کوردیی و وەک لایەنێکی کولتووری چووین، پاپا بەڵێنیدا نوێژیک بۆ گەلی کورد بکات و لای خودا نزامان بۆ بکات کە پاشەڕۆژێکی باش بۆ کورد بێتەدی، بەڵام نازانم نوێژەکەی قبوڵبوو یانْ نزاکەی ئەنجامی هەبوو؟!

لەو چوار کەسە دوان چوونە بەر دلۆڤانی خودا، ڕەوانیان شادبێت، دوانیشمان هێشتا تیرۆر نەکراوین، چەپێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوە، ئێمەش لە خەبات کۆڵنادەین.

# (٣٤)

# چۆن (مامە عەلی)یم گەیاندە لای بارزانی و شێخ لەتیفی حەفید

ساڵەکانی ١٩٦٤ - ١٩٦٥ گەرمەی شەڕی (جەلالی و مەلایی) بوو، هەردوو بەرە یەکتریاندەکوشت، ڕۆژنامەکانیان ڕوخساری یەکتریان تۆمەتبارو ناشیرین دەکرد، ڕۆژنامەی (ئەلنور)و (خەبات) لەم بارەیەوە درێغیان لەیەکتری نەکرد، لە ئاکامدا بۆشاییەکی سیاسیی گەورە دروستبوو، حزبی شیوعی بە هەموو توانایەوە دەیویست ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە، کادیرەکانی لە هەرێم خستەگەڕو چالاکیی نواندن.

ئەو کاتە کادیری حزبی شیوعی و سەرپەرشتیاری چالاکی جووتیارانی ناوچەکانی شارەزوور، پێنجوێن، قەرەداخ، بەرزنجەو دەوروبەری سلێمانی بووم، پێوەندی ڕاستەوخۆم لەگەڵ (لیژنەی مەحەلی سلێمانی) هەبوو.لەدرێژەی هاتوچۆمدا بۆ ناو جووتیارانی ناوچەکە لەڕێگەی پێنجوێن، پارتی گرتمی و بردیانم بۆ گوندی (چەوتان)، زۆر ئازاریاندام و لەئاوی سارديان هەڵکێشام، پێیانوتم با لە شیوعیەت پاکتبکەینەوە، پاش چەند ڕۆژێک بەریاندام و چوومە پێنجوێن، لەگەڵ هاوڕێیانم کۆبوونەوەو لەوانەوە زانییم چەند هاوڕێیەکمان گیراون و زۆر ئازاردراون، لەوانە (عەلی ئەحە ڕەش و سەلامی کوڕی حاجی ئەنوەر(ئەنوەر جەلال)، سابیری دەروێش ئەحمەد، حەمەی حاجی مەلا، عەبەی سەوسەن و چەند کەسێکیتر).

ئەمانە دەست و پەراسو و سەرو گوێلاکیان شکێنرا بوون، دوایی منیشیان بانگکردەوەو پێیانوتم یا لێرە برۆ یان دەتگرینەوە، منیش تووڕەبووم و وتم شەرت بێت لای سەرکردایەتی شۆڕش بەتایبەتی لای (مەلا مستەفا) شکاتتان لێبکەم، لایان سەیربوو، وتیان برۆ لەکوێ شکاتدەکەی بیکە.

ئەوانەی جێی شکاوی و ئازاریان پێوە دیاربوو لەگەڵ خۆم هێنامن بۆ سلێمانی، ئەو کاتە (ئەحمەد کەریم) بەرپرسی لیژنەی محەلی بوو، مەسەلەکەم بۆ باسکرد، وتی هاوڕێ جا من چییان لێبکەم؟ (٧٥٠) فلسی دامێ، وتی هاوڕێ ئەمەیان بۆ بکە بەمەسرەف !!!منیش وتم ئەیان گەیەنمە لای بارزانی، قسەکەی منی بەڕاست وەرنەگرت... ئەو کاتە (شێخ لەتیفی حەفید) لە ڕانیە بوو، منیش بەخۆم و ئەم بریندارانەوە خۆمان کرد بە بارەگای شێخ لەتیفدا، ئەو منی باش دەناسی، چونکە چەند جارێک بۆ ئیشی حزب بینیبووم، وتم قوربان جەنابت دەزانی لەم شەرەدا(جەلالی و مەلایی) حزب پشتگیری بارزانی کردوە، بەلام بەرپرسانی پارتی ڕێگریمان لیدەکەن و ئەندام و کادیرانمان دەگرن و سووکایەتیمان پێدەکەن، ئێستە ئەو هاوڕێیانەی هێناومن نموونەن. دەمەوێت بیانبەمە لای بارزانی شکات لەو بەر پرسانە بکەم کە بەناوی ئەوەوە لەو ناوچەیەدا خراپەدەکەن، زۆر دڵگرانبوو، وتی لە تۆشیانداوە حەمەومین؟ قوربان: منیان لە حەوزە ساردەکەی چەوتان هەڵکێشا، وتیان لە شیوعیەت پاکتدەکەینەوە، شێخ لەتیف وتی: بڕۆن پشووبدەن، ئێوارە لەگەڵ خۆمدا دەتانبەم بۆ لای بارزانی.

ئێوارە لەگەڵ خۆی بردینی بۆ سەنگەسەر، بارەگای بارزانی لە قوتابخانەیەکدا بوو، شێخ لەتیف و بارزانی دوو بە دوو قسەیانکرد، شێخ ڕۆیشت و بارزانی ڕووی لە ئێمە کردو زۆر گرنگی پێداین، پرسیاری کرد کێ عەزێتی داوین؟ من یاداشتێکم نووسیبوو، بۆم خوێندەوە دواتر خستمە بەردەمی و زیاتر لە بارەی ڕەوشەکە قسەمکرد، وتم: ئێمە حزبەکەمان پشتگیری جەنابت دەکات و سۆڤیەتیش پشتگیری جەنابتە لەو ململانێیەدا، ئەوانەش ئازاری ئێمە دەدەن، دەڵێن پیاوی بارزانین، وتم: تێناگەم لەو بەرپرسانە کە خۆیان لە بن دەستی ئێوەدان، چۆن ئازاری ئێمە دەدەن؟ من ناوی دوو بەرپرسم درکاند کە دوو کۆنە ئەفسەری لەشکری حکومەت بوون و

هـاتبوونە نـاو شۆڕشـەوە، فەرمـانیکرد وتـی ئەم دوو نـاوانەم بـۆ بـانگبکەن، ئەوانەیـان بـانگکردو لەبەرچـاوی ئێمە کـارێکی پێکـردن بـا بەدەواری شڕی نەکات، وتی ئەوانە قوتـابین و شـایەنی ئەو ئازاردانە نین.یەکێکیان پەنجەی بۆ من درێژکردو وتی: ئەزبەنی ئەوەیان لەسەر دیـواری مەرکەزی پێنجـوێن دروشـمی شـیوعیانەی نووسـی منـیش گرتم، بارزانی لێپرسی چیی نووسیبوو؟ کابرای کۆنە ئەفسەر وتی: نووسـی بمرێت دیکتـاتۆریەت بژی چینـی کرێکـار، لەم قسـەیە زیـاتر تووڕەبوو وتی: پێم نەوتوون ئازاری خەڵک و قوتـابی مەدەن، وتـومە ئەوانە بگـرن کە شـۆرش تێکدەدەن، ئیتـر لێیـان تورەبـوو وتـی هەرن هەرن.ئیمە نزیکەی سەعاتیک یان زیاتر لە خزمەتیدا ماینەوە، زور قسـەی خۆشـی بـۆ کـردین، باسـی ڕەوشـی خۆیـانی کـرد کە چـۆن چوونەتە سۆڤیەت و لە سۆڤیەت چییان بەسەر هاتووە؟ ناسنامەیەکی پیشـاندایـن بە جلـی ژەنـراڵییەوە، وتـی ئەوە هـی ئەوکـاتەیە کەلە ئەکادیمیای سۆڤیەت کۆلیژی سەربازییم تەواوکردووە.

هەر ئەو شەوە فەرمـانیکرد وتـی: بیـان گەیەننەوە بارەگـای شـێخ، ئەوانیـان گەیانـدەوە ڕانیە، مـن وتـم بمـبەن بـۆ قەڵادزێ، بـۆ لای مەلا ئیبراهیم (عەزیز محەمەد) سکرتێری حزب، کە چووم هەمزە عەبدوڵلا، شێروان عەلی ئەمین، ئەحمەد مەحمود دەلاک و دوو هـاوڕێی عەرەب لەلای دانیشتبوون، لێیپرسیم وتی ئێوە بۆ (١٠) دەقیقە چوون، بەڵام سـەعات زیاترتـان پێچـوو؟ وتـم لەبەرئەوەی لەگەڵ شـێخ لەتیـف چووبووین زۆر ڕێزی گرتین و نامەکەی جەنابتیشمدا بەدەست خۆیی و پێیـوتم بە عەزیـز بڵـێ داواکارییەکـانی جێبەجێـدەکرێت، وتیـان حەزدەکەین چیتان وتووە بۆمان بگێڕیتەوە، منیش بە وردەکارییەوە هەموو شتەکانم بۆ گێڕانەوە.

شـایانی باسـە، هەتـا ئێمە گەڕاینەوە بـۆ پێنجـوێن ئەو بەرپرسـانە لەوێ نەمابوون، ئێمەش کەوتینەوە سەر چالاکیی خۆمان.

چەپێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوە، ئێمەش ئاوە سـاردەکەی چەوتـان دابنەشۆراندین..

# (٣٥)

# کۆنگرەی قوتابیانی جیهان لە بەغداو...
# شەڕی ڕاست و چەپ

ساڵەکانی ١٩٦٠ - ١٩٦٢ شەپۆلی چەپ و مارکسی سۆسیالیستی لە عێراق و کوردستاندا لە هەڵکشانبوو، سەبارەت بە کوردستان ململانێ لە نێوان تەوژمی نەتەوەگەرایی و ڕەوتی مارکسیدا لەو پەڕی کەف و کوڵ و گرگرتوویدا بوو لە ماڵ لە شەقام، هەموو شوێنە کۆمەڵاتییە گشتییەکان بووبوونە مەیدانی بەربەرەکانیی یەکتری و بەیەکداهەڵپژان، بە تایبەتی لە قوتابخانەکاندا پەلاماری یەکتریان دەداو زۆر جاریش کوژراو و بریندراری لێدەکەوتەوە.

بەلاڤۆکی پارتی و شیوعی بەشێکی زۆری بۆ هێرشکردنە سەر یەکتری تەرخانکرابوو، کەم کەس باسی فەلسەفەو تیۆری حزبەکەی دەکرد، گەل بەم شتە لاوەکییانەوە سەرقاڵ کرابوو، یان بڵێین سەری لێشێوێنرابوو.ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی حزبی شیوعی، بە پارتییەکانی دەوت کۆنەپەرست، فویۆداڵ و ئینفیساڵی، ڕۆژنامەی خەباتیش بە شیوعیەکانی دەوت بەکرێگیراوانی مۆسکۆو کۆسمۆپۆلیتی و کوردکوژ، ئەمە وای لە(ئوستاد) کرد بڵێ ئەوەی ئینفیساڵی نەبێت (...) وایە.

لە گەرمەی ئەو هەراو بەزمەدا لە قوتابخانەی پیشەسازی قوتابی بووم و ئەندامی لیژنەی قوتابیانی حزبی شیوعی بووم، ئەوەی بیرمبێ ئەندامانی لیژنە (عەلی ساڵح غەفوور، جەلالی میرزا کەریم، بەکر قادر، ڕەفعەت زوهدی، فەرەجی مەلا ئەمین و نەجمەدین نوری) ماوەیەکی زۆر جەلالی میرزا کەریم بەرپرسمان بوو، لە دوای ئەو

شیروانی عەلی ئەمین شوێنی گرتەوە، لە شەڕو بەربەرەکانی ناو قوتابیاندا زۆر جار شەڕە چەقۆو بە بۆکسخەنجەر سەرو گوێلاکی یەکتریان بریندارەکرد، شەڕی گەورە لە (ئامادەیی سلێمانی) ڕوویدا، زۆر جاریش لە قوتابخانە ناوەندییەکان شەڕ بەرپادەبوو .

لە ساڵی ١٩٦٠ کۆنگرەی قوتابیانی جیهان لە بەغدا گیرا، عیسمەت شەریف وانلی وەکو نوێنەری قوتابیانی کورد لە ئەورووپاوە هاتبوو، ئەو لە وتاری خۆیدا چارەسەری ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی عێراق پێشنیارکرد، لە کۆنگرەکەدا بوو بە هەڵاو گفتوگۆی گەورەی دروستکرد، پرسەکە گەورە بوو، حکومەت بڕیاریدا عیسمەت شەریف لە عێراق دەربکرێت.

مەهدی حافز ئەو کاتە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی یەکێتی گشتی قوتابیانی عێراق (حزبی شیوعی) بوو، وەڵامی عیسمەت شەریفی دایەوە وتی: کورد وەکو بەربەرەکانی جەزائیر بۆیان هەیە مافێکی کولتوریان هەبێ نەک (جوداخواز) ئینفیساڵی، ئەم قسەیەی مەهدی هەموو قوتابیانی کوردی توڕەکرد، بەتایبەتی نەتەوەییەکان.

شەڕو هەڵا لەناو قوتابیانی سلێمانیدا دەستپێکردەوە، ئێمەی لیژنەی قوتابیانی سلیمانی یاداشتێکی پڕۆتستۆمان نووسی و دامانە لیژنەی محەلی سلێمانی و سەرکردایەتی حزب، لە ناو قوتابیانیشدا بڵاومانکردەوە، لەسەر ئەمە حزبی شیوعی من و جەلالی میرزا کەریم و چەند کەسێکی تری لە چالاکی حزبیدا سڕکرد، لیژنەکەیان هەڵوەشاندەوە قوتابییە پارتییەکان لەسەر دیوارەکان دەیاننووسی مردن بۆ مەهدی حافزی شیوعی، شیوعیەکان دەیان کوژاندەوە دەیانووسی بژی مەهدی، مردن بۆ کۆنەپەرستی.

شەڕ لە قوتابخانەکاندا بەردەوامبوو، زۆر جار قوتابییە شیوعییەکان دەستیاندەشکاو دەوامیان نەدەکرد، حزب بە ناچاری

سەندیکای کرێکارانی ئاگادارکردوە، لە کاتی شەڕدا بچن بە هانای قوتابییە شیوعییەکانەوە، لە شەڕێکدا لە نێوان چەپ و ڕاستدا(شیوعی و پارتی)، کرێکارێک بە ناوی حوسێن فەرەج کوژرا، ئێمەی قوتابیانی پیشەسازی و کشتوکاڵ کە بەشی هەرە زۆری چەپ بووین، بە هانای شەڕەکەی ئامادەیی سلێمانییەوە چووین، تەرمی کوژراوەکەمان خستە سەر عەرەبانەیەکی خۆڵ، بەڕێپێوان بە شەقامی کاوەدا هێنامان تا بەردەکی سەرا، هەتا گەشتینە ئەوێ بووینە چەند هەزار کەسێک، لەوێ تێکۆشەری دێرین (غەفووری میرزا کەریم) وتارێکی ئاگرینیدا، خەڵکەکەی ئەوەندەی تر جۆشداو بکوژەکانی بە شەقاوەکانی سلێمانی ناوبرد، ئەوەی لە یادم مابێت شاعیرو نوسەر جەلال دەباغ شاعیرو تێکۆشەر جەلالی میرزا کریم، جلال عەبدولای سابونچی و بەندە لە پێشی ڕێپێوانەکەوە دەڕۆیشتین، ئەوەی لە ژیاندا ماوە سڵاوی لێبێت، ئەوەشی نەماوە ڕەوانشاد بێت.لەم ساڵانەی دواییدا شەوێک لەگەڵ هۆمەری دزەیی، بە ڕێککەوت دکتۆر مەهدی حافزم بینییەوەو دانیشتین، ئەو هاتبوو بۆ فۆرمی زانکۆی ئەمەریکی لەسلێمانی، پێموت ئێستە لەگەڵ مافی کولتووریت بۆ کورد؟ وتی: نا ئێستە لەگەڵ دەوڵەتی کوردیدام، چونکە تەنیا چارەسەرە بۆ کوردی عێراق. وتم چۆنە ئەم گۆڕانکارییە لە بیرو باوەڕی تۆدا؟ وتی: زەمەن گۆڕاوە، بێگومان سیاسەت و هزری مرۆڤیش دەگۆڕێ، وتی: بە هەڵە تێگەیشتنێک هەبوو لە قسەکانی من، لە کۆنگرەی قوتابیانی جیهان من کە باسی (بەربەرەکانی جەزائیر)م کرد، مەبەستم لە ئەمازیغییەکان بوو، چونکە لە باکووری ئەفریقا ئێستەش بە ئەمازیغییەکان دەڵێن بەربەر. وتم لەسەر جەنابت شەڕو فەرتەنەی زۆرمان بەسەرهات، ئێستە تۆ شتێکت پێیە بۆ کورد؟ وتی بەڵێ من لەگەڵ سەرکردەکانی کورد ساڵانێکی زۆر کارمکردووە، لە (ڤییەننا)

یـارمەتی زۆرمـداون، لە چوارچێـوەی قسـەکانیدا باسـی ئەو شـەوو ڕۆژانەی کرد کە قاسملۆی تێدا شەهید بووە، شتی سەیرو سـەمەرەو هەندێ زانیـاری باسـکردا! هەر ئەو شـەوە لەکـاتی ئەو دانیشـتنەدا (بێرنـار کۆشـنەر) وەزیـری پێشـووتری دەرەوەی فەرەنسـا باسـی کوشتنەکەی قاسملۆی کرد، کە چەند سەعات لەگەڵییدا بووە ئاگاداری ئەو ڕۆژانە بـووە، بە دکتـۆر مەهـدیم وت قسـەکانی جەنابـت و بێرنـار کۆشـنەر لە یەکـدی جیـاوازن، وتـی ڕاسـتە، بەڵام مـن زانیـارییم لەو زیاترە.

چەپکێک گوڵ بۆ ئێوەی ئازیز. ئێمەش بەرەو ئاسـۆی ئەرخەوانـی و سەربەخۆیی هەر بەڕێوەین

## (٣٦)
## قورئان خوێندن بە ڤۆدگاوە!!!

لە درێژەی گەشتەکانماندا لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران ، بۆ ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدابوو، لەساڵی ١٩٩٦ چووینە کۆماری کازاخستان و ئەلماتای پایتەخت، لە ئەلماتاتا کۆمەڵەیەک هەبوو بەناوی ماڵی کورد، هەڤالانی ئەوێ پرۆگرامێکیان بۆ ئامادە کردبووین، توانیمان وەزیری دەرەوەو وەزیری ناخۆی کازاخستان ببینین. هۆکاری سەردانەکەمان بۆ باسکردن. ریپاندایین هەر شوێنێک لە کازاخستان کوردی تێدایە بیانبینین، تەلەفزیۆن، رادیۆو رۆژنامەی فەرمی حوکمی دیداریان لەگەڵ سازدایین.

کەوتینە گەڕان، هەندێ شتی سەیرو سەمەرەمان بینی، بەهاوڕێیەتی ڕەمزی قرتاڵ و چەند هەڤاڵێکی تر لەناویانادا پرۆفیسۆر نادری نادرۆڤ و دکتۆر کەنیازی ئیبراهیم هەبوون، بە زۆربەی ئەو شارو گوندانەدا گەڕاین کوردیان تێدابوو.

ڕێگەمان کەوتە گوندێک (٢٥) ماڵێک کوردی تێدابوو، نادرۆف شتی عەنتیکەی لەبارەی گوندییە کازاخستانیەکانەوە گێڕایەوە، وتی: ئێمە هاتینە ناویان، ئەوان نەیاندەزانی ماسی بخۆن، ساڵی جارێک خۆیان دەشت، ئەویش لەبەهاردا، هەموویان لە(کۆڵخۆس، سۆفخۆس) کاریاندەکرد، ئێمە ئەوانمان فێری ژیان و شارستانی کرد.

لەو گوندەی ئێمەی لێبووین، ئەو ڕۆژە شایی بوو هەر وەکو نەریتی خۆمان کچ و ژنەکانیان بە جلی ڕەنگاو ڕەنگی کوردیی و سەرو کڵاوەوە، بە پڵ پڵەی زیو ڕازابوونەوە، پیاوەکانیشیان هەندێجار بە سواری ئەسپ بەدەوری زەماوەندەکەدا ڕمبازێن و غارغارێنیان دەکردو جارجاریش تەقەیاندەکرد، ئێمەش بەشداری زەماوەندەکەمان کرد، من بە جلی کوردی ڕانک و چۆغەوە لەگەڵیاندا هەڵپەڕیم، لە پاشاندا کۆبوونەوەیەکی گەورەمان بە خەڵکی گوندەکە

کرد، باسی ڕەوشی ئێستای کوردو شۆڕشەکانی کوردمان بۆ کردن، ئەوان هەر یەکشتیان دەزانی کە ئەوانە کوردن و دوور خراونەتەوە بۆ کاخازستان. لەدۆزی کوردیش تەنیا ناوی بارزانی و تاڵەبانی و ئۆچەلانیان بیستبوو، زۆربەی گەنجەکانیان کوردییان نەدەزانی، بەلایانەوە گرنگ نەبوو کورد چیدەکات و چی بەسەردێت.

چووینە گوندێکی تر بە ڕێکەوت وابوو تازە کەسێکیان مردبوو، لە هۆڵی بۆنەکان پرسەیان بۆ دانابوو، ئاپێ نادرۆڤ منی ناساندن، وتی: ئەمە کوردی عێراقە، ئیتر دەورەیان لێدام و وتیان دەبێت قورئانمان بۆ بخوێنی و بەرنوێژیمان بۆ بکەی، کاتی خۆی لە حوجرەبووم چەن ئایەتێکم لەبەرکردبوو. ئەوانەم بۆ خوێندن و نوێژی مردوومان لەگەڵدا کردن، ئیتر لە هۆڵەکەدا لەگەڵیاندا جقیاین، زۆر هەوڵیاندا تا دوای پرسەکە لەگەڵیاندا بمێنمەوە، لەم مشت و مڕە دابووین، وتیان کاکۆ سەید یاقوب هات، قەیناکە تۆ بڕۆ، سەید یاقوب تەمەنی ٨٠ ساڵ دەبوو، فێسێکی سوری، بە پەڕۆکی سەوز پێچراوی لە سەردا بوو، باڵا بەرزێکی کەتەی دەموچاو قوپاوی غەمباربوو.

کاتێک لە شوێنی خۆیانەوە ڕاگوازراون تەمەنی ١٢ بۆ ١٣ ساڵان بووە، لە حوجرە هەندێ ئایەتی لەبەرکردووە، دەستیکرد بە قورئانخوێندن هەموو بێدەنگ و گوێیان لێگرتبوو دەنگێکی خۆش و زوڵاڵی هەبوو، نادرۆڤ لێیپرسیم، وتی: لەهەموو پرسەکانماندا ئەم سەیدە قورئان دەخوێنێت، خوێندەکەی چۆنە؟ وتم باوەڕبکە نە من لێیتێدەگەم، نەخۆی دەزانی چیدەخوێنێت، باوەڕناکەم خواش ئەمەی لێ قبوڵبکات، چونکە تێکەڵیکردبوو لە کازاخی و کوردی و ڕوسی، لە پڕبڕپیەوە، وتی: ئەگەر گلاسێ فۆدگام بۆ نەهێنن ناتوانم قورئان بە دەنگەوە بخوێنم، لای ئەوان ئاسایی بوو، گلاسێکیان بۆ هێنا ئیتر بە دەنگە زوڵاڵەکەی دەستیکردەوە بە قورئانخوێندن.

چەپکێک گوڵی بۆندار بۆ ئێوەی ئازیز، ئێمەش کوردانی کازاخستانمان بەسەرکردەوە.

## (٣٧)

# ئەری موفتی تۆ تاوڵە دەلەیزی یان زەیتون دەخۆی!

لەسەر خواستی پەرلەمانی دانیمارک، شاندێکمان لەپەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات (پەکەدەوە) پێکهێنا لەم بەڕێزانە (یەشار قایا، عیسمەت شەریف وانلی، عەبدولڕەحمان دوڕڕە، بەندە، چەند هەڤاڵێکی تر) سەردانی دانیمارکمان کرد، کۆبونەوەکەمان لە بیرۆی تایبەتی سەرۆکی پەرلەمان بوو، بە گوێرەی پرتۆکۆڵی پەرلەمانیی، لەبەرئەوەی یەشار قایا سەرۆکی (پەکەدەوە) بوو ئەو قسەیکرد، بەڵام بە تورکی، لە پڕ دەنگێکی گەورە هەمووومانی بێدەنگ و واقوڕماو کرد!!

عیسمەت شەریف وانلی چاکەتێکی شینی تاریکی تازەی لەبەردابوو، بە دوو ڕیز قۆپچەی زەرد نەخشێنرا بوو، دوو ڕیز قۆپچەی ئاسنینی زەردیش بەسەر قۆڵەکانیەوە بوو ئەوەندە لە قسەکردنی(یەشار قایا) تورە بوو، کە بە تورکی دەستیپێکرد، هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دایەوە بەسەر مێزەکەدا، ئەو دەنگ و گرمەیەی لێیەیدا بوو، دیاربوو خەتای قۆپچەکانی بوو! وتی نەمانوت بە کوردی قسە بکە؟

دانیمارکییەکان خێرا وەرگێڕێکی کوردی دانیمارکیان هێناو کۆبوونەوە دەستیپێکردەوە، ئێمە باسی ئامانجی هاتنەکەمان و باسی ڕەوشی سیاسی و بزاڤی شۆڕشگێڕیی کوردمان کرد، داواکاری گەلی کوردمان خستە بەرچاویان، زۆر بە تاسەوە گوێیان لێگرتین، هاوسۆزیی خۆیان بۆ دۆزی کورد نیشاندا، شاندەکەی ئەوان لەسەرۆکی فراکسیۆنەکانی دوو حزبی دەسەڵات و دوو حزبی ئۆپۆزسیۆن پێکهاتبوو، دوایی بانگهێشتیان کردین بۆ ڕێستۆرانتی تایبەتی پەرلەمان، لەسەر مێزی خوانەکە چەند جۆر زەیتون دانرابوو،

سـەیدای دورڕە دەسـتیکرد بە زەیتـون خـواردن، هەر زەیتـونی دەخواردو ناوکەکەی هەڵدەدایە سەر مێزەکە، کاک عیسمەت بە ئاماژە بە منـی وت موفتی(عەبـدولرەحمان دورڕە) ئاگـاداربکەوە، بەڵام ئەو هەردەیخواردو ناوکەکەی هەڵدەدایە سـەر مێزەکە، تورەبوونەکە هەر لە کەللەیدا مـابوو، بە سـەیدای وت ئەرێ مـوفتی تـاوڵە دەلەیـزی یـان زەیتون دەخۆی؟ سەیدا هەڵویستێکی کردو داوای لێبوردنیکرد.

کۆبونەوەکەمـان لە بـاری سیاسـی و دیپلۆماسـییەوە سـەرکەوتوو بـوو، بەڵام لەلایەن خۆمـانەوە ئەو ڕوداوە کۆمیـدیاو تراژیـدیایانە ڕوویاندا، کە کاک عیسمەت ناوینابوو کۆمۆتراژیدیا!!

منیش دوای لیبووردن لەروحی ئەو پیاوە بەریزانە دەکەم، کە ئەم یادگارانە ئەخەمە بەر دیدی ئێوە بۆ ئەوەی زەردەخەنەیەک بکەوێتە سەر لێوتان .

* **تاوڵە دەلەیزی** : واتە تۆ یاری تاوڵە دەکەی.

چەپێـک گـوڵی جـوان بـۆ ئێـوەی ئـازیز، ئـێمەش بەسـەرکەوتوی کۆبونەوەکەمان ئەنجامدا

# (٣٨)
# سوێی تیرۆری حەمدی قەت
# لە دڵم دەرناچێت

هاورێم حەمدی
نەگەیشتیتە ئاواتت مردی
وەری گوڵی جوانی هیوات
لەرێی ئازادی رێی خەبات...
لە خێزانێ هاتیتە بوون
وشک و برنگ بیریان هۆشیان
خۆت بوویتە کارامەی فێربوون!
لە جێی پەروەردە و کۆشیان
هاورێم حەمدی
بە داخەوە زۆر زوو مردی

ئەمە قەسیدەیەکی دوورو درێژبوو لەسەر گۆڕەکەی خوێندمەوە، مەخابن هەرئەوەندەیم لە بیرماوە.

لە قوتابخانەی سەرەتایی پێنجوێن ئاشنایەتیم لەگەڵ زۆربەی قوتابییەکاندا هەبوو، چونکە هەر لە پۆلی شەشەمەوە خەریکی سیاسەتکردن و کوردایەتی بووم، بەتایبەتی لەگەڵ (حەمدی خەسرەو) پەیوەندییەکی گەرمم هەبوو، لەبەرئەوەی باوکی حەمدی قۆمیسەر (مفەوەز، رێپێدراو) بوو لەناو قوتابییەکاندا ناسراوو دەرکەوتوو بوو، خۆیشی کەسێکی جوانخواس و زیرەک و ئاقڵبوو .

ئێمە لە پۆلی شەشەم بووین کۆمەڵەیەکمان بە ناوی (کاوە) دروستکرد بوو، ئەویش ئەندامێکی چالاکی ئەو کۆمەڵەیە بوو، هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی بیری ئازادی و یەکسانی و کوردبوون بووین، لەبەرئەمانەو زۆر شتی تریش هۆگری یەکتری بووین، لە پۆلی ٥و٦ ئەو کاتە ڕۆژانی پێنج شەمە هەموو قوتابیانی قوتابخانەکە ڕیزدەکران و سروودی نیشتمانی و ئازادی بە دەنگێکی بەرز دەخوێنرا، ئەو سروودانەی لە یادم مابێت: (خوایە وەتەن ئاواکەی، کوردستان کوردستان نیشتمانی جوان، هەڵسن ئەی شێربەچە هەڵسن با بچین بۆ لادێ)، لەکۆتاییدا مامۆستاکان قوتابییەکیان هەڵدەبژارد کە سروودی نیشتمانی بزانێت و بەدەنگی بەرز بیڵێتەوە، لەبەرئەوەی دەنگی من زۆر گونجاوبوو بۆ شیعر خوێندنەوە زۆربەی ڕۆژانی پێنج شەممە منیان بانگئەکرد بۆ شیعر خوێندنەوە، منیش شیعری (فایەق بێکەس)م دەخوێندەوە (داری ئازادی بە خوێن ئاونەدرێت قەت بەر ناگرێت...سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ)، ئیتر قوتابییەکان منیان ناونابوو داری ئازادی، هەروەها ئەم شیعرەی (گۆران)یشم ئەخوێندەوە:

من ئەو دیلەم لە زیندانی تاریکدا هەتاوی بیر ڕوناک ئەکات بەرچاوم

بەناو هەزار ئەڵقەی داوی باریکدا پەتی زنجیر ئەپچڕێنێ هەنگاوم

لەگەڵ حەمەدی هاتینە ئامادەیی پیشەسازی لە سلێمانی، هەردووکمان بەشی کارەبامان هەڵبژارد، ئەمە زەوینەیەکی لەباربوو بۆ ڕێکخستنی قوتابیان و چالاکیی سیاسی، لەسلێمانی بووبووم بە ئەندامی لیژنەی قوتابیانی حزبی شیوعی، وەکو چالاکەوانێکی ماندوونەناس کارمدەکرد، ماوەیەکی نەبرد بووم بە بەرپرسی ڕێکخستنی هەموو قوتابییە ناوەندییەکانی شار.

حەمـدیش جیـا لەوەی خـۆی ئەنـدامی حـزب بـوو لە دڵسـۆزی خۆیەوە بۆ من، وەکو پاسەوانێکیش پارێزەری گیانم بوو، قوتـابییە بەناو (قەومییەکان) زۆر ڕقیان لێمان دەبۆوە، زۆرجار هەوڵی ڕفاندن و لێدان و کوشـتنیان دەدایـن، لەبەرئەوەی مـن دەمـانچەیەکی حەوت تیـری بچـووکم پێبـوو، زۆرجـار خـۆمم ڕزگـاردەکردو ئاسـان نەبـوو دەرفەتم لێبێنن!!!!

ئاخری شەوێک دەرفەتیان لە حەمدی هێناو دایانە بەر چەقۆ، پاش چەند ڕۆژێک لە خەستەخانە مایەوەو شەهیدبوو!!.

بە ڕێپیوانێکی گەورە لە گۆرستانی گردی جۆگە (ئێستە بووە بە گەراجی ماشینەکانی زانکۆو خەستەخانە) بە خاکمـان سپارد، لەسـەر گۆرەکەی ۆتارێکی حەماسی و قەسیدەیەکی دوورو درێژم خوێندەوە، ئەوەی جـێگەی داخ و کەسـەرێکی گەورە بـوو لەو مەراسـیمەدا هـیچ خزم و کەس و کارێکی حەمدی ئامادەنەبوون .

حەمـدی گەلێـک جـار دەردەدڵـی خـۆی بـۆ دەکـردم و دەیـوت: خەسرەو باوکی ڕاستەقینەی ئەو نییە، باوکی خۆی پێشمەرگە بووەو لەگەڵ (مەلا مسـتەفای بـارزانی)دا دوای کەوتنـی کۆمـاری کوردسـتان بەرەو سـۆڤیەت ڕۆیشـتووە. پـاش چەنـد سـاڵێک دایکـی شـووی بەم پیاوە کردۆتەوە کە ڕێپێدراوی پۆلیس بووە.

ئێسـتەیش ئەگەر کـارێکم لە زانکـۆ یـان لەخەسـتەخانە هەبێـت ویژادانم ڕێگەمنادات لەو گەراجەدا پارک بکەم، چونکە گۆڕی ونبووی حەمدی لێیە.

چەکێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوەی خەمبـار، ئێمەش لە چەقۆی ئەو ڕێگرانەی ئەوسا ڕزگارمان بوو.

# (٣٩)
# چیرۆکی ئەم وێنەیە

ئەم وێنەیە دوو هونەرمەندی ناوداری کوردن، مامۆستا شەماڵ سائیب و مامۆستا عەلی مەردان، شوێنەکەیان سلێمانی هۆڵی سەندیکای کرێکارانە لە ساڵی ١٩٨٠، بەبۆنەی ڤیستیڤاڵی تایبەتی بۆ رێزلێنان و بەرزڕاگرتنی بولبولی چیرکەو زایەڵەی هەرگیز لەیادنەکراوی سەدا نەمرەکەی مەردانە.

لەچوارچێوەی ئەو چالاکیە رۆشنبیریی و هونەریانەی لە بەڕێوبەرایەتی رۆشنبیریی سلێمانی ئەنجامدرا، ئەم ڤیستیڤاڵەبوو کە دوو رۆژی خایاند، زۆربەی هونەرمەندو ژەنیارانی ئەوکاتە بەشداربوون، لە کۆتاکاتەکانی ئاهەنگەکەدا مامۆستا بە چڕینی چەند مەقام و بەستەیەک کۆتاییپێهێنا، کە جێگەی سەرنج و خرۆشانی ئەو جەماوەرە زۆرە بوون کەهاتبوون، ئەمە جگەی لەو حەشاماتەی هۆڵەکەی پڕکردبوو، شەقام و کۆڵانەکانی دەورو پشتی هۆڵەکەش جمەی دەهات.

هەروەها کاتێ عەلی مەردان هاتە دەرەوە سواری ماشینەکەی بوو، گەنجە هاوادارو عاشقەکانی سەدای مەردان بە ماشینەکەوە هەڵیانگرت و مەودای چەند مەترێک بە شان بردیان، بەو شێوە سەرنجڕاکێشە دڵسۆزیی خۆیان بۆ دەربڕی.

ئەو دیمەنە ئەوەی بەبیرهێنامەوە کە کاتی خۆی ساڵی (١٩٥٥) شێخ مەحمودی نەمر لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ هاتبوون بۆ سلێمانی، خەڵکە بە وەفاو ئەمەکدارەکەی شار ماشینی مەلیک مەحمودیان هەڵگرتوەو ماوەیەکی زۆر بردویانە، شێخ وتویەتی بەسە بەسە با فەیسەڵ زویر نەبێت دامگرن.

خەڵکی شار ئاوا ڕێز لە سومبولە نیشتیمانیەکان و هونەرمەندەکانیان دەگرن، خۆم ئەوە هاتەوە بیرم لەساڵی (١٩٥٨) کەلە قوتابخانەی پیشەسازی بووم، مەلا مستەفای بارزانی هات بۆ شار، لەبەر قوتابخانەی پیشەسازیدا خەڵکی وەفاداری ئەم شارە ماشینەکەیان هەڵگرت و خستیانە سەر شانیان، زۆرباش لە یادمە (ئەحمەدی دادی) شعیرێکی خوێندەوە، یەکەم دێری بەمجۆرە دەستپێکرد:

پلنگەکەی بارزان سەرێ هەڵبڕە
کوردستانەکەت ونجڕ ونجڕە

ئەمە نیشانەی ئەو پەڕی وەفاداریی و شۆڕشگێریی خەڵکی ئەم شارەیە بەرانبەر ڕەمزە نیشتیمانی و مێژوویەکەیان، شایەنی باسە دەستێ ڕانک و چۆغەی هەورامانم خەلاتی مامۆستا عەلی مەردان کرد، شاعیرو هونەرمەندی گەورەی کورد حەمە ساڵح دیلان لە وتەیەکدا مامۆستا عەلی مەردانی بەڕەمزی پێشخستن و بەرزکردنەوەی گۆرانی و مۆسیقای کوردی ناساند، وتی عەلی مەردان لە ساڵی (١٩٣٥)دا وەکو ڕەمزی مەقاماتی کوردی بەشداری کۆنفرانسی قاهیرەی کردوە، کە بۆ بەرزکردنەوەی هونەری مۆسیقا لەڕۆژهەلاتی ناوەراست بەستراوە، باسیکرد کە (زەوقی میللی) هونەری گۆرانی و مۆسیقا لەسەردەستی چەند کەسێکی وەکو (سەید عەلی ئەزغەری کوردستانی، عەلی مەردان و حەسەن جەزراوی، محەمەد عارف، تایەر تۆفیق، شەماڵ سائیب، مەزهەری خالقی و هۆمەری دزەیی و چەند کەسانێکی تر) بە گەلی کوردو میللەتانی دنیا ناسرا.

ئێمەش بە کۆمێنتێک لە ڤیستیڤاڵەکەدا حەمە ساڵح دیلانمان ناساند کە (٤٠) ساڵە خەباتدەکات بۆ پێشخستنی سیاسەت و کوردپەروەری و بەرزکردنەوەی هونەرو ئەدەب و شیعری کوردی و بەندیخانەکانی عێراق شاهیدی قسەمانن.

لە کۆتاییدا مامۆستا عەلی مەردان بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە وتی: خۆشترین کاتەکانی ژیانم ئەم ساتەیە کە ڕۆڵەیەکی کورد خەڵاتم دەکات، کە پیرۆزترین خەڵاتە لەلام .

چەپکێ گوڵی نێرگز بۆ ئێوەی خۆشەویست، ئێمەش توانیمان لە دواساتەکانی ژیانی عەلی مەرداندا دڵی خۆشبکەین.

(٤٠)

# مانگرتنی قوتابیانی ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی

ســاڵەکانی ١٩٦٢و ١٩٦٣ دەســەڵاتداریتی (عەبــدولکەریم قاســم) بەرەوە تــاکڕەویی و دیکتــاتۆریی دەچــوو، پرەنســیپە دیمــوکراتی و ئازادییەکـان زیـاتر پێشـێلدەکران و دەسـەڵات لە حـوکمی گەلەوە، بۆ حـوکمی چەنـد ژەنەراڵێکـی بێئەزمـوون بەڕێوەدەچـوو، زینـدانەکان سیخناخ کرابوون بەخەڵکی ئازادیخوازو نیشتمانپەروەر، بڕاقی گەلی کوردستان تیا دەهـات پتر پەرەیدەسـەند، شـۆڕش کڵپەیسـەندو هەمـوو کوردستانی گرتەوە!

ئەو بەندیخانانەی لە شۆڕشی ١٤ تەمموز چۆڵکرابوون، پڕکرانەوە لە تێکۆشـەرانی کوردو خەڵکی ئازادیخوازی عێراق، چالاکیی حزبی قەدەغەکرا، جموجۆڵی بەئاشکرای حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردسـتان سـنووردارکراو بارەگاکانیـان داخسـتن. حزبـی وەتەنـی دیمـوکراتی (کامیـل چـادرچی) و حزبـی جمهـوری (عەبـدولفەتاح ئیبراهیم) قەدەغەکران، ڕۆژنامەکان زۆربەیان داخران، بـارزانی جارێ شۆڕشـیداو چـووە شـاخ، حزبـی شـیوعی عێـراق کە بەشـێک بـوو لە حوکمی قاسم و پشتگیری لێدەکرد، سیاسەتێکی تەمومژاوی گرتەبەر (تعاون و کیفاح) !!! .

لە زۆربەی شــارەکانی عێــراق و کوردســتان هــانی کرێکــاران و قوتابیانیانـدا بۆ مـانگرتن، بۆ داواکاری پیشـەیی و سیاسـی! لە شـارە گەورەکـانی عێراق میتنگ و کۆبـوونەوەی گەورە بەنـاوی ئاشـتی بۆ

کوردستان سازکران، ئەم چالاکییانە بە شێوەیەکی پۆلیسی و دڕاندانە بەگرتن، نانبڕین و دوورخستنەوە وەڵام دەدرانەوە.

ئێمەی قوتابیانی ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی، مانمانگرت و دەستەیەکم پێکهێنا بۆ بەڕێوەبردنی مانگرتنەکە، خۆیشم سەرپەرشتیم دەکرد ، لە سەرەتادا داواکارییەکانمان پیشەیی بوو بۆ باشترکردنی گوزەرانی بەشە ناوخۆییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندن (مەنهەجی تەعلیمی) هەردوو ئامادەیی پیشەسازیی و کشتوکاڵییەکان و دیاریکردنی چارەنووسی ئەوانەی قوتابخانە پیشەییەکان تەواودەکەن و وەرگرتنیان لە زانکوکانی عیراقدا.

مانگرتنەکە درێژەیکێشاو (١٧) ڕۆژی خایاند، داواکارییەکان بوون بەداواکاری سیاسی، وەکو ئازادکردنی زیندانیەکان و ئاشتی بۆ کوردستان، مانگرتنەکەمان قوتابخانەکانی تری گرتەوە، وەکو ئامادەیی کشتوکاڵ و هەندێ لە قوتابخانە ناوەندییەکانی کوڕان و کچان، زۆرجار دەبوو بە ڕێپێوان و کۆبوونەوەی گەورەو دەچووم بۆ قوتابخانەکان وتارمدەداو هانمدەدان بۆ مانگرتن.

لەمبارەیەوە یاداشتێکم نووسی، باسی مانگرتن و داواکاریەکانم تێداکردبوو، لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ئەوسا بڵاوکرایەوە، لەسەر ئەمە حکومەت (ئەحمەد زرنگ)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەکەیاندا بە دادگا.

ئینجا دەستەیەکمان ڕێکخست لە قوتابییان و سەردانی کەسایەتییە ناسراوەکانی شارمان کرد، وەکو (ئیسماعیل حەقی شاوەیس، شێخ محەمەدی خاڵ، خەتیبی سلێمانی، شاکر فەتاح، سدیق شاوەیس، محەمەد مستەفای پارێزەر)، توانیمان لەمڕێگەیەوە هەموو شار تێبگەیەنین، داوامان لەم کەسایەتییانە کرد فشار لەسەر حکومەت دابنێن و بەدەم داواکارییەکانمانەوە بێن.

حکومەتی ئەوسای سلێمانی کەوتنە سۆراخ و هەڕەشە لێکردمان، لەلایەکیترەوە قوتابیانی لایەنگری هێزێکی سیاسی کەوتنە بەرانگاربوونەوەمان و چەندینجار شەڕو پێکدادان لە نێوانماندا ڕوویداو دەبوو بە شەڕە چەقۆ، چەند کەسێک بریندارببوون، شەوێک لە کۆڵانەکانی سەرشەقام ڕێگرییان لێکردین، لەو شەڕەدا (من، جەلالی میرزا کەریم، سەباح کۆیی و کامیل حەسەن) برینداربووین، لەئەنجامدا بە فەرمانی (وەزیری معارف)ی ئەوسا (من، سەلاح کۆیی و محەمەدی میرزا حەویز) بۆ هەتاهەتایە لە خوێندن بێبەشکراین.

مانگرتنەکە (١٧) ڕۆژی خایاندو درێژترین مانگرتن بوو لە خەباتی قوتابیانی کوردستاندا، پاش ئەوەی هەندێک لە داواکارییەکانمان جێبەجێکران،.وەکو باشترکردنی بەشە ناوخۆییەکان، بە فەرمانی وەزیری معارفی ئەوسا بڕیاردرا یەکەمەکانی پیشەسازی لەزانکۆی تەکنۆلۆجی بەغدا وەربگیرێن.

ڕۆژگار هات و چوو سالّی ١٩٦٤ سەلاح کۆییم لە بنەکەی ئاوەگرد بینیەوە، پێشمەرگەی حزبی شیوعی بوو، محەمەدی میرزا حەوێزم بینی لە ساڵی ١٩٦٧ یان ١٩٦٨ بوو لە بەغداد لەڕێستورانتێک بە بەرگی سەربازییەوە(نائب زابت)بوو، پارەی خواردنەکەشی بۆ دام.

چەپکێک گوڵی نێرگز بۆ ئێوەی ئازیز ، منیش هەتا ئێستە بەردەوامم بە دیدێکی ترەوە.

# (٤١)
# یەکەم سەفەرمان بۆلای بەرێز ئۆچەلان

ساڵی ١٩٩٢ مانگی شوبات... ڕێگە تەڕو تووشیبوو، بەفرو باران ڕێگەکەی ناخۆشکردبوو، ڕەوشی سیاسیی لە باشووری کوردستان ئاڵۆزو تەمومژاوی بوو، بۆشاییەکی گەورەی سیاسیی لە ئارادابوو، دەسەڵات بە دەست (بەرەی کوردستانی)یەوە بوو.

لە دوای ڕاپەڕینەوە کادیرەکانی پەکەکە لەباشوور بلاوبووبووەوە، بەتایبەتی لە هەولیرو دەوروبەری. هیزی چەکداریان لە ناوچەی خواکوڕک و ناوچە شاخاویەکانی سنووری شەقڵاوەو چۆمان هەبوو، کادیرێکی چالاکیان بەناوی (ئازاد حاجۆ) کە ناوی ڕاستیی خۆی (نایف ئیبراهیم) حاجۆ بوو، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی ڕۆژئاوایە، پێوەندی پێوەکردم و داوای لێکردم کاریان لەگەڵدا بکەم، چەند پەرتوکێکی ئۆچەلان و هەندێ ئەدەبیاتی پەکەکەی بۆ هێنام کە بەعەرەبی و کرمانجی نوسرابوون، ئیتر پێوەندییەکە بەهێزبوو وایلێهات زۆربەی کادیرەکانیان لەماڵی ئێمەوە ئیش و کارەکانی خۆیان ڕادەپەڕاند، بەتایبەتی ژنەکانیان وەکو (هاجەر، شیلان و ئەڤین).

هەرلەو سەروبەندەدا لە خواکوڕک سەردانی(ماهیر ولات)م کرد، هەرخۆیشی بەرپرسی یەکەمی ئەو دەڤەرە بوو، ئیتر لەگەڵ (ئازاد حاجۆ، دکتۆر وەیسی، هاجەر، چالاک محەمەدو هەڵمەت محەمەد) کەوتینە گەڕان و بەسەرکردنەوە، زۆر کەسی چەپ و شۆڕشگێڕمان پێناساندن، ئەوان کەوتنە کاری ڕێکخستن و منیش لە دوورەوە کارەکانم هەڵدەسەنگاندو ئەوانیش ڕاوێژیان پێدەکردم.

ڕۆژێــک (ئـــازاد حـــاجۆ) هـــات وتـــی تـــۆو چەنـــد کەســـێکیتر بانگهێشتکراون بۆ لای ئاپۆ لە (دەشتی بیقاع)ی لوبنان، کێ پێشنیار دەکەیت با ئامادەکاریی بکەین، پێکهاتین لەسەر ئەم بەڕێزانە(بەندە، مومتاز حەیدەری، چالاک محەمەد سۆفی، تاریق جامباز، حەکیم) من بە(مومتــاز حەیــدەری)م وت لەوانەیە لە گەڕانەوەدا تووشــی بەڵایەک ببین، با لە ڕێگەی هـاوڕێ کۆنەکانی خۆمـانەوە، پرسـێک بەبەرەی کوردستانی بکەین.

چووینە شەقڵاوە بۆ لای مامۆستا کەریم ئەحمەد، پرس و ڕامـان پێکرد وتی باشبوو ئاگادارتـان کردین، نامەیەکی داینێ بۆ لیژنەی سەرکەزی کە بارەگەکەیان لە دیمەشق بوو. لە دیمەشق چووینە لای توما توماس (ئەبو جۆزیف)، ڕێزێکی زۆری لێگرتین و یارمەتی من و مومتازیشیاندا.

هەر پێشـــی ســـەفەرەکەمان کـــاک (قـــادرعەزیز)م بینـــی، هەنـــدێک پرسیارم لەبارەی بیقاع و ڕەوشی هەڤالانی پەکەکەوە لێکردو وەڵامی پێویســـتی دامەوە، هەروەهـــا هـــاوڕێ (عەزیـــز محەمەد)یشـــمان ئاگادارکرد، وتی بەرەی کوردستانی پێیـان ناخۆشە کوردی باشوور تێکڵاوی پەکەکە بین، ئەگەر تووشی شتێک بوون ئاگادارمبکەنەوە.

هەتا زاخۆ هەڤاڵ کرمـانج و هەڤاڵێکی چاوساغمان لەگەڵدا بـوون، لەوێوە بردیانین بۆ گوندی(دارکاری عەجەم)، بۆ مـاڵی (سـادق عـومەر سـندی) کە هەر خۆیشـی سـەرۆک عەشـیرەتی سـندی بـوو، شـەوی دواتـر بە ڕێگەیەکـی نـاخۆش و هەورازدا گەیانـدیانینە لای هێزێکـی چەکداری پەکەکە نزیکبوون لەو نـاوە، بە چیای بێخیردا سـەرکەوتین هەتـا گەشـتینە سـەر ئـاوەکە لە پێشـخابوور، بەنـاو مـین و ڕەبـایە کۆنەکـــانی ســـوپای عێراقیـــداو بە دزی ئەو هێـــزانەی چـــاودێری پەڕینەوەی سـەر ئاوەکەیـان دەکرد، بە بەلەمێکی لاستیک پەڕینەوە، بەلەمەکە پڕبـــوو لە ئـــاو هاوارمـــان لێهەســـتا، وتمـــان نوقمـــدەبین،

بەلەمەوانەکە وتی کونێکی تێدایە، بیدۆزنەوە و دەست بخەنە سەر کونەکە ئەگینا نقوومدەبین، ئاوا لە دیجلە پەڕینەوە.

بەپێ ڕۆشتین هەتا نزیکی قامیشلو، شەو لە گوندی ڕیحانۆک پشوومانداو، لەوێ چەند گەنجێکی تریش بوون بە هاوسەفەرمان و ئەوانە بڕیاری خۆیانیان دابوو بۆ خولی مەشق و ڕاهێنان دەچوونە ئەکادیمیا و دوواتر دەبوون بە گەریلا.

هەر هەمان شەو بەرەبەیان ماشێنێکیان هێناو چووینە قامشیلو، ئەو ڕۆژە لە قامیشلو ماینەوە، شەو سواری شەمەندەفەر بووین و بەیانی گەشتینە دیمەشق، ئەو شەوە لە دیمەشق لە بارەگایەکی یەکەکە پشووماندا. نیواردیەکی سەر لەزوو بەردو سنووری لوبنان بردیانین، بەڕێگەیەکی پێچاو پێچدا لە نزیک شاخێکی بەرز سەیارەکەیان هێواشکردەوەو وتیان خۆتان فڕێدەن و بەو شاخەدا هەڵزنێن، هەرچەند ڕێگەکە تەڕو تووشیبوو، بەماندووبونێکی زۆر گەیشتینە سەر شاخ. بردنییان بۆ بارەگای بەڕێز ئۆچەلان.

شێوەی ئەو باڵاخانەی ئۆچەلانی لێدادەنیشت لە شێوەی پیتی Hئینگلیزیدا بوو، لەسەرەوە ژورێکی گەورە بۆ پێشوازیی و دیداری میوان، بە ڕاڕەوێکی باریکدا دەڕۆیشتی کە چایخانەو ناندێنی تێدابوو، لەو سەریش هۆدەیەکی گەورە کتێبخانەو جبەخانەو شوێنی حەوانەوەی تێدابوو. من بە شێوەی بارەگای (ئۆچەلان)، (ماو تسی تۆنگ)م هاتەوە یاد، ئەویش بارەگاکەی لەسەر لوتکەی یەکێک لە چیا بەرزەکانی چین بووە.

نزیکەی دوو سەعات و نیو لەگەڵیدا ماینەوە، ئینجا چووین بۆ شوێنی حەوانەوەی خۆمان، ئەو شوێنە پێیانـدەوت (ئەکادیمای سەربازی مەعسوم قۆرقمان)، نزیکەی دە ڕۆژ لە بیقاع ماینەوە، هۆڵێکی تێدا بوو لە شێوەی شانۆی ڕۆمانی، هەموو ڕۆژێک ئۆچەلان چەند کاتژمێر لەو هۆڵەدا سمیناری هەبوو بۆ ئەو گەنجانەی دەچوونە

ڕیزی پەکەکە، نزیکەی ٩٠٠ تا ١٠٠٠ گەنج دەبوون لە کوڕو کچی هەژار، دەوڵەمەند، ئاغا، سەرمایەدار، قوتابی زانکۆکان و بە سەدانیش لە دایکبووی ئەوروپا بوون و لەوێوە هاتبوونەوە.

شەوانیش هەر لەو شانۆیە سیمیناری زانستی و ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقای شۆڕشگێڕی و شانۆگەری پێشکەشدەکران، سیمینارەکانی ئۆچەلان لەبارەی شۆڕش و مێژووی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکان و پەندوەگرتن لە شۆڕشەکانی چین و ڤێتنام بوون، ئەو فێریدەکردن کوردستان و وڵاتپارێزی و پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئازاد بەفیداکاری و گیان بەختکردن نەبێت نایەنەدی، لە سیمینارەکانیدا زور کرنگی دەدا بە سوپای ئازادیی کوردستان، جەختیدەکردەوە کە دەبێت گەریلاو سوپای ئازادیی کوردستان تەنیا پشت بە گەلی کورد ببەستێت. هەر کەسێک لە ئەکادیمیا پێویستبوو ساڵێک لە خولی پەروەردەدا بمێنێتەوە، ئینجا دەبوو بە گەریلا، یان ئەندامی پەکەکە.

لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەی لە ئەکادیمیا ماینەوە، زۆر جاران (ئۆچەلان) لەگەڵ ئێمەدا نانیدەخواردو هەموو دانیشتنێکیش لەگەڵیدا وەکو سیمینارێک وابوو بۆ ئێمەو بەڕاستی گیانی شۆڕشگێڕیی لە ڕۆحماند زیندوکردەوە، لەسەر داوای بەڕێز ئۆچەلان چەند ڕۆژێک لە حەلەب و دیمەشق ماینەوەو کوردی ئەو دوو شارەمان بینی، بە گیانی لەخۆبووردوویی و کوردایەتییان سەرسامبووین.

لە ڕۆژی گەڕانەوەماندا وەکو لە وێنەکەدا دیارە، مەراسیمێکی فەرمی ماڵئاواییان بۆ کردین کە هەموو ئەکادیمیا بەشدابوون تییدا، لەوێ وتارێکمداو سوپاسی ئەو پێشوازییە گەرمەم لێکردن و بەڵێنمدا ئەوەی پێمبکرێت بۆ خزمەتی گەلی باکوور دەستنەگێڕمەوە.

## (٤٢)

# سەفەری دووەم بۆ لای بەڕێز ئۆچەلان

گەشتی یەکەم بۆ لای سەرۆک ئۆچەلان، لە ناوەندی ڕۆشنبیرییدا دەنگدانەوەیەکی بەرچاوی هەبوو، زۆر لەڕۆشنبیرەکانی ئەوسا بە تاسەوە پرسیاری هەر شتێکی تازەی بزاڤی باکووریان لێدەکردم، زۆرینەی پرسیارەکانیش لەسەر خودی ئۆچەلان بوون کە ئایا کاریزمایە یان نا؟ ئایا سەرۆکایەتییەکی نوێیەو سەرۆکایەتی کلاسیکی ئیستەی تیپەڕاندووە یان نا؟

لە ئاکامی زۆری ئەو گفتوگۆیانەدا، باسمکردبوو کە ڕیگە سەختەو ماندووبوونی زۆری تێدایە، بەلام هەر دڵنیایان دەکردمەوە کە گرنگ ئەوەیە بە دیداری ئۆچەلان بگەین و ببینین ئەو داستانە چییە؟ دوای چەند دیدارێک، لەگەڵ ئەم ناوە ناسراوانەی نووسین و ئەدەبیاتدا لە (مانگی ٩ی ساڵی ١٩٩٣) لەسەر سەفەرێک بۆ لای ئۆچەلان پێکهاتین، ناوەکان(حەمە کەریم عارف، دکتۆر ڕەئوف عوسمان و ڕەئوف حەسەن)، هەڤاڵێک بە ناوی کرمانج چاوساغمان بوو.

شەوێک پێش سەفەرەکەمان، کاک شێرکۆ بێکەس کە ئەوکات وەزیری ڕۆشنبیریی بوو، پێوەندیی پێوەکردم و وتی: کاک (کەمال فوئاد) ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نشتیمانی کوردستان دەیەوێت بتبینێت، چاوم پێیکەوت و وتی: ئەتەوێت بڕۆیت بۆ لای ئاپۆ؟ وتم: بەڵێ. وتی هەرچەندە حەزناکەین، بەلام هەوڵێکبدەو پێیانبڵێ سنووری تورکیاو باشووربکەنەوە، چونکە ئەوان ڕێگاکەیان گرتووەو ڕەوشێکی ئابووری خراپ و گرانیی دروستبووە.

هەروەها وتی: مام لە کوردستان نییەو منی ئاگادارکردۆتەوە قسە لەگەڵ تۆدا بکەم، منیش وتم: هەوڵئەدەم. منیش لێم پرسی ئێوە چۆنتان زانی من سەفەر دەکەم بۆ بیقاع؟ وتی یەکێکتان لای کاک (نەوشیروان و کاک عومەر) باسیکردووە!.

بەهەرحاڵ ئێمە بە قاچاغ کەوتینەڕێ، لە زاخۆ بردینیانە ماڵێک و شەو گەیاندیانینە لای هێزێکی چەکداری خۆیان و بەرەو سنوری رۆژئاوا بردیانین، لەوێوە بەرەو قامیشلۆ، هەر بەو ماندووبوون و نارەحەتییەوە گەیشتینە دیمەشق و دواتر بۆلای (ئاپۆ) لە بیقاعی لوبنان.چاوساغەکەمان وتی: بە هیچ شێوەیەک بە عەرەبی قسە مەکەن، چونکە دەوڵەتی سوریا پێیناخۆشە پەکەکە تێکەڵی کوردی عێراق و سوریا ببێت، ئەگەر بازگەکان پرسیان، بڵێن ئێمە کوردی باکوورین و هاتووین بۆ یادی سەرهەڵدانی (١٤ تەباخ - ئەیلول)، ساڵوەگەری لەشکری ئازادیی کوردستان.

ئیمەیان گەیاندە لای ئاپۆ لە بیقاع، ئاپۆش خۆی و قوتابیانی ئەکادیمیای (مەعسوم قورقماز) پێشوازییان لێکردین، پێشتر پێمراگەیاندبوون ئێمە شاندێکی رووناکبیریی بێلایەنین و لە باشوورەوە سەرداندەکەین، ئاپۆ لەگەڵمان کۆبۆوەو بەشداربووین لە سیمیناری ئاپۆ لەگەڵ خولی ئەکادیمیادا، رێگەیاندáین هەریەکەمان وتارو قسەی خۆمان بکەین.شەوانە دەهاتە لامان، گفتوگۆی لە بارەی مێژوو و شۆڕش و سیاسەت و هەموو بابەتەکانی ژیان لەگەڵدا دەکردین، لەگەڵ رەئوف حەسەن کەوتنە باسی ئەستێرەناسی و فەلەک و کونەرەشەکانی گەردوون، چونکە کە (رەئوف حەسەن)م پێناساند، وتم: یەکەم کەسە کتێبی لەسەر خەیاڵی زانستی نووسیوە، ئاپۆ زۆر کەیفی بە شاندەکە دەهات، وتی ئەمە یەکەم شاندی رووناکبیریی کوردییە کە ئاوا بە راشکاوی زانایانە گفتوگۆم لەگەڵ دەکەن و پێشنیارو رەخنەی خۆیان دەخەنەروو.

لە سوێندخواردنی گەریلاکانـدا کە پێیدەڵێن (سۆزداین) بەشداریمانکرد، داواکاریەکەی (مام جەلال)م بۆ کردنەوەی سنووری ئیبراهیم خەلیل پێراگەیاندو پێمانوت باشوور لە رەوشێکی ئابووری خراپدایە، لەهەر چوار لاوە گەمارۆ دراوە، وتی: باشە هەر چەندە مام جەلال (سەرچڵ قەزاز)یشی ناردوە بۆ لام بۆ ئەم مەسەلەیە، داوای لێکردین بەیاننامەیک بنووسین و تێیدا داوابکەین رێگاکە بکرێتەوە، بە

هەر چوارمان ڕەشنووسێکمان نووسی و حەمە کەریم و ڕەئوف عوسمان دایانڕشتەوەو بە هەزاران دانەی لێچاپکراو بە ڕۆژئاواو سوریاو لوبناندا بڵاوکرایەوە، دواتریش ڕێگەکە کرایەوە.

زیاتر لە هەفتەیەک لە بیقاع ماینەوە، دواتر چووین بۆ دیمەشق، لەگەڵ کوردی دیمەشق و حەلەب و چواردەوریدا کۆبونەوەمانکردو قسەمان بۆ کردن.

حمە کەریم و دکتۆر ڕەئوف عوسمان زووتر لە ئێمە گەڕانەوە، من و ڕەئوف حەسەنیش لە شام ماینەوە، دوو ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستانی ئازاد)مان ئامادەکردو ناردمان بۆ چاپخانە، ئەوکاتە لە باشوور ڕێگەیان نەدەدا (پارتی ئازادیی کوردستان) کە یەکەکە لە پشتیانەوە بوون، ڕۆژنامە بڵاوبکەنەوە، لەبەرئەوە لە سوریا چاپیاندەکردو دەیان ناردەوە بۆ باشوورو بڵاودەکرایەوە!!!

هەندێ لە قسە خۆشەکانی مامۆستا ڕەئوف حەسەن:

١) بەڕێز ئۆچەلان بە ڕەئوف حەسەنی وت بۆ ماوەیەک لێرە نامێنیتەوەو قسە بۆ گەل بکەی؟ ڕەئوف حەسەنیش وتی ئاخر من ڕەخنەگری ئەدەبی و سیاسیم و ڕێگە ئەدەی ڕەخنە بگرم؟ ئۆچەلانیش وتی: بەڵێ ئەگەر ڕەخنەکە زانستی بێت.

٢) ڕەئوف عوسمان و حەمە کریم زووتر گەڕانەوە بۆ باشوور، بۆیە ڕەئوف حەسەن پێیوتن ئێوە لە ترسیماڵەوە دەگەڕێنەوە، دەنا هیچ کارێکی تایبەتتان نییە!.

٣) لە گوندێک نانمانخوارد مەسینەیەک ئاویان بۆ هێناین بۆ ئەوەی دەستی پێبشۆین، هەر کەسەو ئاوی دەکرد بە دەستی ئەوی تردا، ڕەئوف عوسمان ئاوی بەدەستی مندا کرد، ڕەئوف حەسەنیش مەسینە ئاوەکەی لێوەرگرت و وتی من دەبێت ئاو بکەم بە دەستی پێنجوێنیدا، تۆ ماوتە بگەیتە ئەو ئاستە!!! بۆپێکەنین، لەبەرئەوەی من پێشتر سەفەرمکردبوو بۆ بیقاع و وێنەو ڤیدیۆم لەگەڵ ئاپۆدا بڵاوبووبۆوە زۆر بە دەوربەری مندا دەهاتن و دەچوون.

هەتا سەفەرێکیتر هەرشاد بن.

## (٤٣)

## حەلاجەکەی قەلاّی هەولێر لە یادمەکەن!!!!

لە هەولێر ماڵم لە گەڕەکی ئازادی بوو، ماڵی عەبدولخالق مەعروفیش دراوسێمان بوو، برادەری و ئاشتنایەتی باشم هەبوو لەگەڵی، جار جار بە ماشینەکەم هاتوو چۆم پێدەکرد، دوکانەکەی (تەکنیکی) بوو بە مەڵبەندی ئەدیب و ڕوناکبیرانی ئەوسا، زۆربەی کاتمان بە گفتوگۆی ئەدەب و سیاسەت لەوێ دەبردە سەر، ئەو پیاوێکی زیرەک و زاناو ئەدیبێکی ڕوشنبیربوو، لەکاری تەکنیکی بەتایبەتی تەکنیکی کارەبایی دەسێکی بالای هەبوو، یەکێکبوو لەوانەی لە شۆڕشی ئەیلول ئێزگەی دەنگی کوردستانیان دامەزراند.

کتێبە بەناوبانگەکەی (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا) کە بڵاوبووەوە، لە هەندێ لە مزگەوتەکانی هەولێرەوە هێرشکرایە سەری، بە مولحیدو لادەر لە قەڵەمیاندا، دائیرەی ئەمنی ئەوسای شاری هەولێر کەوتنە چاودێریکردن و هەڕەشەکردنی، ئیتر هەر چی ڕۆشنبیری شاری هەولێر بوو بەدوای کتێبەکەی دەگەڕان و لە کتێبخانە نەما، لەو ڕۆژانەدا لەمزگەوت و لە کۆڕە ئەدەبیەکان و لەلای دەزگا هەواڵگریەکانی دەوڵەت، باس باسی کتێبەکەی عەبدولخالق بوو، هەندێ بە ئازاو بوێریان لەقەڵەمدا، هەندێکیش بە مولحیدو تەکفیریان دەکرد، هەتا ڕۆژێک لە بەردەرگاکەی خۆیان دایانە بەر دەستڕێژی گوللەو شەهیدیان کرد، حەلاج ئاسا خەڵتانی خوێنیان کردو بووە شەهیدی فیکرو وشە.

هەر ئەوکاتە هۆمەری دزەیی کە دراوسێم بوو بە شڵەژاوی هات و وتی وەرە عەبدولخالقیان کوشت، کە چوینە سەری لە ناو خوێن ئەتلایەوە، لەگەڵ خەڵکی بەرەو مزگەوت بردمان و لە گۆڕستانی پیرداود بە خاکمان سپارد، ئەم دیمەنانەو یادگارەکانی کۆن و تازەو

شـەهیدبوونی حەلاج ئاسایی و هەڵوێستی بوێرانەو کارە ئەدەبی و زانستیەکانی لەلای من بوو بەم قەسیدە شیعریە.

هەر لەو کـاتەدا کـۆنگرەی مێژوونوسـانی عەرەب کە زانکـۆی سەلاحەدین سازیکردبوو، زۆربەی زاناو مێژوونووس و ڕۆشنبیری عەرەب و عێراقـی و بیـانی تێیـدا بەشـداربوون، ڕۆژی سـێهەمی کۆنگرەکەیـان کـردە ڕۆژی شـیعر، کە ئەیکـردە سـێهەم ڕۆژی شەهیدبوونی عەبدولخالق.

ئێمەش بەم چامەیە بەشداریمانکرد (حەلاجەکەی قەڵای هەولێر لە یـادمەکەن)، ئیتـر کە نـاوی عەبـدولخالق هـات وەکـو شـەهیدی هـزرو وشە، لەناو کۆنگرەکەدا بووە مقۆمقۆو پرسیارکردن، جێگەی سەرنج و سەرسامی ئەدیبەکانی ناو کۆنگرەکە بوو، عەبدولخالق کێیەو بۆچی تیرۆرکراوە.

ئێـوارە لە مەڵبەنـدی زانکـۆ دانیشـتنێکیان ڕێکخسـتبوو، لەسـەر مێزەکەی ئێمە کامەران موکری و دکتۆر کامیل بەسیرو دکتۆر مـارف خەزنەدارو مەسـعود مـحەمەدو مەلا جەمیلـی ڕۆژبەیـانی و چەنـد کەسایەتی ڕۆشنبیری تریش ئامادەبوون.

لەو کاتەدا سـەردار میران هـات و وتـی هەندێ برادەرانـی عەرەب ئەیانەوێ لەسەر ئەو شیعرە قسـەیان بۆ بکەی، وتمان فەرموون. کە هاتن ئەوانەی لە بیرم بێت (محەمەد سالح بەحر علوم، دکتۆر شـاکر خەسباک، دکتۆر موحسن موسەوی) و چەند کەسێکی تر.

پرسیاری عەبدولخالق و هـۆی تیرۆرکردنەکەیان کرد، وتیان ئەم کەسە کێیە کە تۆ بە حەلاج و سوقرات و ژاندارکت چواندووە، وتـم ئەوە شەهیدی فیکرو هەڵوێستە، لەگەڵ ئەو قارەمانەنەی مێژوودا هیچ جیـاوازیی نییە، داوایـانکرد بۆیـان بـکەم بە عەرەبی، دکتـۆر مـارف بەڵێنیدا کە ئەو بیکات، بەڵێنەکەی بەجێهێناو کردی بە عەرەبی و لە گۆڤارێکی بەناوبـانگی ئەدەبـی جەزائیـری بڵاویکـردەوە. لە گۆڤـاری (الثقافـة الجدیـدة) کە حزبـی شـیوعی عێراقـی لە دیمەشـق چاپیـدەکرد

بڵاوکرایەوە، لەو دانیشتنەدا دکتۆر کامیل بسیر بەڵێنیدا شتێکی لەسەر بنوسێ، خۆشم لە گۆڤاری نوسەری کوردا لەژێر ناوی (ڕەوا)دا بەناوی (شاری گڕ) بڵاومکردەوە، وەرگێڕانە عەرەبیەکەی لە ژێر ناوی (مدینة اللهیب) دابوو .

حەزدەکەم هەڵوێستی جوامێرانەی مێژوونووسی گەورەی کورد مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە کۆنگرەکەدا باسبکەم، مێژوونوسێکی عەرەبی شۆڤێنی هەیە بەناوی یونس ئەلسامەرایی، لە کۆنگرەکەدا زۆر ئاماژە بەکتێبەکانی دەدرا، لە یەکێک باسەکانیدا زۆربەی هۆزە کوردەکانی بەعەرەب لە قەڵەمداوە، مەلا جەمیل کتێبەکەی ئەوی بە دەستەوەگرت و وتی (الجاهل مثل یوسف السامرائی) هەرچی نەڵی لە بارەی هۆزە کوردەکانەوە، هەمووی درۆو دەلەسەیە، ئەم شۆڤێنیە دژی کوردە،.ئەو هەڵوێستەی مەلا جەمیل هەرایەکی لە کۆنگرەکە نایەوە.

ئێنجا ئەمە دەقی شعرەکەیە :

**شاری گڕ.......**

شاری گڕم
خەڵکی گڕم .. خەڵکی وڕم !..
بیر کڵۆڵە گیرۆدەیە
کۆستێکی زل و قەبەیە
زانین بەندە ژێر داماوە!..
ئەهریمەنە لە مەیدانا ئەسپی تاریکی تاوداوە!...
شمشێری تیژی ژەهراوی لێ ساوداوە!!.
واکڵۆڵی فەلسەفەیە
ڕووبار بەرەوژوور ئەچوێنن!....
ئەیانەوێ خولی زەمین بوەستێنن

پێچکەی مێژوو شەق و شڕە!.....
لەجێی خۆیدا پەرتەڕناشە.......!
خولانەوەی وەک بەرداشە......
خەڵکی وڕە خەڵکی کڕە
بەری پڕشنگی ڕۆژی گەش ،
خەفە ئەکەن بە خەرقەی ڕەش!
یان بە بێژنگ ئەیتارێنن!!
وەکو بایەقوش دەخوێنن!...
واکلۆلی فەلسەفەیە
کۆستێکی زل و قەبەیە
سوکراتیان بەدەرمان مراند!...
بەژەهری مار ،
گیانیان لێ ساند..
بەلام بیری زەق و زندووی
بۆ نەوەمان!..
جیل لەدوای جیل..
جار لەدوای جار
سوکرات وتی:
من شەهیدی دیموکراتیم ،
با ژەهریشم دەرخوارد بدەن،
لەویژدانی خەڵکا ئەژیم!..
من بیردۆزی دیمۆکراتیم
من سوکراتم
ئاگر خۆشکەری خەباتم!

****

**گالیلۆ**

..........

وازەوی یەو هەر ئەسورێ و ئەخولێتەوە!..

با حەپسم کەن برسیشم کەن

سەرم لەلاشە بێتەوە

زەمین هەر ئەسورێتەوە!....

زەمین هەر ئەسورێتەوە!.....

****

**ژان دارک**

............

کەسوتاندیان ،

ووشەکانی بوون بە خەرمان!..

بوون بە ئاگر....

تەمی تاریکی ئەرەوان

بیری رۆشن

لەسەر زەوی بوونە خۆراک

بوونە هەوێن بووبوونە ماک....

ژاندارک وتی:

وازلە "ئازادی هێنانم"

واز" لەژینە"

چڵ و چێوەکەی سوتاندم

بۆ هەموو مرۆڤ پەرژینە

روناکییە، گرە، تینە !...

**حەللاج**

...............

کە حەللاجیان وەک بەرخی نێر سەربڕی
پەڕە پەڕە ئینجیل و تەوراتیان دڕی !..
جارێ دەست و جارێ پێیان لێ ئەقرتان...
خوێنی تکایە سەر زەوی
بوو بە ئایەت بوو بە قورئان
کەسەریان لە لاشەی قرتان
ئەیووت منم راستی ژیان!..
منم ماف و ڕەوای ئینسان
کە دەست و پێیان دەقرتان

***

**عەبدولخالق**

...............

هەرچی ڕق و کینە هەبوو
لە مرۆڤ و خەڵکی نەبوو..
ئەوەی هەیبوو دڵسۆزی بوو
زانست پەرست بیردۆزی بوو
بۆ کوردی بوو بۆ هۆزی بوو
ئەیووت:
ئافرەت مرۆڤە وەکو پیاو
جیاوازی نێوانیان ووشەیە...
ئەویش لەژینا سەربەستە
خاوەنی ئارەزوو و هەستە!....

* * *

چونکە کەدیم سەعاتەکەی ڕاوەستاوە
لەجێی میلی سەعاتەکەی گوللە لەناویا چەقاوە!....
بۆ دادگاکانی تەفتیش و
بۆ سەدەکانی ناوەڕاست هاتمە دوواوە!...
وا کڵۆڵی فەلسەفەیە
کۆستێکی زل و قەبەیە
ژیر لە مێشکدا تەزیوە
بیر لە مێشکدا ڕەچیوە
ئینجا ئێوەش
میلی سەعات بگێڕنەوە
سێ هەزار ساڵ
بگێڕینەوە بەرەوە دواوە
پەڕەی ساڵنامەکان ئاوەژووکەن
دەی سا زووکەن!...
لێی بنوسن: واکڵۆڵی فەلسەفەیە
کۆستێکی زل و قەبەیە
بۆ قۆناغی
ناوەڕاست بگەڕێنەوە

***

بێنەوە بۆ شاری گڕ!!..
بۆ خەڵکی کاس بۆ خەڵکی ووڕ
زوو بێنەوە
بەڵام هەرگیز ڕقی پیرۆز لەیاد مەکەن
حەللاجەکەی قەڵای هەولێرا!...
لە یاد مەکەن ..... لەیاد مەکەن.
..........................................

ئەم شــيعرە پێشــتر لە کۆڕێکــدا خــوێنراوەتەوە، ئامــادەبوانی کۆڕەکەی جۆشـداوەو بـۆتە هوتافکێشـان و سـرودی نەتەوەیـی ئەی ڕەقیب ئاسـمانی نێـو هـۆڵەکەی کەڕکـردو دوژمنـی بەعسـی شـپرزە کردووەو گرتن و تێهەڵدان لەلایەن پیاوانی ڕژێمەوە دەستپێکردووە، لەو ڕۆژەوە شـیعرەکە بـڕا بە بـاڵای عەبـدولخالقی شـەهیدی دەسـتی غەدردا، درووود بـۆ گیـانی پـاکی... ڕۆژی شــەهیدبوونی ١٩٨٥/٤/١٠ بەڕۆژی کڵـۆڵی فەلســەفە دەبینــین (ئەم پـارچە نوسـینەی کۆتـای لە پەیجی فەرمی قادر شکاکەوە وەرگیراوە).

## (٤٤)

# شادبوون به دیداری کوردۆلۆژی
# مەزن تۆفیق وەهبی

به هــاورێیەتی جــوانەمەرگ (کــاوەی شــێخ حەفیــد) گەشــتی ئەوروپامــان کــردو سەرگوزشــتەو یادگــاریی ناوازەمــان هــاتەرێ، کە شــایەنی گێــڕانەوەو تۆمــارکردنن، له (مــانگی ٦ ســاڵی١٩٧٩) چــووینه لەندەن، هەندێ پشکنینی دکتۆرم کردو ئۆپەراسیونی پەردەی گوێم بۆ کرا، دکتۆر پێیوتم هەتا سێ مانگ نابێت سواری فڕۆکە ببم، بۆیە ماوەیەکی زۆرمان بەدەستەوەبوو، مۆزەخانەکان و شوێنه گشتییەکان و ئەو کوردانەی لەوێ دەژیان وەکو: (شێخ بابه عەلی، میر تەحسین ئێزیدی و تۆفیق وەهبی بەگ)مان بەسەرکردەوە، درەنگانی ئێوارەیەک چووینه سەردانی (تۆفیق وەهبی)، دەرگاکەیان کرابووەوە، شێخ کاوه یەکســەر خــۆیکرد بەژووردا، تۆفیــق بەگ و خێــزانەکەی لەهــۆڵەکە دانیشـتبوون، ئەمـلاو ئەولای کاوەیـان مـاچکرد، وتـم (لێم ببورن کاک کــاوه ئــاوا ڕێکیخســت، خۆمــانکرد بەژوورا بەبــێ له دەرگەو ئاگادارکردنەوە)... وتیان ئێمه ڕاهاتوین لەم جۆره سەردانانه!

شێخ کاوه، ناساندمی و وتـی ئەمه پێنجوێنیه، شـاعیره، شـیوعییەو مـودیری نـاحیەی گەرمـکه لای پێنجـوێن، تۆفیـق بەگ به پێکەنیـنەوه وتـی: کـوڕم حزبەکەتـان سـاڵەکانی ١٩٥٨و ١٩٥٩ له ڕۆژنامەکەیانـدا (ئتیحاد ئەلشەعب) دەیاننووسی: تۆفیق وەهبی بەکرێگیراوی ئینگلیزه، من ئەو کاته پێڵاوەکانم دڕابوون پارەی جوتێ پێڵاوم پێنەبوو.

ئینجـا کەوتیـنه باسـی پێنجـوێن و هەواڵپرسـین، وتـی که (شـێخ مەحمـود) لەوێ بـوو مـن چەنـد جارێـک هـاتم بـۆلای، ئەو کـاته له

پێنجـوێن چەنـد ماڵێـک دیوەخانییـان هەبـوو، ئـێمە شـەوێک لە مـاڵی مـاوینەتەوە، ئینجـا لەتەک مـن دەسـتیکرد بە ئاخـافتن، وتـی: پێنجـوێن شـێوەزاری تـایبەتیی خـۆی هەیە، وتـم: بەڵـێ وایە، چـونکە پێنجـوێن سنوری بە هەورامـان، مەریوان، سنەو سـەقزەوەیە، واتە شێوەزاری هەورامـی و ئەردەڵانـی و مـوکری تێکەڵاوبـووە. زۆر بە دیقەت گوێی لێگـرتم و هەنـدێ پرسیاریشـی لێکـردم، پاشـان کەوتە باسـی ئیـدارەو کـارگێڕیی!! وتـی کە موسـتەریفی سـلێمانی بـووم، حـوکمەت هەتـا عەربەت دەسـەڵاتی هەبـوو، ئیتـر سـنورەکانی پێنجـوێن و مـاوەت و تەویـلە، عەشـایەر حـوکمی دەکـرد، لەبەرئەوە گەرایـن کەسـێکی بە دەســەڵات و ئازامــان کـرد بە مــودیر نــاحیەی عەربەت، حکـومەت دەسەڵاتی تا پێنجوێن پێدا، ئەگەر هەڵەنەبـم ئەو کەسـە سـلێمان خـانی جـاف بـوو، ئەویـش بە مەرجێـک رازیبـوو، وتـی: هەتـا کـوێ بـزن و مەڕەکـانم لە کوێسـتانەکان بڕبکـات و بلەوەڕن، ئەو نـاوە بخـرێتە نـاو نەخشـەی عێراقەوە، دەنا ئەم دەسەڵات و پۆستەم ناوێت.

ئەو (لوتە) کە لەسەر نەخشـەکە دیـارە چـۆتە نـاو ئێرانەوە لەسـەر داوای سـلێمان خـان بـوو، کە پیـاوێکی نەخـوێنەواریش بـوو، وا دیـارە ئەو کەسە هەرسلێمان خان بووە، چـونکە ئێسـتەش گونـدی (میشـیاو) هی (حەمە سدیق خان)ی کوڕیەتی.

تۆفیـق بەگ وتـی ئەو کـاتەی مـن موسـتەریفی سـلێمانی بـوم، پێشنیاری کارگەی شەکرم کردبوو کە لە چەوەنەر دروستبکرێت، بۆ ئەمە شارەزورم هەڵبژارد بۆ کێڵگەی چەوەنەر، بۆ ئـاودانی پێشـنیاری بەنـداوی کەوڵۆسـم کـرد، واتە پرۆژەیەکی پیشەسـازی - کشـتوکاڵی تەواو، کە بژێوی سەدان خێزانی تێدا مسۆگەربکرێت.

ئەمە لەوەوە هـات مـن باسـی ئەوەم بـۆکرد کە سـلێمانی فـراوان بـووە، خەریـکە لەگەڵ سـەرچنار تـێکەڵ دەبێـتەوە، تۆفیـق بەگ وتـی:

کارگەی چیمەتۆش هەر پێشنیاری منەو کارگەی جگەرەش هەر لەو پێشنیارانەیە لەسەردانمدا بۆ ماوەت و شاربازێر بیرم لێکردبۆوە، ئەگەر کارگەیەکی جگەرەش لە سلێمانی هەبێت ئەوا توتنی ماوەت و دۆڵی شاوەرو پێنجوێن بەکاردەهێنین و هەزاران خێزان ئەبوژێنێتەوە، ئەم پێشنیارانە ئێستەش لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقدا ماون.

چەند جاری تر چوووینەوە سەردانی، من چەند پرسیارم ئامادەکردبوو لێیبکەم، وتم وتارێکی جەنابتم لە گۆڤاری گەلاوێژدا خوێندۆتەوە، پێشنیازدەکەی سێ تونێل بکرێت لە چیای ئەزمەڕو گویژەوە. تا رەشەبای سلیمانی کەمبکرینەوەو هەواگورکیش لە نیوان سلێمانی و شارباژێردا دروستببێت.

وتی: پسپۆڕە بەریتانییەکان بۆ منیان پێشنیاریان کردبوو، پێیانوابوو ئەو هەوا گەرمەی لە شارەزوورەوە دێت تا تاسڵوجە دەڕوات و دەگەڕێتەوە، ئەو هەوا گەرمەی هاوین دروستدەکات، بەڵام ئەگەر تونێلەکان هەبێت ئەوا هەوا گەرمەکە بەرەو شارباژێر دەگەڕێتەوە. من پرسیاری زۆرم لەسەر بنەچەو مێژووی کوردو زمانی کوردی و هەتا چارەنووسی کوردیش وەکو نەتەوە لێکرد؟

زۆر بە کورتی وەڵامەکانی دایەوەو وتی من لەگەڵ تیۆرەکانی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ڕووسی (مینۆرسکی)م، ئێمە پاشماوەی ماددەکانین، زمانی یەکگرتووی کوردی نابێت، تا دەوڵەتی کوردی نەبێت، ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ئێمە خزمەتی زمان نەکەین، وتی: دەبێت هەوڵبدرێت، زارەوەکان تێکەڵبکرێن، هەر لەسەر پرسی زمان، وتی: ڕۆژێک کۆڵبەرێکی فەیلیم بانگکردو لێمپرسی: تۆ بە کۆڵبەری ڕۆژی چەند پارە پەیدا دەکەیت؟ وتی: ٥٠٠ فلس تا ٧٥٠ فلس. منیش وتم، ڕۆژی یەک دینارت دەدەمێ وەرە تۆ بە فەیلی قسەم بۆ بکە، بۆ ئەوەی فێری لوڕی ببم، من ئەوەندەم لێدەپرسی هەتا ڕۆژێک هات

وتـی ئەوە دینـارەکەت تـۆ لە کـۆڵبەرییەکە زیـاتر ئـازارم دەدەی، مـن ئەمەم بۆ عبدولڕەزاق فەیلی گێڕایەوە وتی ئەو حەماڵە خزمی منە.

هەر لەسەر پرسی زمان وتی ئەگەر کورد دەوڵەتی خۆی نەبێت، زمانی کوردی دروستنابێت، بۆ چارەنوسی کورد وتی: مەسەلەی ئێمە کەوتۆتەدەسـت دەوڵەتە گەورەکـان و نەتەوە یەکگرتوەکـان، بـوونی دەوڵەتی کوردی گرێدراوی بوون و نەبوونی بەرژەوەندی ئەوانە لە ڕۆژهەڵاتـی ناوینـدا، یـان ئەوەتـا خۆمـان یەکگرتـوو بـین و بڕیـاری خۆمان بدەین، ئەبین بە دەوڵەت.

وتـم بـۆ ئینگلیـز پـارچەتی کـوردی نەدا، بـۆ بە دەوڵەت بـوون؟ بـۆ پشگیری شێخ مەحمودی نەکرد؟ وتـی: شێخ مەحمود لە بەینـی دوو تاشـەبەردا بـوو، تـورک و ئینگلیـز، شـێخ مەحمـود بە گەڕانەوە بـۆ زهنیەتـی موسـڵمانێتی و ئـایینی تـورکی هەڵبـژارد، ئینگلیـزیش بـوونی دەوڵەتـی عیراقـی بەلاوە گرنگتربـوو تـا کـورد، چـونکە ئینگلیـز تـازە ڕزگــاری بووبــوو لە دەوڵەتــی خیلافەتــی ئیســلامی عوســمانی، نەیاندەویست دیسان دەوڵەتێکی ئیسلامی دروستببێتەوە. هەر بە فیتی ئینگلیـز بـوو ویلایەتـی موسـڵیان خسـتە سـەر دەوڵەتـی عیـراق بـۆ ڕاگرتنـی بـالانس لە بەینـی شـیعەو سـونە، کـورد بـوو بە قوربـانیی. ئینگلیز عێراقی بەهێز کرد لەبەرخاتری نەوت و سامانی تری عێراق.

من سودێکی زۆرم لەو پیاوە مەزنە بینی و هەر لەو کاتەدا مەجید خـانی حەمە ڕەشـید خـانی بـانە لەوێ بـوو، سـەردانی (میر تەحسـین ئێزیدی)مان کرد، لە بارەی ئایینەکەیانەوە، سـوودی زۆرم لێوەرگرت، ئەمانەو پرسیارەکانی تۆفیق بەگ بە درێژی باسدەکەین.

من و شێخ کاوە لەگەڵ (سروشـت)، کوڕی تۆفیق وەهبی، بووین بە برادەر، زۆر شوێن گەڕاین. سروشت پسـپۆڕی لە مۆسیقا هەبـوو لەگەڵ تیمێکی سەمفۆنیادا کاری دەکرد.

به یاوەری شێخ کاوە، چەند جارێک چووینە سەردانی هەردوو کەسایەتی (غولام خانەقینی و حاجی عەبدوڵای زەهاوی)، شێخ کاوە ئەوانی دەناسی و بووبوون بە برادەرمان، هەر بەهۆی ئەوانیشەوە سەردانی (سامی عەبدولڕەحمان)مان کرد، دوای چەند سەردانێک، سامی عەبدولڕەحمان دوای لێکرین کاری لەگەڵ بکەین (پارتی گەل). ئەمانە هەریەکە چیرۆکی خۆی هەیە ناوبەناو باسیان دەکەین.

بەداخەوە تۆفیق وەهبی ڕۆژی ١٩٨٤/١/٥ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، ١٩٨٤/١/١٥ تەرمی خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبیان هێنایەوە سلێمانی، لە چیای پیرەمەگرون لەسەر وەسیەتی خۆی بە خاک سپێردرا، ئێمەش لەگەڵ شاندێکی نووسەران لەوێوە هاتین لەو مەراسیمەدا بەشداریمان کرد. ئەوەی لە یادم بێت (مام جەلال) لە لوتکەی پیرەمەگرون هاتە خوارەوە، لەسەر گۆڕەکەی وتارێکی ئاگرینیدا. مامۆستا جەمیل ڕۆژ بەیانی وتارێکی بەنرخی مێژوویی لەسەر گۆڕەکەی خوێندەوە، تۆفیق وەهبی، بە زاناو یەکەم کوردناس لەقەڵەمدا، هەروەها نەوشیروان فواد مەستی وتاری بنەماڵەی خوێندەوە ..

هیوادارم حکومەتی هەرێم بیرێک لەو پێشنیارانەی تۆفیق وەهبی بکاتەوە، کە کاتی خۆی پێشنیاری کردوە بۆ حوکمەتی عێراق بۆ پتەوکردنی پێگەی ئابووری کوردستان. .

هەر شاد بن تا چیرۆکێکی تر.

# (٤٥)
# کۆنگرەی مێژوویی نەتەوەی کوردو کوردستان لە شاری لۆزان

مانگی (٤ ساڵی ١٩٩٢) گەیشتمە شاری میونشنی ئەڵمانیا، لەگەڵ بەڕێز (ئاپۆ) پێکهاتبووم، کە هاوکاری کولتووریی و ڕوناکبیریی بکەم، دەمزانی ئەم کارە کولتووریانە زیاتر تێکەڵاوی خەباتی سیاسیی دەبن، چونکە قۆناغە مێژووییەکەی کورد وا دەخوازێت، ئەو کاتە هەڤالان (بیرو) یەکی بچکولانەیان لە شاری (بون) هەبوو، کە کاری ڕۆشنبیرییان تیدا ئەنجامدەدا، ئەو بیرۆیەیان بە من سپارد، ڕێکخستنێکیان هەبوو بە ناوی (یەرەکەوە) واتە (یەکێتی ڕۆشنبیرانی ولاتپارێزی کوردستان).

کۆنفرانسێکمان بۆ ئەم ڕێکخراوە لە شاری بۆن سازکرد، لەو کۆنفرانسەدا بڕیاردرا ئینستیتوتی کوردی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو، کولتوور، بزاف و ڕێکخراوەی سیاسیی کوردی دابمەزرێت، لە (٢٢ی نیسانی ١٩٩٤)و ساڵوەگەڕی ڕۆژنامەگەریی کوردی، ئینستیتوتی کوردی لە بەرلین کرایەوە، من و دکتۆر عیسمەت شەریف بوین بە هاوسەرۆک.

پاش چەند کۆبونەوەو کۆنفرانس و ڕاوێژکردن بەکەسانی شارەزا، بە تایبەتی ئەوانەی لە بەرلین بوون، بۆ نمونە: (دکتۆر جەمال نەبەز، دکتۆر حەسەن عەلی و حەسەن حوسناوی)و چەند کەسێکیتر، ئەرک و کاری خۆمان بەمجۆرەی خوارەوە ڕێکخست:

- گرنگیدان بە مێژووی کوردو کوردستان.
- گرنگیدان بە زمانی کوردیی و هەوڵدان بۆ زمانێکی یەکگرتوو و ڕێکخستنی ڕێنوسی کوردی.

• گرنگیدان به کولتووری کوردیی به گشتی و وەرگێڕان بۆ زمانە ئەورووپییەکان بە تایبەتی زمانی ئەڵمانی.

بۆ ئەم بابەتانە کۆمسیۆنی تایبەت پێکهێنران، مێژوو: دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، زمان: دکتۆر حوسێن کارتاڵ، ئەدەبیات: بەندە، سوسیۆلۆگ: سەلیم فورات.

کەوتینە خۆمان، کۆنفرانسمان لەئەورووپاو شارەکانی وەکو بەرلین، پاریس، ئەمستەردام و ستۆکهۆڵم ڕێکخست.

لێرەدا باسی کۆنگرەی مێژوویی کوردو کوردستان دەکەم کە لە سویسرا لە شاری لۆزان بەستمان، کۆنفراسەکە سێ ڕۆژی خایاند، بەچاودیری سەرۆکی شارەوانی لۆزان ئەنجامدرا، ئەو زاناو پرۆفیسۆرو شارەزایانەی لەسەر مێژووی کوردو دۆزی کورد لێکۆڵینەوەیان هەبوو و گرنگییان بە مەسەلەی کورد دابوو لە ڕوسیاو ڕۆژاوا، زۆربەیان بانگکرابوون و سیمیناری خۆیان پێشکەشکردو گفتوگۆی تێرو تەسەلیان کرد.

لەو کەسایەتیانەی بەشداربوون زانای گەورەی ڕووس (پرۆفیسۆر لازاریف، پرۆفیسۆر هەسرەتیان و پرۆفیسۆر شیگالینا)، کە لێکۆڵینەوەکانیان جێگەی بایەخپێدان بوون، ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام لێکۆڵینەوەی پرۆفیسۆرێکی ئینگلیز بوو، لە لەندەن مامۆستای مێژوو بوو، باسیکرد کە زۆربەی ئەو گەڕیدەو شوێنەوارناسانەی لەسەر کوردو کوردستان نووسیویانەو کتێبیان چاپکردووە، سیخوڕی دەزگا هەواڵگرییەکانی ڕۆژئاوا بوون، لەبەرئەوە شێوەی نازانستی و ناڕاستی بەکارەکانیانەوە دیارە، ئەو بەپێویستی دەزانی زاناو دانای کورد مێژووی خۆیان بنووسنەوە. چەند نووسەرێکی باکوورو گەلێکی تر کە ناوەکانیانم لە یادنەماوە، وتاریانداو بابەتی باشیان پێشکەشکرد.

دیبەیتێک بە بەشداری دەیان نووسەری گەورەو ناو بەدەرەوەی جیهانی، لە ساڵۆنی ئەو کۆشکەدا سازکرا، کە پەیمانی شوومی لۆزانی

تێدا واژۆکرا، ئێمەیش پەیمانی لۆزانمان لە ویژدانی گەلی کورددا پووچەڵکردەوە.

بە ئاهەنگی گەورەو بە ڕێپێوان بە شەقامەکانی لۆزاندا بە خەڵکی سویسراو جیهانمان ڕاگەیاند گەلی کورد بەو پەیمانە هەموو مافێکی زەوتکرا.

ئەو وتارو لێکۆڵینەوەو سیمینارانەی کۆنگرەکە هەرکەس بە زمانی خۆی و بەکوردیش لە گۆڤاری (لێکۆڵینەوە)، کە زمانحاڵی ئینستیتوت بوو، وەک کتێب چاپکران، بەشێکی دەنێردرانەوە بۆ تورکیاو باکوور. ئەمە مشتێک بوو لە خەرمانی ئەو کارە نایابانەی ئینستیتوتی کوردی بەرلین.

هەوڵدەدەین بە گوێرەی دەرفەت چیرۆکی پرمانای تر بخەینە بەر دیدی ئازیزان هەتا چیرۆکێکی تر هەر شاد بن.

● شایانی سەرنجە لە پەیمانی لۆزان، ساڵی ۱۹۲۳ کوردستان لە دوو پارچەوە کرا بە چوار پارچە.

● ساڵ یادی ڕۆژنامەگەریی کوردی پیرۆز بێت لە هەموو خەڵکی کوردستان، درود بۆ گیانی پاکی ئەو ڕۆژنامەوانانەی لەپێناوی گەیاندنی ڕاستیەکاندا گیانی خۆیان بەخشی.

# (٤٦)
# ئنسیکلۆپیدیا (Encyclopedia)ی
# کوردو کوردستان

پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی ولات (پەکەدەوە PDKW) وەکو ئەدرێسێکی سیاسی و دیپلۆماسی، رۆڵێکی گرنگ و کاریگەریی لە ناساندنی دۆزی کورد و مافە رەوا نەتەوەیی و مرۆڤایەتییەکەی بە دنیاو ئەوروپا بەتایبەتی هەبوو!!!

هەرشەش مانگ جاریک کوبوونەودی گشتیی لە پایتەختی ولاتیکی ئەوروپا دەکرا، رۆژانی کۆبونەوەکان دەبوونە جێگەی بایەخپێدانی ئەو ولاتە و رۆژەڤی میدیایی بە چاک و خراپەوە، لەو لاشەوە دەوڵەتی تورک دەکەوتە پرۆتستۆکردن و هەرەشەکردن لەو ولاتانە، ئەوانیش وەلامیاندەدایەوە، دیسان دۆزی کورد دەبووەوە هەواڵی سەرەکی لە میدیاکانەوە، جگە لەمە کۆمسیۆنی دەرەوەی (پەکەدەوە) دەکەوتە چالاکیی دیپلۆماسی و تێکەڵیی چێکردن لەگەڵ پەرلەمانتارو دیپلۆماتکارو میدیاکاراندا.

کۆبوونەوەیەکمان لە مۆسکۆ کرد، لە هۆڵی فەرمیی(دۆما)ی روسی، واتە پەرلەمانی روسیا، کە جاران پێیاندەوت ئەنجومەنی سۆڤیەتی بالا، جێگری سەرۆکی پەرلەمانی روسیاو هەموو سەرۆک فراکسیۆنەکان، بە حزبی دەسەلات و ئۆپۆزسیۆنەوە ئامادەبوون، دوو سەرۆک حزبی ئۆپۆزسیۆن ئامادە بوون زیگانۆف و جرینۆفسکی (چەپ و راست).

ساڵی ١٩٩٦ بوو (یەلتسن) سەرۆکی روسیا بوو، لەم کۆبوونەوەیەدا دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی و دکتۆر جەبار قادرو بەندە ئامادەبووین، لە هەمانکاتدا ئەندامی پەکەدەوەو ئەندام و

بەڕێوەبەری (ئینستیتوتی کوردی بەرلین) بووین، سەردانی هەندێ شوێنی زانستی و کولتووریمان کرد، لەوانە پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسیی مۆسکۆ، دکتۆر جەبار قادر لەم پەیمانگایە خوێندنی تەواوکردبوو، بڕوانامەی دکتۆراکەیشی هەر لەوێ بە دەستهێنابوو، کە چووین زۆر ڕێزی تایبەتییان لێنان، مامۆستاکان کە یەکێکیان ئازەری بوو ئەویتریش زانای گەورە لازاریڤ بوو، بە بینینی دکتۆر جەبار زۆر کەیفخۆش بوون، چووینە لای سەرۆکی پەیمانگا پرۆفیسۆر (ڕیباکۆف)، دکتۆر عیسمەت باسی هاتنمان و کۆبوونەوەکەمانی بۆ کرد، دکتۆر جەبار وەرگێرانیدەکرد بۆ روسی و نیمەی پیناساند کە بەناوی نینستتیوتی بەرلینەوەد هاتوینەتە سەردانیان. دکتۆر عیسمەت بە درێژی باسی کارەکانی بۆ کردن، ڕیباکۆفیش وتی: ئامادەین پێکەوە کاربکەین و بافەرهەنگێکی ئینسکلۆپیدیایی دەربارەی کوردو کوردستان بئافرێنین، بۆ ئەمە پرۆتۆکۆلێک واژۆکرا.

دوای کۆبوونەوەکانی پەکەدەوە چەند ڕۆژێک لە مۆسکۆ ماینەوە، سەردانی هەندی مۆزەخانەو جێگەی گەشتیارییمان کرد، لەوانە پانۆرامای جەنگی دنیاگرەوەی دووەم، باوەڕبکە بەبێ زیادوکەم، کە ئەچیتە ناو پانۆراماکەوە هەتا دەچیتە دەرەوە تۆ لە ناو شەڕو ئابلۆقەی لینینگراد دایت، بە سێ کاژێر تەواومانکرد، شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، هەروەها سەردانی ماڵی شاعیری گەورەی ڕوس (پۆشکین)مان کرد، ماڵەکەی کراوە بە مۆزەخانە، هەموو کەلوپەل و کتێب و قەڵەم و غلوینەکەی وەکو خۆی ماوە، لەگەڵ ئەو دەمانچەی لەپێناوی عیشقدا خۆی پێکوشت، سەردانی ئارامگەی (لینین)و مەیدانی سوورمان کرد، لینین وەکو ئەوە وابوو کە تازەگی خەوی لێکەوتبێت.

لەکۆبووەنەوەی بەڕێوەبەرایەتی ئینستتیوتدا عیسمەت شەریف، پێداگیریکرد کە پرۆژەی (ئیسکلۆپیدیای کورد و کوردستان)، کارێکی

مێژوویـی و دانســقەیەو گەورەتـرین خـزمەتە بەکـورد دەکـات، هەر خۆمان ئەنجامیبدەین.

لەسەرئەوە پێکهاتین و چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد، لیژنە پێکهات بـۆ میکـانیزمی کـارەکە، لیـژنەی مێـژوو، جوگرافیـا، زمـان، ئـاین، سیاسەت، کۆمەڵایەتی، ئەدەبیات، جیۆپۆلیتیک و چەند لیژنەی تریش، چەنـدین کۆبـوونەوە کـرا، دەیـان زانـاو مێژوونـووس و پرۆفیسـۆری کوردو هیتر بەشداربوون.

کۆمیتەی سۆرانی، کرمانجی، زازاکی (دومبلی)، لوڕی و هەورامی، هـاتنە دەستنیشـانکردن، هەمـوو ئەرکدارکران لەمـاوەی دیـاریکراودا راپۆرتی خویان ئامادەبکەن و میکانیزمی شیوەی کارکردنیان روون بکەنەوە.

لەکارگێریێ ئینسـتتیوت کۆبوونەوەمانکردو خەمڵاندنمان کرد ئەم کارە زیاتر لە ملیۆنێک دولاری تێدەچێت، بۆ ئەمە نامەمان بۆ هەمـوو حــزب و لایەنە کوردییەکــان، چەنــد کەســایەتییەکی دیــاریکراو، داوودەزگـای ئەوروپـی وەکـو یونسـکۆ، کـۆمیتەی کولتـووری نەتەوە یەککرتووەکان و کۆمیتەی کولتووری یەکێتی ئەوروپا نووسـی، چەند حزبێکـی کـوردی وەڵامیاندایەوە کە لەڕووی داراییەوە، نـاتوانن هیچ هاوکارییەکمان بکەن، هەندێکیش خۆیان گێلکردو وەڵامیاننەدایەوە، بۆ مێـژوو دەیڵـێم لە ڕێـگەی بەرپرســی کـۆمیتەی مەرکەزی پەکەکە لەئەوروپـا ئاگـادارکراینەوە، بەرێـز ئـۆچەلان برياريـداوە ۸۰تـا ۱۰۰ هەزار دۆلار بـۆ ئەم کـارە پیـرۆزە تەرخانبکـات، سـەرۆکی حزبێکـی سەوزی ئەوروپی وەڵامیدایەوە کە پرۆژەیەکی ئـاوا بۆ کـورد زووە هێشتا، باشترە بیر لە پێکهێنانی دەوڵەتێک بکەنەوە.

حەز ئەکەم ئامـاژە بەوەبکەم بەرێزان پرۆفیسـۆر جەمـال ڕەشـید، دکتۆرە کوردسـتان موکریـانی، دکتـۆر جەبـار قـادرو دکتـۆر عیسـمەت

شەریف هەوڵێکی زۆریاندا بۆ کۆکردنەوەی ئەو هەموو زاناو دکتۆرو مێژوونووسانە.

زۆربەی گفتوگۆکـانی پـرۆژەکە لە(tv med) تەلەفزیـۆنی بڵاوکـرایەوە، ئەوەی بە مـن سـپێردرابوو کـۆمیتەی ئەدەبیـات بـوو، کورتەیەکم لە مێژووی ئەدەبی کوردی و نێوی (٥٥) شـاعیری کورد لە کلاسیک و مۆدێرن لەگەڵ ڕۆڵی شیعرو ئەدەبیات لە بەرخۆدان و پاراستنی مێژوو و کولتووری کوردیدا، ئامادەکردبوو.

بەڵام بە داخەوە بـۆ نەگبەتـی چـارەی سیاسـیی کـورد، بەڕێـز ئـۆچەلان گیـراو رادەسـتی دەوڵەتـی تـورک کـرا، هەمـوو شـتەکان سەروبن بوون، ئەم پرۆژە نـاوازەو گرنگەش چووە سەر ڕەفەکانی مێژوو.

## (٤٧)

# یادگاریی لەتەك ئیبراهیم ئەحمەد

ئەو کاتانەی کە خەریکی ئامادەکاری پێکهێنانی پەرلەمانی دەرەوەی وڵات (پەکەدەوە) بووین. لە لەندەن چاومکەوت بە(نەوشیروان مستەفا، دکتۆر مەحمود عوسمان، سامی شۆڕش و ئیبراهیم ئەحمەد)، لە بابەت پێکهێنانی پەکەدەوە لەگەڵیان قسەمکرد، هەرکەس سەرنجی خۆی دەربڕی، دوایی لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ڕێککەوتین سەفەرێک بکات بۆ لای بەڕێز لوچەلان و لە گەڕانەوەیدا بێت بۆ برۆکسل.

لە برۆکسل یەکترمان بینییەوە، لە چەند کۆبونەوەو گفتوگۆدا بەشداربووین، لە دوای کۆبوونەوەکان بە نەریتی پێشمەرگایەتی هەڤاڵان، میوانەکانیان بە سەر ماڵە کوردەکاندا دابەشدەکرد. زۆر جار وا ڕێک دەکەوت یان وامان ڕێکدەخست من و مامۆستا ئیبراهیم لە ماڵێکدا پێکەوە بین. ئیتر شەوانە هەتا درەنگ دەستمان دەکرد بە قسەی خۆش، شیعر، ئەدەب و سیاسەت.

ئەو کەیفی بە من دەهات، منیش ڕێزم لەو دەگرت، ئەو دەرفەتە بۆ من هەلێکی گرنگ بوو، کە بەڕێزیان بهێنمە قسەو پرسیاری زۆر گرنگی لەسەر وێستگەکانی ژیانی سیاسیی خۆی و هەندێک لایەنی شاراوەی ناو بزاڤی کوردایەتی بەتایبەتی، لێبکەم.

لە چوار پێنج کاسێتدا، قسەکانیم تۆمارکردبوو، بە داخەوە ئەو کاسێتانە فەوتا، بەڵام هەندێک لە قسەکانیم وەکو خۆی لە بیرماوەو بە ئەمانەتەوە بۆتان دەگێڕمەوە.

پرسیم چۆن ئێران دەستی خستە ناو شۆڕشی ئەیلوولەوە؟

وتی: پاش ئەوەی گرژی و ئاڵۆزیی کەوتە نێوان ئێمەو عەبدولکەریم قاسم، لە هەندێک ناوچەی دوورەدەست، وەکو

ئەزموونکردن چەکدارمان ناردو تەقەیان لە چەند بنکەیەکی پۆلیس کرد، ویستمان بزانین ئامادەباشیی جەماوەر لە چ ئاستێک دایە؟ لە ساڵی ١٩٦١ پێش جاڕدانی شۆڕشی ئەیلوول، لە بەغدا سەردانێکی باڵیۆزی ئێرانمان کرد، پێکهاتبووین لە(نوری شاوەیس، حیلمی عەلی شەریف، عەبدولحسێن فەیلی و ئیبراهیم ئەحمەد). لە دیدارەکەماندا دوو کەسی تریش لەگەڵ باڵیۆزدا ئامادەبوون، داوامان لێکردن دەنگمان بگەیەنێتە (شاهەنشا)و یارمەتیمانبدەن، چونکە ئێمە بڕیاری شۆڕشی چەکداریمان لەدژی عەبدولکەریم قاسم داوە، پاش گفتوگۆیەکی دوورو درێژ وتیان پاش دە ڕۆژی تر وەرنەوە وەلامتان بۆ دەهێنینەوە. لە ڕۆژی دیاریکراودا چووینەوە بۆ دیداری باڵیۆز، ئەم جارەیان کەسێکی تر یاوەری باڵیۆز بوو، ئەو کەسە(عیسا پەژمان) بوو، ئیتر لەوێوە پێوەندییەکان دەستیپێکرد.

ئەمڕۆ هەتا ئێرە قسەکانی مامۆستا ئیبراهیم بۆ بلاوکردنەوە دەشێن! هەروەها وتیی لە ڕێگەی (نوری شاوەیس)ەوە، کە سۆڤێتییەکان باوەڕو متمانەیان پێیەبوو و وەکو کەسێکی چەپ لەناو بزاڤی کوردیدا دەخوێندرایەوە، پێیڕاگەیاندن کە چارمان نییە داوای یارمەتی لە ئێران دەکەین، کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی لە ماڵی (جەمال حەیدەری) لە بەغدا لەگەڕەکی مەنسوور کردا.

سۆڤێتییەکان و شیوعییەکان دژایەتی خۆیان پێڕاگەیاندین.(قسە قسە ئەهێنی باسی ئەم کۆبونەوەیەم لە دایکی فازل (نرجس الصفار) خێزانی جەمال حەیدەری بەدرێژی بیستووە.

دایکی فازل وتی: "من دانیشتبووم باوکی لەیلا (جەمال حەیدەری) پێیوتن کارێکی باشناکەن، ئەگەر قاسم برمێت، کارەسات لە عێراق دروستدەبێت، شۆڤێنی و کۆنەپەرستەکان دێنەسەر حوکم، کە دوژمنی کوردن. هەروەها وتی بە باوکی لەیلام وت با لەم خانوە بگوێزینەوە"!!

هەر لەو ئاخـافتنە گرنگـانە، مامۆسـتا ئیبـراهیم ئەحـمەد، باسـی ڕاپەڕینی بەردەرکی سـەرایکردو وتـی: ڕۆڵی کاریگەر لەو ڕاپەڕینەدا فـایەق بێکەس، ڕەشـۆل عەبدوڵڵاو مـوحەرەم مـحەمەد ئەمـین هەیـان بـوو. وتـی مـن لە چایخـانەکەی حەمەڕەق سەرپەرشـتی ڕاپەڕینـەکەم دەکرد، زوو زوو ڕەشـۆل دەهـات بـۆلام و ڕێنـوێنیم دەکردن، لێرەدا قسـەیەکی ئـۆفیکی عارەقفرۆشـم هـاتەبیر دەیـوت: (ئەگەر مـوحەرەم ئەسلەع چوو لە حەمەڕەق، چوو لە بەر بەلەدیە، بە فیکە فیکە چوو لە بەردەکی سەرا، ئەوا موزاهەرە، موزاهەرە دوکان قەپات عەرەق نەما).

بێکەسی شاعیر، شیعرێکی لەسەر ئۆفیک هەیە، کە دەڵێت:

داخی قەرزاری عەرەق خستوومیە فاکوفیکەوە

گاه بەدەست جەرجیس و عەبدە، گاد بەدەست ئۆفیکەوە

هەر لەو گێڕانەوانەدا وتـی پیاوێک هەبوو (خـوفیە)ی بەڕێوەبەری پۆلیس بوو، بەیانیەک دەچووم بۆ ژووری پارێزەران، ئەو خوفیەیە لە دوواوە قـۆڵی گـرتم و وتـی یەڵـلا بـۆ لای بەڕێـوەبەری پـۆلیس، ئیتـر چارم نەما، وتم بـابڕۆین، ئەو ئەڕۆی و منیش وردە وردە لە دوایەوە دەڕۆیشتم، جانتاکەم پڕ لە چـاپەمەنی و ڕاگەیانـدراوی شـۆڕش بـوون و هەر ئەو شـەوە نووسـیبوومن و بە ڕۆنیـۆ چـاپمکردبوون، لـوولم کردبوون و لە جانتاکەمدا بوون، لە ڕێگە دەرفەتم هێنا چەند لولەیەکم لـێ فـڕێ دانە نـاو بەفـرەکەوە، کـابرای خـوفیە چـاوی لێبـوو، بە پێکەنینەوە وتی چیت پێیە بیدە بە خۆم بۆتی هەڵدەگرم مەترسـە، با پێم بڵێن (پیـاو خـراپ) بە خـودا کـوردم کـورد، ناپاکی لە کـوردایەتی خۆم ناکەم، وتی منیش هەموو شتەکانمدایە، چووینە لای بەڕێوەبەری پـۆلیس عەرەب بـوو، بە تـووڕەییەوە وتـی بیپشـکنن، هەمـوو گیـانم گەڕان هیچیـان نەدۆزییەوە، ئینجـا وتـی هەمـوو ڕۆژێـک پـێش ئەوەی بچیتە سەرکارو دوای دەوام دەبێت لای من واژۆ بکەیت.

مامۆسـتا ئیبـراهیم وتـی لە سـاڵەکانی ١٩٥٥و ١٩٥٦ مـن و (مـارف بەرزنجی) بەربژێری بەرەی نیشـتمانی بـووین بـۆ پەرلەمـانی عێـراق،

هەنــدێک کەســـایەتی و ئاغــاوات، هەروەهـــا تۆفیــق وەهبیـــیش پاڵێوراوبوون، من ڕاگەیاندراوێکم بە ناوی پارتییەوە دەرکردو دژی ئەو بەربژێرانە وەستابووینەوە کە ڕکەبەری ئێمە بوون، ئەوانەمان بە کۆنەپەرست، پیاوی ئیستعمارو نوری سەعید لەقەڵەمدابوون.

هەر ئەوە شـــــەوە گردبوونەوەمـــــان ڕێکخســــــتبوو و ئەو ڕاگەیاندراوەیان دەخوێندەوە، شەو لە یانەی فەرمانبەران دانیشتین و یارییمــان دامەزرانــد، لە پـڕ تۆفێـق وەهبــی و موتەســەریف هــاتن لەگەڵمـان دانیشـتن و کەوتنە یـاری، تۆفیق وەهبی هـات لای منەوە دانیشیت، وتی (بلە) ڕاگەیاندراوەکەت چەند هەڵەی زمانەوانی تێدایە، تۆ کوردیەکەت باشە، منیش پیاوی نوری سەعید نیم، ئەگەر ئەم جارە بەیانت نووسی. بیدە بەخۆم با هەڵەی ڕێزمانی و زمانەوانیەکەت بو چاکبکەم. مەڵێ بڕوخێ بڵێ بڕمێ ڕاستترەو کوردیترە، ئیتر من وتم تۆفیق بەگ با یارییەکەمان بکەین .

ئەوە خوفیەو کاربەدەست و نیشتمانپەروەرانی ئەو زەمانە چەند جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەوانەی ئێستە؟!

چیرۆکی کاسیتەکانیش چیرۆکێکی ترە ..

هەر سەرکەوتوو بن تا چیرۆکی ئاییندە

# (٤٨)

# یەکەم کۆنفرانسی دیالۆگی فیکریی و سیاسی پەکەکە لە (۱۹۹۳) لە برۆکسل

ئەو کاتە پەکەکە هێشتا نەخرابووە لیستی تیرۆری یەکێتی ئەوروپاو هەر بەناوی (پارتی کارگەرانی کوردستان)وە چالاکیان دەکرد، بەلام وەکو هێزێکی سیاسی ڕادیکالی چەپ لە ئەوروپا ناسرابوون، بۆیە کە بانگهێشتی پارت و کەسایەتی سیاسی، دیپلۆماتی، ڕۆشنبیریی و بیرمەندە ئەورپایەکانیان دەکرد بۆ کونفراس، دیالوک، ئالوگوری هزری و سیاسی بەگەرمی بە پیرەوە دەهاتن، بەتایبەتی بۆ ئاخافتن و گەنگەشە لەسەر دۆزی کوردو کێشەی شۆڕشی باکووری کوردستان!.

هەڤالان لە سەنتەری برۆکسل بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هۆتێلێکی پێنج ئەستێرەیان بە کرێ گرتبوو، نزیکەی ٥٥٠ - ٦٠٠ کەسیان لە سیاسەتەوان، بیرمەندو دیپلۆماتکاری جیهانی، ئەوروپایی، ڕوسی و ئەمریکایی، ڕۆژهەلاتی ناوین و کوردستان بانگهێشت، کردبوو، لەوانە: مادام میتران، چەند کۆنگرێسمانی ئەمریکایی، ژمارەیەک لە کەسایەتی ئەنجومەنی عمومی بەریتانی و ئەندامانی پەرلەمانی ئەوروپا.

ڕۆژی سێ کۆبوونەوە دەکرا، هەر کەسەی ۱۰ -۱٥ خولەک (دەقە) مافی ئاخافتنی هەبوو، نوێنەری زۆربەی پارتە چەپ و سۆسیال دیموکرات و سەوزەکانی ئەوروپا ئامادە بوون. بیر و ڕا لەسەر کێشەی کوردو شۆڕشی چەکداریی و سیاسەتی چەپگەرایی پەکەکەو هەلوێستی دەولەتانی داگیرکەری کوردستان، ئالۆگۆڕو گفتوگۆی لەسەردەکرا. (من ئەم چالاکییەم بە سەرەتای کاری سیاسی و دیپلۆماسیی پەکەکە لەقەلەمدا)!.

ئەو کاتە تازە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە باشوور دامەزرا بوو، ڕێکخەرانی کۆنفرانسەکە داوایان لە حکومەتی هەرێم کرد، نوێنەرێکی خۆی بنێرێت. ئەوانیش بەڕێز (ح. س) یان ناردبوو، ڕۆژێک من و کاک عیسمەت شەریف وانلی لە لۆبی هۆتێلەکە دانیشتبووین لەپڕ دەنگە دەنگێک پەیدابوو، یەکێک لە ڕێکخرانی کۆنفراسەکە هاتە تەنیشتم و بە چپە پێیوتم، هەڤاڵێک لە باشووره هاتووه کێشەی دروستکردووه، وەرە با چارەسەریبکەین.

کە چووم بەڕێز (باوکی عەلی) بوو، وتم جەناب خێرە؟ بە دەنگێکی بەرز بە زمانی ئینگلیزی وتی: من وەزیری ڕۆشنبیریم چۆن لە یەک ژووردا لەگەڵ کەسێکی تر دادەنیشین؟ پێموت جەنابی وەزیر تەنیا چەند کەسێکی وەکو مادام میتران یان کۆنگریسمان و لۆردێک ژووری تایبەتییان بۆ گیراوە، فەرموو ئێوەش ژوورێکی تایبەتی وەرگرن، وتی: نا من دەبێت (سویتێکم) بدەنێ ئەگەر نا دەگەڕێمەوە، لەم دەنگە دەنگەدا چەند کەسێک کە ئەویان دەناسی هاتن و ڕازیانکرد بە ژووری تایبەت، بە گوێرەی پرۆگرام، لە کاتی خۆیدا داوایان لێکرد وتارەکەی پێشکەشبکات، لە هەموو کەس زیاتر قسەیکردو هێرشی کردە سەر هەندێ سیاسەتوانی کوردو پەکەکە، هەرچەندە بە ناو، ناوی کەسی نەهێنا، بەڵام هەڤالان تێگەیشتن چیدەڵێ، خەریکبوو بیقەومێنن، ئیتر دکتۆر عیسمەت و هەندێ برادەری تر کێشەکەیان چارەسەرکرد، ئەمەش چیرۆکی وەزیرێکی ڕۆشنبیریمان.

کۆنگرەکە بە سەرکەوتوویی تەواوبوو، لە میدیاکانی ئەورووپا بایەخێکی ئێجگار گەورەیان پێدا، بووە سەرەتایەک بۆ چالاکیی سیاسی و دیپلۆماسی پەکەکە.

لەم کۆنفراسەدا بەڕێز دۆران کالکان ئەندامی سەرکردایەتی پەکەکە ئامادەبوو، کە تازە لەحەپسخانەی ئەڵمانیا ئازاد کرابوو، وتارێکی سیاسی بەنرخی خوێندەوە.

## (٤٩)

# كۆنفرانسی ئاڤێستا سالی ٢٠٠١ له (Haus der Kulturen der welt)ی بەرلین

له ناوەنــده ڕۆژهەڵاتناســییەکانداو لەنــاو رونــاکبیرانی کــورد بەتایبەتی، هەروەها لای ئێرانی و فارســەکان گەنگەشــەو مشتومڕێکی زۆر هەبوو لەسەرئەوەی زەدەشت لەکوێ ژیاوە؟ چۆن پەیامەکەی بڵاوکردۆتەوە؟ ئایا ئەم پەیامبەرە چ پێوەندییەکی بەکورد هەیە؟ ئایا ئەو زمانەی ئاڤێستای پێنووسراوە چ زمانێکەو چ پێوەندی بەزمانی کوردیی هەیە؟

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پرسانەو ڕۆشنایی خستنەسەر ئەم بابەتە، ئینستتیوتی کوردیی له بەرلین بڕیارماندا کۆنفرانسێکی بۆ لێکۆڵینەوە لەو مـژارانه زانسـتی بکەیـن، کۆنفراسـەکه دوو ڕۆژی خایانـد، چەنـد زانـاو پرۆفیســۆرو ڕۆژهەڵاتناســی نـاودار بەشــداربوون، زۆر شــتی تـازەو ســەرنجڕاکێش گفتوگۆی لەســەرکرا، ئەوەی جێگەی بـایەخبوو سیمیناری پرۆفیسۆرێکی ئینگلیز بـوو، که مامۆسـتای مێژووی کۆنی ئێرانی بوو له لەندەن، وتی ماوەی ١٠ سـاڵ خەریکی ئەم لێکۆڵینەوەیە بـووم، بـۆ ئەوەی لێکـۆڵینەوەکەم زانسـتیانە بێت، خـۆم فێـری زمـانی فارسـی و کـوردی کـرد، شـارەزاییەکی باشـم له زاراوه کوردیەکانـدا کۆکردەوە، سـەفەری ئێران و چەنـد نـاوچەیەکی کوردسـتانم کـرد، له هەمـوو زاراوه کوردییەکانـدا نمـونەی دەنگـی(م) وەرگـرت، لەمنـداڵی حەوت سـاڵ تـاتەمەنی (٦٠و ٧٠) سـاڵ، ئاخافتنەکـانم تۆمـارکردن. له ئەنجامدا گەیشـتمه ئەو بـاوەڕەی (ئەو زمانەی ئاڤێسـتای پێنووسـراوە

له سەدا شەست بۆ حەفتا زۆر نزیکە لە شێوەزاری هەورامییەوە کە ئێستە قسەیپێدەکەن).

ئەو کوردانەی بەشداربوون: بابان سەقزی و چەند کەسێکی تر بە گوێرەی سروتەکانی ئاڤێستا (گاتاکان) سەلماندیان، زەردەشت لە ناوچەی هەورامان ژیاوە، ئەو (بەڵخەی) کە دەڵێن زەردەشتی لێ لە دایکبووە، ئەوە گوندی بەڵخەی هەورامانی لای خۆمانە نەک (بەڵخی) ئەفغانستان.

پرۆفیسۆر کیسرا وەفاداری کە مامۆستای زانکۆو سەرۆکی کۆمەڵەی زەردەشتییەکانی جیهان بوو لە پاریس. لە کۆنفرانسەکەدا وتی: زەردەشت کوردەو لە هەورامان هاتۆتە دنیاوە، زەردەشتی ئایینێکی ڕەسەنی کوردەوارییەو یەکەم ئایینە باوەڕی یەکتاپەرستی، لەپێش ئەخناتوونی میسر، بڵاوکردۆتەوە، هەرچەندە ئەو کاتە لە (میزۆپۆتامیادا) ئاین و باوەڕی جۆربەجۆر هەبوون، وەکو مانی، زەروانی و هیتیتی، ئایینەکانی تری وەکو موسایی، عیسایی و محەمەدی، سوودیان لە بیروباوەڕی زەردەشت وەرگرتووە.

ئەو زاناو پرۆفیسۆرانەی سیمناریاندا:

١) پرۆفیسۆر فلیپ زەندەرمان (سەرۆکی بەشی ئێرانناسی لە زانکۆی بەرلین).

٢) پرۆفیسۆر سیلفانا (مامۆستا لە زانکۆی ئازادی بەرلین).

٣) دکتۆر زەردەشت حاجۆ (مامۆستا لە زانکۆی برێمن).

٤) فەیسەڵ داغلی نوسەرو ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگی باکووری کوردستان.

٥) بابان سەقزی (ڕۆژهەڵاتی کوردستان)

و گەلێکی تر کە ناوەکانیانم لە بیرنەماوە داوای لێبووردن دەکەم.

وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆنفرانسەکە هەموویان کران بە کتێب و بەشی زۆری وەرگێردرایە سەر زمانی ئەڵمانی، هەندێکی لە گۆڤاری (لێکۆڵین) بڵاوکرایەوە، ئێستە وەکو سەرچاوە لە زانکۆکانی ئەڵمانیا کەڵکی لێوەردەگیرێت.

جێگەی وتنە، پرۆفیسۆر کیسرا وەفاداری دوای ئەم کۆنفرانسە پەرتوکێکی بەزمانی فەرەنسی بڵاوکردەوە، بەرگەکەی وێنەی چەند مرۆڤێکی کورد بوو، لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی: ئەگەر هەموو میللەتانی تریش وازیان لە زەردەشت هێنا، نەدەبوو کورد واز لە ئایینی زەردەشت بهێنێت. چونکە یەکەم ئایین بوو لەگەڵ ڕۆژدا هەڵهات و هەموو جیهانی ڕووناککردەوە.

ماوەیەک لە دوای چاپکردنی ئەم پەرتوکە، گرووپێکی توندئاژۆ پرۆفیسۆر کیسرا وەفاداریان لە پاریس بە چەقۆ کوشت.

سوپاسی هەر کەسێک دەکەم ئەگەر تێبینی و سەرنجیان لەسەر ئەم پۆستە هەبێت و نووسینەکەمان دەوڵەمەندتر بکەن، یان ئەگەر ناوی بەشداربوویەکم لەیادچووبێت، بەبیرم بهێننەوە.

## (٥٠)

# چاوشارکێیەك لەگەڵ شیعر

چـامەی شــەمەندەفەری مێــژوو (جەمــال حەیــدەری)، وەکــو سـەرکردەو تێکۆشــەرێکی کۆمۆنیسـت، لە چیرۆکەکـانی ڕابـردوودا زۆرجار ناوی چەند سەرکردەو کەسایەتی دیاری پارتی کۆمۆنیستی عێراقمان هێناوە، کە سیمبۆلی خەباتی چینایەتی و ڕزگاریی نیشتمانی بـوون، لەوانە:(حەمیـد عوسـمان، عەزیـز مـحەمەد، بەهـادین نـووری، جەمال حەیدەری، عومەر عەلی شێخ و کەریم ئەحمەد).

لەو سەردەمەدا چەندین گەنجی خوێنگەرمی وەکو ئێمە بە تاسەوە بووین، لە نزیکەوە ئەم سەرکردانە ببینین و گوییان لێبگرین، ئاواتمان بـوو لە نـزیکەوە قســەیان لە تەکدا بکەیـن، دەمانویسـت بـزانین ئەو چیرۆک و داستانانەی لەبارەی ئەم کەسایەتیانەوە دەوترێت چۆنەو چییە؟!

بـۆ مـن بەختێکـی پڕبەهـابوو، لە سـاڵەکانی ١٩٦٠و ١٩٦١ کاتێـک شاندی ئاشتی کوردستان بووین (السلم في كوردستان)، چووینە لای سەرکردەکانی ئەوسای عێراق بە(عەبدولکەریم قاسم)یشەوە، زیاتر لە دە ڕۆژ لەبەغدا ماینەوەو چالاکیی جۆراوجۆرمان ئەنجامدا.

هەمـوو ئێـوارەیەک (جەمـال حیـدەری) لەچایخـانەیەکی شـەقامی (الكفاح) لەگەڵماندا کۆدەبووەوە بۆ ئەوەی ئەنجامی چالاکیی ڕۆژانەی پێبگەیین، کۆبوونەوەکە لەگەڵ من و عەلـی باراوی و شـێخ ئیبراهیمـی قادرکەرەمیدا بوو، بۆ مـن ئەوەی شـایەنی وتـن بێت، ئەو کەسـایەتییە نـاوازەی لە هەسـت و ئەندێشــەمدا وێنـامکردبوو بەرانـبەر بە(جەمـال حەیدەری) تارادەیەکی زۆر ڕاست دەرچوو، بۆیە مـن زۆر بەکورتی داستانی جەمال حەیدەریتان پێشکەشدەکەم.

١) دایکی فازل خێزانی جەمال حەیدەری بۆ من و (دایکی ڕەوا)ی گێڕایەوە وتی: ئەو کاتەی لە (قصر النهایة)، ساڵی ١٩٦٣ جەلادێکی حەرەس قەومی ئازارو ئەشکەنجەی دەداین بە منی وت، وەکو مێردەکەت جەمال حەیدەری دان بە هەموو تاوانەکانتدا نانێی و ڕاستییەکانمان پێناڵێی، تا بە دەردی ئەوت نەبەین، جەلادەکە لەبەرخۆیەوە دەیوت ئەم بەیانییە تاریک و ڕوون، ئەوانمان برد بۆ دەرەوەی بەغداو گولەبارانمان کردن، لە کونە بچکۆلەکانی ماشێنە داخراوەکەوە سەیری بەغدایان دەکردو جەمال حەیدەری ئەم سرودەی دەوتەوە (یا بغداد.. انک قد بلغتی.. فبلغی.. أننا فی درب المجد سائرون)، واتە بەغدا گوێ بگرەو رایبگەینە ئێمە لە پێناوی سەروەریدا دەڕۆین.

٢) ئەو ڕۆژەی ڕادیۆی بەعسییەکان هەواڵی گولەبارانکردنی (جەمال حەیدەری)یان بڵاوکردەوە، ئێمە لە لیژنەی قەزای هەڵەبجەی حزبی شیوعی لە باخەکەی (حەمە بۆر) لە کۆبوونەوەدا بووین، (ئەحمەدی دەلاک) سەرپەرشتی کۆبوونەوەکەی دەکردو وەستاندی، گوێمان لە ڕادیۆکە گرت، هاوڕێ ئەحمەد دەلاک وتی: وتمان دوای (سەلام عادل) باکمان نییە، چونکە (جەمال حەیدەری) ماوەو دەتوانێت حزب بەڕێوەببات، بەڵام ئەوا هاوڕێ جەمالیش ڕۆیشت، ئیتر من ئومێدم نەماوەو حزبیش دەڕوا، ئەمە دوا قسەی هاوڕێ ئەحمەدی دەلاک بوو، کە لە بەردەم ئەم هاوڕێیانەدا کردی،(نائب عەبدوڵا، سەید تۆفیق، مەلا ڕەئوف، حەمەڕەشی کوێخا مەحمود، حەمە کوڵەباڵ و بەندە) ئامادەبووین، ئێستەیش سیانمان لە ژیاندا ماوین!!

ئەمە جگە لەوەی جەمال حەیدەری ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە چەسپاندنی مافی چارەنووس، بۆ گەلی کوردستان لە پرۆگرامی حزبی شیوعیدا. ئایا کەسێکی وا شایەنی ئەم چامەیە نییە؟

ئەمەش چامەکەیە:

**شەمەنەفەر**

زەمانێ بوو..
لەم وڵاتە تازە.. گەرای!...
بیری سەربەستی دانابوو
پیرە مێژوو!....

***

کەڵبەی تیژی ئال سەفەوی
کەوتە گیانی نەیاری خۆی...
لەسەر خیلافی مەزهەبی...
بنەماڵەی ئال "حەیدەری..."
پەرتی پەلاماری وان بوون...
سەرهەڵگرتوو لە کوردستان
پشوویان دێی ماوەران بوو!...

***

زەمان ڕۆیی قۆناخ گەڕا!...
بۆ ڕۆژگار بە ئاوەژوو!!!
وەک گوڵە بۆنێ بە دەگمەن!...
لەسەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێ...
جار جار دیرۆک دەسیە لەرزێ
سپارتاکوسێکی ئەبێ!...
وەک ڕۆژ لە ناو هەوری ڕەشا
پرشنگ بدا....
تاریک و ڕوون..

وەک ئاو بۆ زەوی قڵیشاو
پرژ بهاویَ پاراوی کا....
وەک زایەڵە بۆ زیندانی تاریک نوتەک
مژدەی بەربوونی دیل بدا!..
لە هەولێری نقومی خەرافاتی گەمژە!...
لە ئەربیلی خەفەی بیری وەک شەوی تار
بروسکەیەک چەخماخەیەک...
ئەم شارە دێرینەی داچڵەکان!...
مژدەی بلیمەتێکی دا!....

* * *

بە هەڵکەوتە
جار جار
گەمیی مێژووی مرۆڤ لە بەندەری وچانێکا!...
لەنگەر ئەگرێ...
ئاسمانی لێڵ شەبەق ئەدا...
فریشتەیەک دائەبەزێ!...
جار جار
ئەسپی ڕەسەنی خورد....
لە شای پەرییان تگە ئەگرێ!...
ئاوازەیەکی لێ ئەبێ!....
بەڕێکەوتە
پەلکە زێرینەی ڕەنگاو ڕەنگ....
پاش وەشتی زۆر پارچە دوڕێ دائەهێڵێ!..

* * * *

زەمەن خزی چەرخ سوڕا!...
گڕوگاڵی هەژار پەرستی پەیدا بوو...

شەمەندەفەری فەهدی مێژووی
پرولیتار...
ڕووەو شاری ئەربائیلۆ...
شەکەت مانوو تەنگەنەفس
هەناسەی سوار!...
ئۆقرەی لێ گرت حەوایەوە بەڵام هۆشیار!...
لە هەولێری تیژاوی.. چنگی دەرەبەگ....
پلیشاوی ژێر پێلاوی ئەو زەمانەی
ئینگلیز و سەگ!...
لە هەولیری پەتی نەزانین لە قورگ و
لەبین جەراو...
لە هەولێری ئەشک و زووخاو
لە هەوراز و نشێوانی زورگە زراو!..
لە "سێتاقان" لە" تەعجیل" و " قەڵای
هەلاج!"
لە ئارەقەی ڕەنجی دزراوی بەر
قرچەی هەتاوی جووتیارانی دەشتی قەراج..
لە ڕۆشنبیرانی شاری بەر
چایخانەی عەبۆ و مەچکۆ...
لە پەرتووکخانە و چاپخانەی
گیوو و حوزنی!...
شۆڕە سوارانی ئەم شارە
چەپک چەپک گوڵی سووری
گەشیان چنی!...
بۆ ملی چینی لاواز و نەبەکامی پرۆلیتار!!..
بۆیە تامی بەلەزەتی نەگەیشتە ناو چێژی
زار!!...

***

مەلا عەروس.. حەمید عوسمان
نامەخانەکەی شێخەشەل
پاسکیلەکەی محمود عەدۆ
چایخەنەکەی مام ئەورەحمان
مەلاکانی ئال حەیدەری
چاوی شار بوون!..
گاڵۆکی دەستی وەرزێر و
چەوری هەسان تیژکردنی داس و کەرەنتووی
جووتیار بوون
بەز و مەرهەمی قلیشی پێ و دەست و ناوشانی
هەژاران بوون!
کوانووی ئاگری زستانی
ڕەشماڵ و کۆخی گوندێ بوون!...
ئەلەکتریکی شەوەزەنگی کوچە و ڕێ وونبوون!!.
بۆیە خوفیە و ئەژدیهاکان
لە هەر کۆڵان و هەر دێ ئەیانبینین!
وەک هار پەلاماریان ئەدان...

***

شەمەندەفەری فەهدی مێژوو
لەم کوردستانە پڕ چیاو...
پڕ خەرەند و پڕ هەڵدێرە...
لەم نیشتمانە نازدارەی
ژەهر چەژی ئەزیای کوشندەی چوار سەرە
لەم وڵاتە پڕ لە فەڕ و خێر و بێرە
ئا ئەمانە ئەیان هاژوو
شەمەندەفەری فەهدی مێژوو!...

***

هەوێنی بەلشەفی گرسا!...
لەم وڵاتە
لە پە قرەجە ماستی بێریانی دەشتی دزەیی!
لە کیسە و سەبیلی قلیانی کەسیرەکانی
خۆشناو!!!!...
تۆوی کۆمۆنیستی ڕوا
لە خەرەندی "ڕەواندز" و دار گوێز و هەرمێی باڵەکان!...
لە وشکایی و لە بەراوا!..

***

مێژوو ژانی گرت لە ئاسمان!...
ئاسمان لە خاک.. هەور لە شاخ!
بیر چراوگی خۆی داگیرسان!..
ئارەقەی ڕەنج، خوێنی قامچی!...
چزی چەهرەی هەڵقرچاوی
بەر هەتاوی چەوساوەکان!..
جەڕی پێچکەی شەمەندەفەری
فەهدی مێژوویان چەور کرد!!....
تەکانێکیان ئەم کۆمەڵە بۆ پێشەوە برد!
ماشین گەڕا "چەرخ" خولی خوارد!!.....
بۆ قۆناغی....
شەمەندفەری فەهدی مێژوو
جەمال حەیدەری ئایئاژوو!...
کاکە جەمال
ئەشکەنجەی کوشت ...! وەک بیری کۆن!...
زیندانی کردە مەدرەسە... وەکو زانکۆ...وەکو حوجرە!
ترسی دەستەمۆ کرد... وەک کەو...

چرای بیری بۆ داگرساندن بە شەو!...
سوختە و فەقێ و شاگردانی...
گۆ ئەستێرەی شەوەزەنگ بوون..
دەستە چیلەی دەستی زەلیل و داماو بوون...
خۆشی خەڵووز بەردینی گڕ!..
بووە ستوەی شەمەندەفەر.. وزە و لێخوڕی کاروان بوو
***

لە پلەیەکی زۆر ئاڵۆز و وەیشومەدا...
لە تەک هاوڕێ و هەواڵانی
ئالای کارگەرانیان هەلکرد
وەکو کێوی زاگرۆز شاهۆ....
لەبەر لادان-و نوچدانی شەمەندەفەرا!...
خۆیان ڕاگرت و داچەقان
وەکو برێکی "مەقەس بڕ" بۆ
ڕاوەستان!...
لە کۆنفرانسی پەنجا و شەش
هاوڕێ جەمال
تۆوی مافی چارەنووس و سەربەخۆیی
کوردی وەشان!....
***

بۆیە بیست و یەکی حەوتی شەست و سێ
لە دەفتەری نەمریا..٠
"سەربازی ون" حەسەن سەریع!... "
داستانە!....
لە چیرۆکی سەروەریا.....

هاورێ جەمال .. عەبەلی پاڵەوانە...
لە پەرتووکخانەی شەمەندەفەر
ئەبو سەعید
ڕەفەی بەرزە!
بۆ شاگردانی مووتالا "ڕۆژانەکەی" یەکێتیی
گەل!!....."
هەزار تەرزە

***

تەمەن چییە ؟
سالان مانگان بۆ زەمەن زەنگیانەن!...
بۆ شەمەندەفەر پشوودانی ئێستەکانە!....
یەک سوار ئەبێ... یەکێ هەڵدێ...یەکێ ئەگلێ.. یەکێ پێوی فڕنەکانە....
یەکێ ئەبێتە کەفەژێل دەستی سوڵتانانی
ئەشوا!...
یەکێ ئەبێتە بۆیاخی پێڵاوەکان!...
یەکێ ئێسکی خۆی ئەجوێ وەکوو بنێشت!...
یەکێ مۆرفینی مۆخی خۆی مژ لێ ئەدا!...
یەکێ خوێنی جەرگی ئەخوا..
یەکێ خوێن و مۆخی گریس...
برغوی مەکۆی شەمەندەفەر چەور دەکا!...
یەکێ هەواڵ دز یەک دزە دەزگای کاری
مەکینەکانی پەک دەخا!....
تاکە تاکەی بەختەوەریش هەتا ئێستکە سوار
ئەبێ!!...
ئەمە یاسا و ڕەوشی ژینی ئینسانە

ئەمە قۆناغی ژیانە!...
ژیان چیە؟
ئەمە عورفی شەمەندەفەری "فەهد" و
"سەلام"
"حەلاجی" قەلا دێرینە بەرزەکەی
هەولێرەکەی لای خۆمانە...!
زیندان بۆ زەمەن لەکەیە...؟!
بۆ تێکۆشەران خەبات و ڕێگەی ژیان!...
بۆ تەمەنی مرۆڤ گری!...
گۆڕەو شارە دابرانە!...

وەک مۆم سووتان
بۆ هەژارانی کوردستان....
یەکێ بوێری....!؟
ئەمە ڕەوشتی ئینسانە
یەکێ بوێری!...
تێکۆشان و بەرخۆدان
جەوهەر و شیلەی ژیانە...
مانا و ئەنجامی ژیانە!!!...

**ئەم شیعرە پێشکەشە بە گیانی ئەوانەی خۆیان بەختدەکەن لە پێناوی ماف و ئازادی خاکدا .**
**لە گۆڤاری K21 بلاوکراوەتەوە .**
**ئەم شیعرە لەیادی ڕۆژی شەهید بوونی جەمال حەیدەری و هاوڕێکانیدا خوێندرایەوە کە ١٩٩٢/٧/٢ لە هۆلی میدیا لە هەولێر سازکرا.**

# (٥١)
# چاوشارکێیەك لەگەڵ شیعر

بە فەرمانێکی کارگێڕیی گوێزرامەوە هەولێر بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی، بەبێ ئەوەی ئاماژە بکرێت جۆری کارەکەم چیە لەوێ!!..

دوایـــــی دەرکەوت کەلەســـــەر داوای(پارێزگـــــاری ئەوســـــای سلێمانی)بووە، گوایە جەنابی گومانی ئەوەی هەبوە پەیوەندیم لەگەڵ (مخربین) هەبوەو دائیرەکەشم کردوە بە بەشێک لە (مەکتبی اعلامي یەکێتی نیشتمانی)...بە هەرحاڵ با واز لەمانە بێنین.

ئەو ڕوژەی ساڵ و منداڵەکانم بە ماشینێکی موسکوفیچ ئەڕوشتین.
پـێش ئەوەی بگەیـنە گونـدی قوشـتەپە، گـاردی کۆمـاری ڕێگاکەیـان بڕیبـوو، لەمـبەرو ئەو بەری جـادەکە وەسـتابون، خەڵـک و ماشـینێکی زۆر لەوناوە پۆنگی خواردبوەوە، پاش مـاوەیەک ڕێگاکەیـان کـردەوە، کە گەشـتینە نـاو گونـدەکە بینیمـان وەک ئەوەی قیـامەت هەڵسـابێت، گـارد چـواردەوری گونـدەکەی تەنیبـوو، هەلیکـۆپتەر بەو نـاوەدا ئەسـوڕایەوە، هەر پیـاوو گەنجـی قوشـتەپەبوو باڵیـان بەسـترابوو، (ئەیانخستنە زیلی سەربازیەوە)، لە ئاوێنەی ماشینەکەوە سەرنجماندا دیمەنێکی تراژیدیای غەمناک دەبینرا، قیژەو هاواری ژن و منداڵ لە فەزادا دەنگیـئەدایەوە، هەر گەنجێکـیش بیویسـتایە ڕابکـات تەقەیـان بەسەردا دەکردو بەبرینداری فڕێیانئەدایە نـاو زیلەکەوە، کارەسـاتێکی ترسـناکبوو، لە منـاڵی حەوت سـاڵەوە بـۆ پیـری حەفتـا سـاڵی بارزانیەکانیـان بـردو لەنـاوبرد، کە هـاتینە هەولێـر بیسـتمان نێـرینەی بارزانیەکانی قوشتەپەیان ئەنفالکردوە.

زەمان هاتووچوو لەناو بازاڕی دەلاڵخانەو شێخەڵادا مناڵ و ژن و دایکی کۆستکەوتوو بۆ پەنسەکردن و سواڵ دەسوڕانەوە، زۆر کەس بە ترسـەوە خێریـی پێئەکـردن یـان لە بـن ترافیـک لایتەکـانەوە

هەڵدەتوتان بۆ ئەوەی کەسێک خێریان پێبکات، هەندێکیان کەرامەتیان رێپێینەئەدان سواڵبکەن، لەبەر مزگەوت و بازاڕی دەلاڵخانەدا هەندێ مت و موورو گۆرەوی و دەستکێشی چنراویان دانابوو بۆ فرۆشتن، زۆر جار کە سەفەرمدەکرد بۆ سلێمانی، ئەو ژن و منداڵانەی لەسەر رێگاکە بوون ئەم گەیاندن بۆ قوشتەپەو یان لەوێوە ئەم هێنانەوە بۆ هەولێر، جارێک سێ چوار منداڵی حەوت هەشت ساڵم سوارکرد، یەکێکیان ناوی سەفین بوو چاوسەوزێکی قژکاڵی سوورو سپی جوانبوو جگەرەی دەکێشا، وتم ئەگەر جگەرە بکێشیت جارێکی تر سواری ماشینت ناکەم، ووتی: ئەز بابم نەمایە باب برا خاڵ مام ئەنفالکراوە، ئیتر من قسەی خۆمم بۆ کردن هەرچیەک لەبەردەستابوو پیمبەخشین، لەگەڵ سەفین پیکهاتین هەر ڕوژیکی پینج شەمە لە ژیر ئەم ترافیکە بووەستێت، منیش سندوقی سەیارەکەم پڕدەکرد لە پێڵاوو جل و کەلوپەلی ناو ماڵ، لە نزیک قوشتەپەوە سەیارەکەم ڕائەگرت و شتەکانم ئەدا بە سەفین و برادەرەکانی، ئیتر ماشینە بەرازیلیە شینەکەی من لای ئەوان ئاشکرا بوو، هەر دەر ئەکەوتم لێم کۆئەبونەوە، ئێستا نازانم ئەم سەفینە ئەگەر مابێت یان ئەفسەرە لە زێرەڤانی یان بەڕێوەبەرە لە کۆمپانیایەکدا، ئەم دیمەنانەو دیمەنی ئەنفال و ڕاگوێزان و لە سێدارەدان بونە هەوێنی ئەم شیعرانەم:

من ئاشقم
وەک پەپولە ئەشقی گڕم
هی جوتیاری پێخاوسی ڕانک شڕم،
هی ئاشقی سواڵکەرانی
سەر جادەو نێوگۆڕەپانم
هی چەساوە و زەحمەت کێش و
پاڵە و شوانم
هی بێ کەس و بێ ڕێ و جێم

هی لانەوازەی شەوانم
هی ئەوانەی لە دوو ڕێیانی شەقاما
لە نە سرەوتی بێ ئاراما
لە بن (ترافیک لایت)ەوە
هەڵ تووتاون...
سەرتاپای لەشیان داهێزراو
چاوەکانیان پڕ زووخاون

***

لە پەنجەرەی ماشێنەوە
بەچاوی پڕ ئەسرینەوە
بو درهەمی
تا بیدەمێ
دەستی درێژ ..ملی خوارە...!
زۆر بەکزی، لە ژێر لێوەوە
هەراج!....
مەزات!!..

***

بە شەرمەوە
دەڵێ: خاڵۆ
ئەز باب نینە باب نەمایە"!
ئێنجا منیش ماشێنەکەم
( لای مارەکەی شێخ هۆمەرە)و
لە دەست و قاچم ئاڵاوە!!
خۆیشم لەلا وەک قەقنەسەو
هەموو کەون و کائینات و
سیستەمێکم لا چەپەڵە...
لا گڵاوە لا گڵاوە!...

هەپی پیرس دەی تو یو
وەک گوڵی سیس و ژاکاو
لە سەر شەقام فڕێ دراو
یا نەرگزی لاسکی زەردی
بە ڕقەوە پێشەلکراوە!..
یا کاژۆلە و بەرخی بێ شوان
بە ساویلکەیی بێ ئاگا
لای گورگان بکەن گەمان!!!
چەشنی قەتێ و
کەوی بەندی ناو قەفەسی
بێ ناو و دان
بەم سەرما و سۆڵەی زستانە
لە جێی باخچەی ساوایان و قوتابخانە
لە جێی نازی دایک و دایەن!...
بەشڕ و پڕە وماڵەوە ،
بە قورئان و بەرماڵەوە!...
بە دەسەرازەوە و حەتحەتۆکە و
بێشکە و بوکی مناڵەوە!!...
وەک قەرەج و دۆم و خەرات
لە ناو چەقی دەلاڵخانە
مەزات، هەراج!!..
خەڵکی هەولێر
گۆرەوی بەن
لفکەی نایاب ، کەوچکی دار
دەسکێشی ڕەنگاو ڕەنگ
هەتا زووە ببەن بە بار
ببن بە بار...

هۆ کوردینه
هۆ خەڵکی شار!...
بۆ دانانی خشتی دیوار
یاخود بەردێ لەسەر مەڵۆ!...
داڵدەی جوچکەی چنگی هەڵۆ!..
دڵنیا بن .. لێ .. زانی ... بار ..؟!
لێ... زانی .. کار!.
وا ئێستاکە ، لەناو چەقی دەلاڵخانە
هەراج دەکەم
هەر کەلوپەلێکی کە هەم
هەرزان مەزات
هەرزان هەراج
بەلام ئەنجام
لێوی حەز هەر دەگا بە ماچ
عیسا دادەگیرێ لە خاچ!...
هەتا زووە
تا لە دەستان دەرنەچووە
ئەم دەرفەتە لە دەست مەدەن .
بۆ فرۆشتن
مت و موور
پورەدراو بە قالۆنچە و زەردەواڵە!..
شتی سەیر و وردە واڵە
***
لەو لاشەوە
لە پەنایەکی نەدیوی
کەس نەزان و نەناسەوە
لە ژێر کەوڵی مەینەتیدا

له ناو بەرگی پەلاسەوە
پیرەژنێ بە تیلەی چاو!...
دڵی پڕ لە ئاخ و زووخاو!...
پاسی گوڵ و ئابڕوو دەکا!...
نەوەک تەپکەی داوی پیسی زێڕ و دراو
دڵە پاکەکەی لێ بدزێ!...
ڕاوی بکەن
وەک کەروێشکی بێ ئاگا و
کار مامزێ!...
بۆ زەلکاوی فریو بخزێ!...
زەردەوالەی داوێن ، پیسی
شیلەی گوڵی لاوی بمژێ!...
لە بەرچاوی دۆست و دوژمن
قەترەی پاکی حەیای بڕژێ!...
بیکەن بەپەن!
ئابڕومان بەن!!
لە جێی هەپێ پێرس دەی تو تیو
لە باتی دیاری و جەژنانە
دەس لە ملان و بابە گیانە
بیری بۆ ماڵ، مشتو مڕی شوو!..
لە سەر شۆستەی تەڕ و شێدار
دڵ بە ئازار ، هەست بریندار
باوان شێواو و کۆست کەوتوو!..
کەزێی زەرد و ئەگریجەی خاو
چاوی شینی ئاسمانییان
لە ترسانا، لە برسانا
ئەبڵەق بووە، واقیان وڕماو!...

چۆن پەیا کەن
نانی ژینی پڕ لە زوخاو
لەبەر دوارۆژی تەنگ و تار
وەک ڕیشۆڵە و پۆلە کۆتری
بە تۆڕ گیراو!!!..
ڕیز چنراون ، داهێزراون
بۆ فرۆشتن
دەسکێشی جوانی ڕەنگاو ڕەنگ
گۆرەوی بەن
سەر کلاوی خوری نایاب
شتی دەگمەن
بەرماخێک و هەندێ توتن.
شتی دەگمەن..

**ئەم شیعرانە لە چەند بۆنەو کۆڕو فیستیڤاڵی شیعریدا خوێنراونەتەوە.**

# (٥٢)
# بەبۆنەی پرۆژەی لامەرکەزی ئەنجومەنی شاری سلێمانییەوە

لە دوادیدار لەگەڵ ڕەوانشاد (نەوشیروان مستەفا)، هاوڕێ و دۆستی بەڕێزو خۆشەویستم (ئازادی مستەفا خۆشناو) سەردانیکردم و وتی: لەم ڕۆژانەدا نەوە گیان دەروات بۆ لەندەن بۆ چارەسەری پزیشکی، چونکە ڕەوشی تەندروستی خراپەو لەوانەیە چاومان پێینەکەویتەوە، وتی من وەکو پزیشکێک دەڵێم دەروات و نایبینینەوە، دەڵیی چی سەردانیکی بکەین؟هەروەها وتی: من پێش ماوەیەک بینیومەو هەواڵی تۆی پرسیوە، نەوەکو کارێکی پێت هەبێت، منیش ئامادەییم دەربڕی، ئیتر ئازاد ڕۆژو کاتی بینینەکەی ئامادەکردو لەگردەکە لەخانوویەکی سادە، کە دوو تاک قەنەفەو کورسی و مێزێکی تێدا بوو، دیداری (نەوشیروان مستەفا)مان ئەنجامدا .ئێمە بڕیارماندابوو ١٠ تا ١٥ خولەک بمێنینەوە، بەلام ئەو زیاتر لە یەک کاتژمێر گلیداینەوەو دەستمان کرد بە قسەکردن، ئازاد: نەوە گیان، هەتا زوو بچیت بۆ چارەسەر باشترە، من وەک هاوڕێ و پزیشک پێتدەڵێم، نەوشیروان: باشە ئازاد باش، واز لەوە بێنە.

نەوشیروان ڕوویکردە من و وتی: هەڤاڵەکانت چۆنن؟

منیش وتم: لەگەرمەی شەڕی سەربازیی، سیاسیی و میدیاییدان لەگەڵ دەوڵەتی تورک و ئەم شەڕەشیان چارەنووسسازە، چونکە دەوڵەتی تورک بڕیاریداوە، ئەگەر بکارێت ڕۆڵی پەکەکە لە شانۆی سیاسی ناوچەکەدا لاوازو بێکاریگەر بکات .نەوشیروان مستەفا: ئەزانیت ئەوانیش لەم سالانەی دواییدا هەندێک هەڵەی ستراتیژیان کرد.

منیش وتم: بەڵی ڕاستە، کۆنگرەیان گرت و ڕەوشی خۆیانیان تێدا تاوتوێ کردووە.

ئینجا هاتینەوە سەر باسی خۆمان و ڕەوشی باشوور، وتم: کاک نەوشیروان کە لە ئەورووپا هاتمەوە، یەکسەر هاتمە لای جەنابت، لە ماڵی خۆتان دانیشتین، تۆ وتت: (حەز دەکەم تۆ نەڕۆیتەوەو لێرە بمێنیتەوە، بۆ هەموومان باشەو ئەمە ڕای (مام جەلال)یشە، لەبەینی خۆماندا باسمانکردوە)، هەندێک تێبینی گرنگیشت پێدام، هەروەها وتت: ئەگەر منیش نەهاتمەوە ئەوا (مام جەلال) ماوە، هەرچەندە ئێستا ئێمە جیاین، بەڵام هەردووکمان یەکڕامان هەیە لەسەر بوونی تۆ لە ناوچەکەو ئەو ناوەندگیریانەی کردووتە.

کاک ئازاد وتی: ئەوە ئەی پرۆژەکەت گەیشتە کوێ؟

ئازاد خۆشناو دووجار نامەی مام جەلالی لە ڤیەنا بردبوو بۆ نەوشیروان مستەفا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەو ئاگری شۆڕش بەرپابکەنەوەو سەرکردایەتی کۆمەڵە بکات!!

نەوشیروان مستەفا وتی: پرۆژەکەی من سێ خاڵی سەرەکی لە خۆگرتووە:

١ -هێورکردنەوەی نێوان ئێمەو یەکێتی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی میکانیزمی یەکگرتنەوە یان ڕێکەوتنی ستراتیژی! هەرچەندە ئەمە زەحمەتە.!!

٢ -ئۆتۆنۆمکردنی (لامەرکەزی دەڤەری سەوز).

٣ -سەربەخۆکردنی ئابووری دەڤەرەکە لەدەرهێنانی نەوت و غازدا. بەوەی خۆمان دەریبهێنین و بیفرۆشین..

وتم: ڕای (مام جەلال) لەمبارەیەوە چییە؟ نەوشیروان مستەفا: لەگەڵ ئەودا بە درێژی باسمکردووە، ئەو هەموو خاڵەکانی لاپەسەندە، تەنیا یەک (تەحەفوز)ی هەیەو دەڵێت: (نابێت پرۆسەی فیدراڵی تێکبچێت و ڕیسەکەمان ببێتەوە بەخووری)!! چونکە ئێمە تا ئێستا نەدەوڵەتین و نە سەربەخۆین لەم بڕیارە چارەنووسسازانەدا.

نەوشیروان مستەفا: ئەوە (ئەوان) لە ڕێگەی تورکیاوە بە ئاشکرا، بە بۆری و بەتەنکەر نەوت دەفرۆشن، ئەی ئێمە بۆ لە ڕێگەی ئێرانەوە نەیکەین؟ ڕوویکردە من و وتی: حەمە مین ئەو لیستە ببینە

زیاتر له ده هەزار تەنکەر، به ژمارەو ناوی خاوەنەکانیانەوە له دەڤەری ئێمەوە نەوت ئاودیوی ئێران دەکەن.

کاک ئازاد وتی: هەر وەکو دەزانن (ئەمریکا) ئەمبارگۆی لەسەر ئێران داناوە، ئەی ئەمە چۆن چارەسەردەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وایە، دەبێت لەگەڵ ئەمریکادا قسە بکەین و ئەمەش چارەسەربکەین، هەروەها وتی: من لەگەڵ مقامەتی بەرزی ئێراندا قسەمکردوە، لەگەڵیاندا ڕێککەوتووم، کە ئێمە لێرەوە بە بۆری نەوت و غازی سروشتی بگەیەنینە کەلار، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە بۆریەکان بگەینە ناوچەی کەلار (هەرچەندە ئەمە هەر قسەیەو نەبووە به پرۆتۆکوڵ)..

وتم: که وابوو ئیستا زەوینه بو یەکگرتنەود هەیه لەگەل یەکیتیدا.

تۆزێ گرژو مات بوو، وتی: دەی فەرموو چۆن؟!

وتم: سەد کەس لە ئێوە، سەد کەس لە یەکێتی، بەتایبەتی لە گەنجە هۆشیارەکان، کۆبوونەوەیەکی گەورەبکەن و ناوی لێبنێن کۆبوونەوەی هەوڵدان بۆدانانی میکانیزمی یەکگرتنەوەی گۆڕان و یەکێتی..

کاک نەوشیروان بەهەستێکی تۆزێ بێئومێدیەوە وتی: ئاخر یەکێتی یەک دەنگ وَ یەک ڕانین، باڵ و ڕەوتی جیاجیان، ئەزانی من کۆمەڵەم تێکەڵاوی یەکێتی کردەوەو لەناو یەکێتیدا توانەوە (هەندێ قسەی تریشی کرد).

وتم: ئێوە کۆمەڵێک کادیری لاوی بەتوانا، شارەزاو لێهاتووتان هەیە (لەهەردوو لادا)، با لەمانە سەرکردایەتیەکی نوێ دروستبکرێت، ئەوکاتە تۆ ئەتوانی به ئاسانی پرۆژەکەت جێبەجێبکەیت.

نەوشیروان مستەفا: من لای ئێوە دانی پێدادەنێم، لەوەدا هەڵەبووم، هەموو متمانەمدا بە لاوەکان.

وتمان: بۆچیی..؟

وتی: هەندێکیان تا ئێستاش بەرژەوەندی بالای گەل و هی خۆیان و حزبەکەیان لەیەک جیاناکەنەوە، هەندێکیان ئەزمونیان نییەو نهێنی

ناپارێزن، هەندێکی تریان زۆر حەز بە خۆدەرخستن دەکەن، بەڕاستی لە زۆریـان نائومێـدم!!!   بە داخەوە هەنـدێکیان بـوون بە سـێخوڕ بەسەرمەوەو هەندێک وردەکاری وردو سەیرو سەمەرەی باسکرد کە (ئێسـتا کـاتی بلاوکـردنەوەی نیـیە)، بەڵام کە لە چارەسـەر هـاتمەوە هەوڵئەدەم پـاک و پیسـێک بـکەم و ئـابووری ئەم دەڤەرە سـەربەخۆ بکەم و سلێمانی و دەوروبەری بکەین بە بەهەشت و گوزەرانی خەڵک باشتربکەین، ئـا بەم شـێوەیە منافەسـەو پێشـبڕکێی ئەودیوی دێگەڵەو دەڤەری زەرد دەکەین، چونکە ئێستا باوی شەڕەتفەنگ و شەڕەجنێوو شـەڕە (چەلەحـانێ) نەمـاوە، بە دەم چـایی خـواردنەوەوە، نەوشـیروان مسـتەفا ڕویکـردە مـن و وتـی: بە برادەرەکـانی قەنـدیل بڵـێ لە بەینـی ئیمەو ئەواندا چەندجار شـەڕو شـۆڕ ڕوویـداوە، ئەنـاوی منەوە پێیان بڵـێ: هەنـدێکی لەیەک تێنەگەیشـتن و هەڵەبـووە، هەنـدێکی دەسـتی دەرەکی تێدابووەو وای لە هەموومان کردووە دەستمان بچێتە خوێنی یەکتـری.من بە ئەمانەتەوە(پەیـامی کـاک نەشـیروانم گەیانـد)، بەڵام بە داخەوە کـاک نەوشـیروانم نەبینـیەوە هەتـا وەڵامەکـانی ئەوانـی پێبدەمەوە.هەر لە درێژەی قسەکانماندا وتم: کاک نەوشیروان نەوت لە عێراقـدا سـەری زۆر کەسـی خـوارد، لەسـەروو هەموویـانەوە عەبدولکریم قاسـم، ئەحمەد حەسـەن بەکرو دارو دەستەکەی، سـەدام حوسێن بە داگیرکردنی کوێت و چاوبڕینە نەوتی ئەوێ وایلێهات، وا ئێستا غازی سرووشتیشی هاتەسەر، بزانین سەری کێیتر دەخوات.

ئیتـر زۆر وردەکـاری نهێنـی و شـتی تـر باسـکران، کە ئێسـتا بـۆ بلاوکردنەوە ناشێن، من ئەوەندەم لە بیرمـاوە بە ئەرکێکی نیشـتیمانیم زانی، لەم کاتەدا بلاویبکەمەوە، لەوانەیە هەندێک پێیانناخۆش بێت، یان پێیـان خۆشـبێت، بەڵام مـن بلاوکـردنەوەییم بە باشـترزانی و شاهیدەکەشم زیندووە.هەروەکو ئاماژەم پێدابوو، نەوت سـەری چەند کەس و دەوڵەتـی خـوارد، ئێسـتەیش وا دەبینـین ئەردۆگـان لە پێنـاوی دەستبەسـەرداگرتنی نەوت و گـازی لیبیـادا، خەریـکە شـەڕو ماڵوێرانییەکی تازە لەو ناوچەیەدا هەڵدەگیرسێنێت.

# (٥٣)
# پیتەکانی گۆڤاری هەتاو و چاپخانەی حزب

ئەم چیرۆکە دەمانباتەوە بۆ سالانی (١٩٥٦ - ١٩٥٧) زەمەنێکی ئەفسووناوی، زەمەنی سادەیی، دڵسۆزیی، دڵپاکی، زەمەنی ڕێزگرتن لە هەموو بەها بەنرخەکانی کۆمەڵی کوردەواری و ساکاریی مرۆڤی ئەو کاتە.

ئەو کاتە حزبایەتی پیرۆز بوو، ڕووناکبیران پیشرەوی کۆمەڵ و ڕوشنکەرەوەی ڕیگە تاریکەکان بوون، چرابوون، کە دادەگیرسان لاوو هەرزەکارەکان لە دەوریان تۆپەدەبوون بۆ فێربوون، ڕێزیان لەناو کۆمەڵدا بێسنوور بوو، هەرچەندە بێدەرامەتی و هەژاریی زۆر بوو، بەڵام خەڵک ئاسودەو دڵخۆشبوون، یەکتریان خۆشدەویست.

ئەو کاتە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، هەرچەندە بەتەمەن گەورەو بە بالا کەڵەگەت بووم، لە پۆلەکەدا دیاربووم و زیرەکیش بووم، لەڕیزی پێشەوە دایان نابووم، زوو زوو هەڵیاندەستاندم بۆ شیعر خوێندنەوە (لە خوێندنی حوجرەوە من چوومە قوتابخانە) یەکسەر لە پۆلی چوارەم قبووڵکرام.

سەرگەرمی خوێندنەوەی شیعرو ئەدەب و سیاسەت بووم، لە ڕێگەی کاکە مەحمود، برا گەورەکەمەوە ئەدەبیاتی پارتی و شیوعیم پێدەگەیشت، منیش بۆ قوتابیەکانی هاوتەمەنی خۆمم دەخوێندەوە. هەرچەندە (کاکەم) لە بەرەی بالی پێشکەوتنخوازی هەمزە عەبدوڵلا بوو (الجناح التقدمي)، بەڵام من مەیلم هەر بەلای ڕەوتە چەپەکەدا بوو.

ئەوکاتە پێنجوێن شارۆچکە (ناحیە) بوو، (قۆمیسەر) یان یاریدەدەری(معاونی) پۆلیس حوکمیان دەکرد، قۆمیسەرێکی لێبوو

نـاوی (عەلـی غالیـب) بـوو، دوو کـوڕی هەبـوو شـیوعی بـوون، بەناوەکانی(حوسـێن و حەسـەن)، پشـووی هاوینەیـان لە پێنجـوێن بەسەردەبرد، حوسێن تازە لەبەندیخانە بەربووبوو، زۆربەی کات لە پێنجـوێن دەمـایەوەو لەگەڵ گەنجەکـانی ئەوسـادا پێوەنـدی دروسـتکردبوو، لە دوکـانی (تـایەری میـرزا ئەحـمەد) بـرای حـاجی ڕەشید، کە دوکانی پێڵاو فرۆشیی هەبوو، دادەنیشت، لەبەر ئەوەی دراوسێی دوکانی باوکم بوو، کە حوسێن دەهات منیش دەچووم لە دوکـانەکەی ئەو دادەنیشـتم، لەوێ گـوێم لە وشەی(سۆسیالیسـت، دیموکراسـی، کۆمۆنیسـتی، ئاشـتیخوازو بۆرژوازی) بـوو، دەهـاتم لە کاکەمم دەپرسی بەمانە مانایان چییە؟

ئەویـش بە گـوێرەی تێگەیشـتنی ئەوسـای مـن !!! بـۆی شـرۆڤە دەکردم، ڕۆژێک مامە تایەر پێیوتم: ئیشێکی گرنگم پێتە. وتم چییە؟

وتـی: لەگەڵ ئەم هـاوڕێیە دەچیت بۆ سلێمانی، لەوێ پێت دەڵێن کارەکە چییە، وتم باشە با پرس بە کاکەم بکەم؟!

بە کـاکەمم وت، وتـی: لەم کـارەدا سـەرکەوتوو بیـت، پلەیەک لە حزبدا ئەچیتە پێشەوە.

لەگەڵ هـاوڕێ حوسـێن هـاتینە سلێمانی، لە سـەرکارێز لە ماڵێـک داینـام، وتـی: شـەو دێن بۆ لات و باسـی کـارەکەت بۆ دەکەن، شـەو هـاوڕێیەکی بـاڵابەرزی سمێڵڕەشـی جوانخـاس هـات، ژنێکـی عەبـا بەسەری لەگەڵدا بوو، وتی بەیانی لەگەڵ ئەم هاوڕێ ژنە، دەچیت بۆ هەولێـر، لەوێ پێتـدەڵێن کـارەکەت چیـیە؟ (مـن شـەو تـا بەیـانی نەنووسـتم، داڵـغەم لێدەداو بیرمدەکردەوە ئەم کارە چییە؟) ئایا پیاو کوشتنە؟ خۆ من نازانم دەمانچە بەکاربێنم، دزییە خۆ من هێشتا فێری ئەوشتانە نەبووم، بەهەر حاڵ بەیانی هاوڕێ ژنەکە هاتوو، چووین بۆ هەولێر، لەوێ لە گەڕەکی عارەبـان بـردمیە ماڵێـک، نـان و ماسـت و چاییـان پێدام، ئینجـا هـاوڕێی هاوسـەفەرم وتـی: ئێسـتا بـا بڕۆین، کە هـاتینە دەرەوە جـادەو کـۆڵانی گەڕەکـی عارەبـانی نیشـاندام و پێـی

ئاشناکردم، ڕۆیشتین تاگەیشتینە بەر چاپخانەکەی (گیو موکریانی)، وتی: ئەو سندووقانەی دەیانبینیت پیتی چاپکردنی تێدایە، وتم: بەڵێ، وتی: ئەو کاغەزانە دەبینیت کە پیتەکانی لەسەر نوسراوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: چنگێک لە پیتی کاف و جیم بفرێنەو بگەڕێوە بۆ ئەو ماڵەی لێوەی هاتین، ئیتر وەک ئەوەی بیسمیلای لێبکەیت، لەبەرچاوم ونبوو، کارەکەم ئەنجامداو گەڕامەوە ماڵەکە، لەوێ دشداشەو چاکەتێک و جووتێ نەعلیان بۆ هێنام، جلەکانی خۆمیان لێوەرگرتم و ئێستەش داخی ئەوجووتە کڵاشە هەورامیەم هەر لەدڵدایە، کە بە جووتێ نەعل لێیان گۆڕیمەوەو سواری تەکسیەکیان کردم بۆ کەرکوک، لە وێشەوە بۆ سلێمانی و چوومەوە ماڵەکەی سەرکارێز، شەو هاورێ جوانخاسەکە هات بولام، پیتەکان کە لە کاغەزەوە پیچرابوون دامە دەستی، وتی: هاورێ تۆ کارێکی گەورەت ئەنجامداوە بۆ حزب، چونکە چاپخانەکەمان ئەم دوو پیتەی نەمابوو، ئیتر لەمەودوا زوو زوو بەلاڤۆکەکانمان چاپدەکەین، منیش لە خۆشیا خەریکبوو بفڕم!!

دوایی پەستیەک دایگرتم، هاورێکە وتی: بۆچی پەست و مات دیاریت؟ وتم: من لە ژیانمدا دزییم نەکردووە، ئەگەر برادەرەکانیشم کارێکی وایان کردبێت، یان لە باخەکانی پێنجوێدا میوەیان بێپرس ڕنیبێت، من ئامۆژگاریم کردوون و بەکارێکی ناجۆرم زانیووە، ئێستا من خۆم دزییبکەم و خۆیشم پێ قارەمان بێت؟ هاورێکەم توزێ خۆی گرژکردو وتی: هاورێ ئەمە دزیی نییە، چالاکییەکی شۆڕشگێڕانەیە، ئینجا کەوتە قسەکردن بە دەنگی بەرز، نیمچە سیمینارێکیداو وتی هاورێیان گوێبگرن، ژوورەکە چوار پێنج کەسێکی تری تێدا بوو وتی: لە حزبدا هاورێیەکمان هەیە کە هاورێ (فەهد) ناوی ناوە (اللص شریف) ئەم هاورێیە، لە شەریکەی نەوتی کەرکوک کاریدەکرد، ئەوکاتەی حزب پارەی نامێنێت داوا لەم هاورێیە دەکەن لەشەریکەی نەوت دزی بکاو بیفرۆشێت و پارەکەی بهێنێت بۆ حزب، هاورێیەکی کۆمیتەی ناوەندیی سەرپەرشتی ئەم کارانەیکردووە، ناوی (هادی

هاشم الاعظمي) بوو، ئەمە کارێکی نیشتیمانی بوو، چونکە لەلایەک زیانیگەیاند بە (ئیستعماری بەریتانی)، لە لایەکی ترەوە، حزب لە بێپارەیی و تەنگژەی ئابووری ڕزگاریبوو، کارەکەی تۆیش ئەچێتە ئەو چوارچێوە نیشتیمانییەوە، هاوڕێ خۆ ئێستاش لەم زەمانەدا دزی قارەمان و ئەشرافمان زۆرە!!!

هەندێک ڕێکەوتی سەیرو سەمەرە لەم چیرۆکەدا هەیە:

١ -لە شەستەکاندا لەگەڵ (حوسین و حەسەنی عەلی غالب) لە لیژنەی قەزای هەڵەبجەی حزبی شیوعی یەکمانگرتەوە، حوسین بەرپرسی قەزا بوو، منیش بەرپرسی شاری هەڵەبجە بووم، واتە دوای هەشت ساڵ یەکمان بینیەوە..

٢ -ئەو پیاوە جوانخاسەی پیتەکانی لێ وەرگرتم (مامۆستا فەرەج ئەحمەد) بوو، هەتا مردیش هەر برادەرم بوو.

٣ -ئەوهاوڕێ ژنەی لەگەڵم هات بۆ هەولێر، تێکۆشەرێکی دیار بوو، لەگەڵ (کامیل)ی برایدا لە لیژنەی قوتابیان پێکەوە کارماندەکرد زۆر شەو لەماڵیان دەماینەوە.

٤ -ئەو (لصە شریف)ەی، هاوڕێ فەهد باسیکردوە (سەید عەلی مەنەدەلاوی) بووە،کادرێکی کرێکاری شیوعی ناسراوبوو لە چل و پەنجاکاندا ڕۆڵی هەبوو، لە ساڵی شەست و چواردا لە بنکەی (ئاوەگرد) یەکترماننناسی، من باسی دزینی پیتەکانی گۆڤاری هەتاوم بۆ دەکرد، ئەویش باسی دزیەکانی شەریکەی نەوتی (ئیستعماری بەریتانی) بۆ کردم.

لە یەکێ لەو دزیە سەیرانە، وتی ئەندازیارێکی هیندیمان لابوو، ژوورەکەی کەلوپەلی زۆری تێدا بوو، ژورەکەیم پێچایەوە، کە سەیرم کرد موستیلەیەکی نایابی ئاڵتوونی لە پەنجەدا بوو، چوومە سەری و ویستم موستیلەکە لەپەنجەی داکەنم، لە ترسا خۆیکرد بە خەوتوو بۆ ئەوەی نەیکوژم، موستیلەکەم بۆ دەرنەدەهات، پەنجەیم کرد بە

دەممداو تەڕم کرد، ئینجا موستیلەکەم لە پەنجەی دەرهێنا، ئیتر ئەو خۆیکرد بە خەوتوو، منیش ژوورەکەم بەجێهێشت.

٥ -حوسێنی عەلی غالب بۆی گێرامەوە: ئەوکاتەی ماڵمان لە پێنجوێن بوو، فەرمانێک لە بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی بەغداوە دێت، کە دەبێت ماڵی قۆمیسەر عەلی غالب بپشکنرێت، لەبەرئەوەی کوڕەکانی شیوعین، بەڵکو بەڵگەیەکمان لەسەر بدۆزنەوە، وتی بە ناچاری باوکم (قۆمیسەر) و (مدیرناحیە)و موختاری پێنجوێن هاتن و ماڵەکە گەڕان هیچیان نەدۆزیەوە، چونکە پێش هاتنی ئەوان، دایکم هەموو شتەکانی ئێمەی شاردبووەوە..

٦ -زۆر داوای لێبوردن لە ڕۆحی مامۆستای گەورە (گیو موکریانی) دەکەم و داواش لە دکتورە کوردستان موکریانی دەکەم لە حزب خۆشبن، سکاڵامان لەسەر تۆمارنەکەن لە دادگا، چونکە ئەوە خۆم دانم بە هەموو ڕاستییەکاندا ناوە.

هەر پێوەند بە دزینی پیتی کوردی لە مام گیو، دکتۆرە کوردستان لە دەمی باوکییەوە، گێڕایەوە: کاتێک لە ڕەواندوز باوکم و مامم(حوزنی موکریانی)، خەریکی دەرکردنی گۆڤاری(زاری کرمانجی) دەبن، کێشەی هەندێک پیتی کوردییان دەبێت، مامیشم لە دار پیتەکانی(گ،ڤ،ژ،ێ) دروستدەکات و گۆڤارەکە چاپدەکەن و مژدەی لەمەودوای ئەلفوبێی کوردیش بە خوێنەرانی گۆڤارەکە دەدەن، ئیتر کۆمەڵێک مەلا لەڕەواندز دەیکەنە هەلاو خەڵک هاندەدەن کە پیتە کوردیەکان بدزن و دوکانە کەش تالانبکەن، هەڵدەکوتنە سەر چاپخانەکەو ئەوەی دەستیان پێدەگات دەیدزن و تێکدەدەن، بەلام باوکم و مامم هەر سوردەبن و گۆڤاری زاری کرمانجی و ئەلوف و بێی کوردی بەردەوام بێت، عەلمانی و لاهووتی پێکەوە دزیان لە گیو موکریانی کردووە.

# (٥٤)

# گەشتێك لە تەك شۆفێری شەمەندەفەری میزۆپۆتامیادا

لەو کاتەدا بەڕێوەبەری ئینستتیوتی کوردیی بووم لە بەرلین، زۆرجار وتاری ڕۆژنامە تورکییەکانیان بۆ ئەکردم بەکوردی، بەتایبەتی ڕۆژنامەی (ڕادیکال و ئوزگور پۆلەتیک)، ئێمەیش ئەرشیفمان دەکردن، لەمەوە گوێم بەناوی ڕووناکبیرێکی تورک (جەنگیز جاندار) ڕاهات، چونکە بەشێک لەوتارەکانی لەسەر کوردو دۆزی کوردبوو، ئەو دۆستێکی نزیکی (مام جەلال و نەوشیروان مستەفا) بوو، پێوەندییەکی گەرموگوڕیشی لەگەڵ سەرۆک (ئۆچەلان)دا هەبوو.

ئەو لە دوای کودەتای سەربازیی ١٩٨٠، لەگەڵ زۆرینەی گروپە چەپەکانی تورکیا ڕایانکردبوو بۆ سوریا، لەوێ فێری زمانی عەرەبی بووبوو، لەمەوە هەڵی پێوەندییەکی فراوانی لەگەڵ سیاسەتوان و ڕۆشنبیرانی کورد و عەرەبدا بۆ ڕەخسابوو، ئەو خۆی بە (ماوی)یەکی شۆڕشگێر لە قەڵەمئەدا، هەر ئەوەبوو لە (مام جەلال) نزیکی کردبووەوە..

ڕۆژێک لە سکرتاریەتی (مام جەلال)ەوە، پێیانوتم ئەمڕۆ میوانێک لە ئیستەنبوڵەوە دێت، دەخوازێت سەردانی قەندیلبکات و پێویستە من بچم بۆ فڕۆکەخانە وەریبگرم و کارئاسانی سەفەری قەندیلی بۆ بکەم، میوانەکە نووسەرو ڕۆژنامەڤان(جەنگیز جاندار) بوو.

ئەو پرسیاری زۆری لەبارەی ڕەوشی سیاسی، کۆمەڵایەتی، سەربازیی و جوگرافیی دەکرد، ئیتر من زۆر بەهەستیارییەوە وەڵامم دەدایەوە.

منیش کەوتمە پرسیارکردن لە بارەی ڕەوشی سیاسیی تورکیا، هەروەها لە بارەی پرسی کوردو ڕێگەچارە بۆ دۆزی کورد؟ ئایا دەوڵەتی تورک بە نیازە چارەسەرێک بدۆزێتەوە بۆ ئەم دۆزو پرسە؟ سەبارەت بەدۆزی کورد وتی: (ئەردۆگان دەیەوێت پرسی کورد بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت لە چێوەی دەوڵەتی تورکیادا، بە ڕێگەدان بە زمان و کولتووری کوردی و هەندێ مافی سەرەتایی نەتەوەیی، چارەسەر بکات.

دەیەوێت لەم ڕێگەیەوە خەونە دێرینەکەی (ئۆزال) بە لکاندنی باشوور بە تورکیاوە بێنێتەدی، ئەویش بەمەرجێک لە ژێر سایەی ئاک پارتی و لەچوارچێوەی (تورکیای مەزن و دەوڵەتی عوسمانی مودێرن)و ئیسلامیی ئیخوانیدا، بە باوەڕی ئەو تاکە کۆسپ بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە پەکەکەو ئاڵۆزیی دۆزی کوردە.

وتم باشە لەم سەردەمەدا ئەمە سەردەگرێ؟ وتی: زەحمەتە، هەموو ئەمانەیش بەدرێژی لەگەڵ هەڤالانی قەندیل باسدەکەم، شەوێک لە قەندیل مایەوە، لە گەڕانەوەماندا لێیپرسیم وتی: دەڵێن تۆ کۆمۆنیست بوویت؟ ئیتر من باسی ڕۆڵی (حزبی شیوعی)م بۆ کرد، کە ڕۆڵێکی پۆزەتیڤیان هەبووە لە سەرپرسی نەتەوەیی کورد، زۆر زیاتر لە حزبی شیوعی تورکی و حزبی تودەی ئێرانی، ڕەنگە هەر بەراوردیش نەکرێت، بەدرێژی باسی باڵباڵێن و هۆی پووکانەوەی ڕۆڵی شیوعییەکان لەدوای پارچەبوون کرا، ئەمە سەرباری دارمانی بلۆکی سۆڤیەت.

باسمان لەڕۆڵی بزاڤی چەکداری چەپی مارکسی کرد، کە بەرەو کاڵبوونەوە دەچێ و لە جێی ئەوان جوڵانەوەی پۆپۆلیستی جێگەی دەگرێتەوە، باسی ئەوەم کرد کە چەند جارێک لەبەغدا سەردانی باڵیۆزخانەی دەوڵەتی (چین)م کردوە، لەوێ بەرپرسی سیاسی و حزبی باڵیۆزخانەم بینیوە، جگە لە پەرتووکە سوورەکەی(ماو) هیچ شتێکیترم دەستنەکەوتووە، جەنگیز زۆر کەیفی بەوە هات کە مەیلی

ماویەتیم هەبووە، ئەویش باسی ئەوەی کرد لە دیمەشق چەندجار چۆتە باڵیۆزخانەی چین لە پەرتووکە سوورەکەی (ماو) زیاتر هیچی تری نەبینیووە.

وتی: (لە زەمانی حوکمی تورکۆت ئۆزالدا لێبووردنی گشتی بۆ ئۆپۆزسیۆنی تورکیا بە چەپ و ڕاستیەوە، بە ڕوونـاکبیرو سیاسییەکانیەوە دەرچوو، ئێمەش لەوانەبووین کە گەڕاینەوە، هەتا بوومە سکرتێری ڕۆژنامەوانی (ئۆزال)، هەر لە ڕێگەی منەوە بوو، سەرکردەکانی باشوور بگەنە لای سەرۆک وەزیران(ئۆزال)، هەر لە ڕێگەی ئێمەوە بوو، دیالۆگی ئاشتەوایی لە نێوان (ئۆچەلان و ئۆزال)دا، پێکهات، ئەوە بوو لە پرێس کۆنفراسێکدا بە ئامادەبوونی (جەلال تالەبانی و کەمال بورقای)و چەند کەسایەتییەکی تری کورد. ئاگربەستی یەکلایەنە لەلایەن ئۆچەلان ڕاگەیەندرا.

لەگەڕانەوەماندا لە قەندیل، سەردانی هەڵەبجەی شەهیدمان کرد، دوای بەسەرکردنەوەی مۆنۆمێنتەکە، چووینە زیارەتی گۆڕستانی شەهیدان، بینیم لەژێر چاویلکە پانەکەیدا دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک لەچاوی دەباری، هەرچەندە ئەو دەیویست کەس بەم فرمێسکانە نەزانێ، بەڵام من بینیم.

لەگەڕانەوەماندا بۆ سلێمانی، لێم پرسی لکاندنی باشوور بە تورکیاوە بە شێوەی داگیرکردن یان کۆنفیدراڵی لە ڕێگەی ئابوورییەوە چەند داستانی وەکو هەڵەبجەی لە دوایە؟ وتی: دووبارەبوونەوەی کارەساتی هەڵەبجە ئاسان نییەو هیوادارم لە باکوور کارەساتی وا ڕوونەدات.(بەداخەوە لە جەزیرە، سلۆپی، گەڤەر، سووری ئامەد کارەساتی هەڵەبجە دووبارەبووەوە.

جەنگیز وتی: لە سەفەرێکماندا بۆ شانشینی سعودیە چاومان بە مەلیک (فەهد) کەوت، ئۆزال پێیوت: ئەگەر ئێوە ڕازیبن، من بە هێزی سەربازی کەرکوک داگیردەکەم، چونکە موڵکی عوسمانیەکانی ئەژدادی ئێمەیەو لەناو نەخشەی (میساقی میللی) دایە، هەروەها ئۆزال

وتوویەتی ئێمە ئابووریمان دارماوە، یا ڕێگەمانبدەن ئەم کارەبکەین، یان قەرزێکی سەد ملیاریمان بدەنێ بەبێ قازانج، وەلامی(مەلیک فەهد) ئۆزالی نائومێد کرد، چونکە وتی: من قبولناکەم نیشتمانی عەرەب پارچەبکرێت. لەمانەوە دەردەکەوێ پرۆژەی داگیرکردنی کوردستان کۆنە.

ساڵی (٢٠٢٣) پەیمانی لۆزان ئێکسپایەر دەبێت، ئەردۆگانیش بە تەمایە لەئەستەمبوڵەوە خەلافەتی ئیسلامی عوسمانی ڕابگەیەنێ و باشوورو ڕۆژئاواش لە نەخشە نوێیەکەدا دیاریبکات، هەرچەندە ئێستا بە هێزی سەربازی شوێنە ستراتیژییەکانی باشوورو ڕۆژئاوای داگیرکردوو و تانکەکانی ئەردۆگان چەند کیلۆمەترێک لەسەر چاوەی غازو نەوتەکانمان دوورن.

ئێستا جەنگیز چاندار ڕایکردووە لە ئەوروپا دەژی، لە ساڵی ٢٠١٧ لە ستۆکهۆڵم-یەکترمان بینییەوە، یادگارەکانمان وەکو پانۆراما هەڵدایەوەو ڕەوشی سیاسیمان هێنایەوە بەرچاو، وتی: ئەردۆگان بەسیاسەتی ئابووری پەکەکەو باشوورو ڕۆژئاوای بۆ(ڕاونەکرا)، ئێستا خەریکە بەهێز ئەو کارە دەکات، لەوانەیە چەند هەڵەبجەو جینۆساید دووبارەببێتەوە، بەقەندیل و کاربەدەستانی باشوور بڵێ بەجیدی بیر لە چارەنووسی میللەتەکەیان بکەنەوە.

تێبینی:

١) شەمەندەفێری میزۆپۆتامیا - کتێبە بەناوبانگەکەی جەنگیز جاندارە، بۆ چەندین زمان وەرگێڕدراوە.

٢) هەندێک لە سەرانی سیاسی باشووری کوردستان لەساڵی نەوەتەکاندا، لێدوانیان بۆ کەناڵی BBC داو ڕەواجیان بەلکاندنی باشوور بەتورکیاوە دەکرد، پاساویشیان ئەوەبوو کە کارئاسانییە بۆ خەباتی گەلی کورد، چونکە ئەو کاتە لە جیاتی چوارپارچە، لەسێ پارچەدا، خەبات بۆ مافەکانمان دەکەین.

# (٥٥)
# هەندێك بیرەوەری ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ (هاوڕێ ئارام - شاسوار جەلال)

لە ساڵەكانی ١٩٧٠ - ١٩٧١ لەبەغدا دەژیام و وەكو نووسەر لەڕۆژنامەی (هاوكاری) دامەزرابووم. زۆربەی ئەدیب و ڕووناكبیرە ناودارەكانی كورد، لەوێدا نووسینی خۆیان بڵاو دەكردەوە، جگە لەوەی لەلاپەڕە هەشتدا گۆشەیەكم بەناوی (ڕەش و سپی) هەبوو، هەفتانە لەژێر ناوی (ڕەوا)دا دەمنووسی و چوار ساڵی خایاند.

لەبەشی سیاسەت و ڕووناكبیریشدا وتاری سیاسی و ڕوشنبیریم دەنووسی و بەناوی (جەمال) بڵاومدەكردەوە، ئەو كاتە شەهید (ئارام)یش لەوێ كاریدەكردو وتاری سیاسیی دەنووسی، زۆربەی نوسینەكانی لەسەر ئەزموونی كۆریای باكوورو چین و ڤێتنام بوون، ئەو كاتە بزاڤی شۆڕشگێڕی ماركسی لە ئاسیا، ئەفریكاو ئەمریكای لاتین باوبوو، هەوادارو لایەنگری زۆربوو، منیش لەسەر بزاڤی شۆڕشگێڕی ئەو سەردەمە دەمنووسی، بە تایبەتی بزاڤی چەپڕەو و شۆڕشگێڕانەی ڤەنزویلا، ئەنگۆلاو مۆزەمبیق، ئیتر لەگەڵ هاوڕێ شاسواردا بووینە برادەرو زۆرجاریش لەسەریەك مێز دادەنیشتین و نووسینەكانی خۆمانمان گەنگەشەدەكرد.

ئەو سەردەمە سیاسەتوان و ڕۆژنامەوانی بە توانا ڕەوانشاد (حیلمی عەلی شەریف) بەڕێوەبەرو سەرنووسەری هاوكاری بوو، زۆرجار لەگەڵ شەهید ئارام و كاك حیلمی دادەنیشتین و باسی ئەوەمان دەكرد، كورد پێویستی بەپارتێكی نوێ هەیە، كە سەركردایەتییەكەی كەسانی ماركسی و شۆڕشگێڕبن و پرۆگرامەكەیشی كوردستانی بێت و لە ڕێگەی شۆڕشی چەكداریی و شەڕی پارتیزانیەوە خەبات بكات بۆ ڕزگاریی كوردستان.

هەمووجارێ شەهید ئارام دەیوت: پێویستە ئەزموونی چین و ڤێتنام لەبەرچاوبگرین، بەڵام کاک حیلمی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەزموونی کۆریای باکور باشترین هەڵبژاردەیە بۆ کورد، شەهید ئارام لەسەر ئەوە سوور بوو، کە دەبێت ئەم قسانە بکەینە (پراکتیک)و هەنگاوی ڕاستی بۆ هەڵێنین، دەیوت: دەبێت لە سفرەوە دەستپێبکەین و پشت بە توانای خۆمان ببەستین و وابەستەی هیچ لایەنێکی دەرەکی نەبین. ئەو کاتە من زیاتر خەتی کاسترۆو جیڤارام بەلاوە پەسەندبوو، باوەڕم بە پارتیزانی ناو شار هەبوو.

پێوەندیم لەگەڵ هاوڕێ ئارام بەردەوامبوو، هەتاکو جارێک وتی: کاکە تۆ ئەوەندەت لەسەر ئەنگۆلاو مۆزەمبیق نووسی، خۆیان ئەوەندەیان لەسەر خۆیان نەنووسیوە، کاکە ئەزموونی ڤیتنام و کۆریا بۆ ئێمەی کورد نزیکترە، پێویستە خوێنەری گەنجی کورد بەو ئەزموونانە ڕابێنین.

شەهید ئارام پێوەندییەکی باشی لەگەڵ باڵیۆزخانەی کۆریاو چین هەبوو، جارجار منیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، لەباڵیۆزخانەی چین جانتایەک لەکتێبە سوورەکەی ماویان پێداین، لەباڵیۆزخانەی کۆریاش شووشەیەک شەرابی نیشتیمانیی خۆیانیان پێداین، کە لە گێزەر دروستکرابوو.

شەهید ئارام نموونەی ڕاستگۆیی و ڕەوشتبەرزی و مارکسییەکی شۆڕشگێڕی گەشبین بوو، لە ڕێگەی دۆست و ناسیاوەوە من ئاگاداری جموجوولی دروستکردنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی بووم، ئارامیش لەگەڵ ئەواندا خەریکبوو، چونکە جارجار لە بەغدا کۆبوونەوەیان دەکرد.

نووسینی من و ئارام کە لەڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاومانەدەکردەوە، زۆر لەیەک دەچوو، هەندێ خوێنەر کە ئێمەی نەدەناسی وایدەزانی نووسینی یەک کەسەو بەناوی جیاجیا بڵاودەکرێتەوە.

شەهید دڵشاد مەریوانی هاتە لام وتی: لەشاخ نامیلکەیەک لەسەر شەهید ئارام چاپدەکرێت، ئەگەر بیرەوەریت لەگەڵیدا هەیە بینووسە، من ئەو کاتە شتی زۆرم لە بیرمابوو، هەموویم نووسی و دامەدەست دڵشاد مەریوانی.

جارێک لە گۆشەکەی خۆمدا لە هاوکاری وتارێکم نوسی (پەنتاگۆن ئاژەڵیش بەدخوو دەکا)، پاش ماوەیەک لە بڵاوکردنەوەی، لە باڵیۆزخانەی بولگاریا، لە ڕێگەی مامۆستا (کەریمی حوسامی)ەوە بانگهێشتیانکردین بۆ ئاهەنگێک، منیش شەهید ئارامم لەگەڵ خۆمدا برد، لەوێ باسی وتارەکەی منیان کردو زۆر پێیانخۆش بوو، هانیاندام لەو بابەتانە زور بنووسم. ئینجا شەهید ئارام بە ئەزموونی (کۆریا و چین)دا هەڵیداو بە گونجاوی ناساند بۆ ڕەوشی کورد، بەڵام کەوتە شکاندن و ڕەخنەگرتن لە سۆڤێتییەکان، بولگاریەکان بەمە توڕەبوون و ڕویانگرژ کرد، ئیتر هەڵساین و یەکی قاپێک شەرابی نیشتیمانیان بەدیاری پێداین، کە هاتینە دەرەوە ئارام بتڵەکەی خۆیدا بەزەویداو شکاندی، وتی: من شەرابی ئەم (تەحریفیانە) ناخۆمەوە، کاک کەریمش وتی: کاکە بۆ نەتدا بە من، من سی ساڵە لەم جۆرە شەرابە دەخۆمەوە.

**تێبینی:**

ئەم نوسینە لە٢٠٠٢/٩/٢١ لە سەر داوای مامۆستا (شێخ محەمەد سۆڵەیی) نووسراوە، چونکە کتێبێکی لەسەر ژیان و خەباتی شەهید ئارام نووسیوەو لەوێدا بڵاوکراوەتەوە.

## (٥٦)

# هونەرمەندی گەورەی کورد
# دکتۆر قادر دیلان

دیلان ئەو هونەرمەندە دەنگخۆش و موزیسیانەیە، کە موزیکی هونەری کوردی زیندووکردەوە، بەش بەحاڵی خۆم بە (باوکی) ئاوازو هونەری ڕەسەنی کوردی دادەنێم، دیلان ئاوازو دەنگ و سەدای کوردی برەوپێدا. ڕوحی بە بەرداکردو گوێچکەی گەنج و لاوانی کوردی پێئاشناکردو زرنگاندیەوە.

ساڵی (١٩٥٧) تیپی میوزکی مەولەوی دامەزراندو خۆی سەرۆکی تیپەکە بوو، بەرهەمە هونەرییەکانی مەولەوی، پەیامی هونەری کوردیی لە ئاستێکی بەرزدا گەیاندە گەلانی دیکە، لە ناوخۆیشدا هەنگاوێکی گەورەبوو بۆ برەودان بە موزیکی کوردی.

دوای خزمەتێکی زۆر لەبواری هونەردا لەوڵات، بۆ خوێندنی زانستیی مۆزیک چووە پراگی پایتەختی چیکۆسلۆڤاکیا، بەبلیمەتی و زیرەکی خۆی بەسەرکەوتوویی بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێنا، بەهۆی کودەتای (١٩٦٣) ڕێگەی گەڕانەوەی وڵاتی لێبەسترا، هەر لەو پەیمانگایەی دەرسی تێداخوێندبوو، بووەوە بە مامۆستا.

بۆ ئەو کاتەدا دیلان یەکەم کورد بوو، بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێنا، هەروەها یەکەم کوردبوو سەمفۆنیای کوردی بەرهەمهێناوەو نۆتەی سەمفۆنیای هەڵەبجەشی نووسیوەتەوە؟

کە چوومە ئەوروپا کەوتمە چالاکیی ڕووناکبیریی و سیاسی، گەڕام بە دوای ناونیشانی ئەو ڕۆشنبیرو هونەرمەندو سیاسییە تێکۆشەرە کوردانەی ئاوارەو پەرتەوازەی ئەورووپا بووبوون، لە پراگ دیلانم دۆزیەوە، بانگهێشتمکرد بۆ کۆبوونەوەیەکی هونەرمەندانی کورد لەبەرلین، ئەو زۆر کەیفخۆشبوو بەوەی ئێمەی بینییەوە، لەوە

زیاتر هونەرمەندانی (تاراوگە) باوەشیان بۆ کردەوە، وەکو خۆی وتی: واجارێکی تر گیانی هونەریم وەکو گوڵێکی پەژموردە گەشایەوە.

زۆرجار بەهاوڕێیەتی هونەرمەندی دەنگخۆش خالید ڕەشید دەهات بۆ لامان، ئەوکاتە دیلان لەڕەوشێکی سایکۆلۆژی و تەندروستی و ئابووری ناهەمواردا بوو، بۆ زۆر کۆبوونەوەو کۆنفراس و گەڕان لەگەڵ خۆمدا دەمبرد، بەڕووناکبیران و هونەرمەندانی باکوورم ناساند.جارێک کۆنفرانسی هونەری موزیکی میللی کوردیمان لە شاری کۆلن سازکرد، نزیکەی (٣٠) تیپی میللی تییدا بەشداربوون و حەوت ڕۆژی خایاند. جەماوەریکی زۆری کوردو ئەڵمان بینییان، وتم ها مامە دیلان بە لاتەوە چۆنە؟ ئەو منی ناونابوو (شێخ مەحموود) بەپێکەنینەوە وەڵامی دامەوە: یاشێخ بە تەڵاقم ئەگەر(ئۆچەلان) بەچەک کورد ڕزگارنەکات، بەم دەهۆڵ و زوڕناو تیپە میللیانە کورد دەگەیەنێتە ئامانج.

لە شاری دوسلدرۆف لەئەڵمانیا کۆنگرەی یەکەمی هونەرمەندانی کوردستان (لە دەرەوەی وڵات) مان بەست و سێ ڕۆژی خایاند، لەوتاری کردنەوەی کۆنگرەکەدا قادر دیلانم بە ئامادەبووان ناساندو باسی ژیان و شاکارە هونەرییەکانیم کردو پێشنیارمکرد لە پاداشی ئەو خزمەتەدا بەسەرۆکی هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات هەڵیبژێرن.

بەختەوەرم کە توانیم لە پایزی تەمەنی دیلاندا لەکاتی وەرینی گەڵاو گوڵەکانی خەزانی ئەو هونەرمەندە ئاوارەو دووروڵاتە کەمێ گوڵی دڵی بگەشێنینەوە.بەهاوڕێیەتی(شمشاڵە مەحزونەکەی)و دەنگە بە سۆزەکەی خالید ڕەشید، دیلانمان لەچەند شارو شوێنی خۆشی ئەڵمانیاو ئەوروپا گەڕاند، هەموو جارێک دەیوت: کوڕینە ئەوەندە دڵخۆشم وائەزانم لە سەیرانی سەرچنارو ئەحمەدئاوام.

زۆرجار شیعرەکانی خۆمم بۆ دەخوێندەوە، ئەویش بە دەنگە خۆشە تایبەتییەکەی دەیووتەوە، جارێک وتی یا شێخ لەسەر ئەم شیعرانەی تۆ(من عاشقم)، (هەپی پێرس دەی تو یو) نۆتەی پارچەیەک

مۆسیقا دەنووسمەوە، ئیتر نە مەرگ مۆڵەتی ئەویدا، نەزەمەنیش لە بەرژەوەندی مندا بوو. ئەو کاتەی لە بەرلین بووم، دیلان لە پراگ بوو، زووزوو دەهات بۆ لام، جارێک وتی یاشێخ زۆر حەزم لە گیپەیە، منیش روومکردە دلێر تاڵەبانی، (چونکە لەگەڵ دلێر لەیەک ماڵدا دەژیاین)، دلێر تێگەیشت وتی: من هەموو شتێک ئامادەدەکەم، دلێر بەیانیان زوو دەچوو بۆ سەرکار، بەیانییەک زوو خەبەری کردمەوە وتی: هەموو شتێک ئامادەیە تەنها تۆ هەر ئەوەندە برنجەکە بکەرە ناو گیپەکانەوەو بە دەرزی و دەزوو بیدوورە، هەر کاتێک ئاوەکەی هاتە کوڵ بیانخەرە مەنجەڵەکەوە، من هەموو ماڵەکە گەرام دەرزی و دەزووم نەدوزیەوە، ئینجا بە مەکینەی دەرزی(کابیسە) هەموو گیپەکانم دووری، ئێوارە دیلان لەگەڵ حەمەی مەلا هاتن، گیپەکان هەموو باق و بریقیان دەدایەوە دیلان وتی: بە تەلاقم دەڵێی فیتەرەکانی سەرکارێز بە تەل و وایەر بەستوویانە، حەمەش وتی بیخۆ بزانە تامی چۆنە، وابزانم ئەمە دوا گیپە بوو دیلان خواردی.

لە ساڵی شەستەکان من و حەمە ساڵح دیلان و مەحمود خەزنەدارو مستەفا ساڵح کەریم، ئێوارەیەک لە قەراخ جۆگەکەی بەکرەجۆ دانیشتبووین باسی قادر دیلان و ژنهێنانەکەیمان دەکرد، حەمە ساڵح دیلان وتی باشتێکی سەیرتان بۆ باسبکەم، وتی مەحمود زێوەر هات بۆ لام، وتی ساڵح ئەڵێن قالە ژنیهێناوە، وتم بەڵێ ڕاستە، وتی کچی کێیە؟ منیش تۆزێ ماتبوم وتم کچی حاجی ئەحمەدی کەریم ئاغای چیکە یان کچی ڕەشە جەنجەڕی پراگە، وتم ئاخر خولە هەی هەی من چوزانم کچی کێیە ئەوان دوو خوێندکار بوون لەو پەیمانگایە حەزیان لە یەککردوەو هاوسەرگیریان کردووە.

**تێبینی:**

ڕەشە جەنجەڕو حاجی ئەحمەدی کەریم ئاغا ئەو زەمانە دوو دەوڵەمەندی سلێمانی بوون.

# (٥٧)
# ڤیستیڤاڵی شانۆی کوردی لە بەرلین

پاش ڕێکخستنی هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات، کەوتینە چالاکیی هونەریی و ڤیستیڤاڵی ئاهەنگ و گۆرانی و هەڵپەڕکێی کوردی، لە زۆر شاری ئەورووپادا ڤیستیڤاڵی گەورەو هونەریمان بەهاوکاری و هاوئاهەنگی لەنێوان ئەکادیمیای هونەرو ئینستتیوتی کورد لە بەرلین سازکرد.کە پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات پێکهات، بەندە ئەندامی کونسەی سەروکایەتی پەرلەمان بووم و سەرپەرشتیاری هەموو کارو چالاکیە ڕۆشنبیری و هونەرییەکانم دەکرد (بەگوێرەی دەرفەت باسیان لێوە دەکەم). لەساڵەکانی ١٩٩٨-٢٠٠١ دا دوو ڤیستیڤاڵی گەورەی شانۆی کوردیمان لە بەرلین ئەنجامدا. نزیکەی نەوەد بۆ سەد هەزار کورد لەبەرلین دەژین، لە سەدا هەشتایشی کوردی باکوورن، بەرلین شاری کولتورو سیاسەت و جێگەی ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدارە گەورەکانی ئەڵمانیایە.

بۆ ئەم بۆنەیە زۆربەی شانۆکارە کوردەکانی ئەورووپامان بانگهێشتکرد، بە تایبەتی لە هۆڵندە، سوید، بەلجیکاو فەرەنسا جگە لە هونەرمەندانی ئەڵمانیا.

بە وتارێکی کورت ڤیستیڤاڵەکەم کردەوە، پانزە ڕۆژی خایاند، بەشێکی زۆر لە کوردەکانی بەرلین و جەماوەرێکی زۆری هونەرمەندو ڕۆشنبیرانی ئەڵمان و نەتەوەکانی تر ئامادەی بوون، بە تایبەتی ئەو گەلانەی خۆیان بەدۆستی کورد دەزانی، وەکو: یۆنانی، جوو، ئەرمەن و میللەتانی ئەمەریکای لاتین.

ئێمە بانگهێشتی هەموو دەزگاو سازییە کولتووریەکانی بەرلینمان کردبوو، هەموو سەرسامیی خۆیان بەنواندن و هزری شانۆگەریەکان دەربڕی، ئەوە بووەهۆی ئەوەی هەندێ دەزگای میدیاو هونەری

ئەڵمانی بیر لەوە بکەنەوە، لەگەڵ هونەرمەندانی کورددا بە هاوبەشی فیلم و زنجیرە فیلمی هونەری بەرهەمبهێنن. ئەم ڤیستیڤاڵە سەلماندی ناساندنی کێشەی کورد لە ڕێگەی کولتوورو هونەرەوە، زووتر دەگاتە ڕای گشتی دنیاو پەیامەکەشی لەهیی شۆڕش و شەڕی چەکداری ئاسانتر دەگا، لە خەباتی گەلی کورددا لە باکوور، هەموو تواناکانی ڕەوەندی کورد کۆکرابوونەوە سەریەک و تەریب لەگەڵ خەباتی شاخ و گەریلادا بەرەو پێشەوەدەچوو.

زۆر هەوڵمدا لەکوردستانی باشوورەوە چەند شانۆکارێک بۆ ئەم فیستیڤاڵە بانگهێشتبکەم، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیمکرد بەهونەرمەندی گەورە، باوکی شانۆی کوردی (ئەحمەد سالار)ەوە، بە داخەوە بەهۆی نەبوونی ڤیزاوە دەرفەتیان بۆ نەڕەخسا بەشداریبکەن.

ئەنوەر قادر ڕەشید(شانۆکار) لەوتەیەکدا وتی: ئەگەر ئەم ڤیستیڤاڵە نەبوونایە، ئێمە لەگێژاوو جەنجاڵیی ئەورووپادا خۆشمان و هونەرەکەیمان لەبیر چووبووەوە.

ئەوەی من ئاگام لێیبوو، خەرجی ئەم ڤیستیڤاڵە سی و پێنج هەزار مارکی ئەڵمانی بوو، شانۆگەری (دووبارەی داستانێک) لە نووسینی(سیروان ڕەحیم)و نواندنی شادان فوئادو شەماڵی عەبەڕەش خەڵاتی یەکەمی میهرەجانی وەرگرت و منیش دەستی ڕانکوچۆغەی نایابم بەخشی بەسیروان ڕەحیم، هەروەها خەڵاتی دەقی یەکەم و ئەکتەری یەکەم بەخشرا بەهونەرمەند شۆڕش قادر، زۆر سوپاسی شۆڕش قادر ئەکەم کە ئەم وێنانەی بۆ ناردمەوە.

داوای لێبووردن لە هەموو تیپ و ئەکتەرە بەڕێزەکان ئەکەم کە ناویانم نەهێناوە، چونکە ئەم نووسینە تەنیا بۆ یادکردنەوەیەو لە بیرەوەرییەکاندا بەدرێژی باسی ڕۆڵی هەموو تیپ و ئەکتەرەکان دەکەین، زۆر سوپاسی هەر کەسێک دەکەم کە زانیاری زیاتریان لایەو هەڵەکانمان بۆ ڕاستبکەنەوە.

# (٥٧)

# چواردەی تەمووزو کورد

ئەو بەیانییە زۆر زوو لەماڵ هاتمە دەرەوە، هێشتا هەتاو گزنگی ئەرخەوانی شاخی هێلانە کۆلارانی ڕووناک نەکردبووەوە، چاوشارکێی لەگەڵ لووتکەکانی کانی شەوەقەت و کەژان دەکرد، کەمێکی مابوو تیشکی پرشنگداری ڕۆژ باڵی پەخش و بڵاوبکاتەوە بەسەر پێنج وێنەکەمدا، هەتا پێنج تابلۆی ڕەنگین دروستبکات؟

گویم لە ڕادیو بوو، ڕاگەیەندراوەبەیانی ژمارە یەکی دەخوێندەوە، لە چایخانەکەی (دەروێش کەریم)، خەڵک لەدەوری ڕادیۆکە کۆبووبوونەوە، هەندێک بەترسەوە گوێیان گرتبوو، هەندێکیتر شڵەژابوون، وردە وردە ناو بازاڕ قەرەباڵغ بوو، من لەگەڵ دوو برادەرم (ئەحمەدی حاجی محەمەدی قوربانی و شەوکەتی مەلا مارف) تێکەڵاوی خەڵکەکە بووین و هەواڵە عەرەبییەکانمان بۆ خەڵک دەکردەوە بەکوردی.

من باسی ئەوە ناکەم، کە ئەمە کودەتایە یا شۆڕش؟ ئایا ئەمە سەرەتای ئەم هەموو کارەسات و ماڵ وێرانییە بوو، کە بەسەر عێراق و کورددا هات؟ یان (١٤ی تەمووز) سەرەتای گۆڕانکارییەکی مێژوویی، سیاسی، فیکریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتی بوو لە عێراقداو وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی سیاسی کورددا، ئەگەر پرۆسەکە کودەتا بوو، خۆ گۆڕانکارییەکان شۆڕشگێڕیی بوون، بە مانای وشە خەڵکی عێراق بە کوردیشەوە لە چواردەی تەمووز فێربوون بڵێن نەوت سامانێکی نیشتیمانییەو ستوونی بنەڕەتی ئابووری عێراقە، لە (١٤تەمووز) فێربوون بڵێن دەسەڵات دەبێ دیموکراتی بێت و هەڵبژاردن بکرێت، هەر لە ١٤ی تەمووز کورد فێربوو بێتە سەر شەقام و داوای مافی نەتەوەیی خۆی و ئۆتۆنۆمی

بکات، ژنان داوای مافی یەکسانیی خۆیان بکەن، کرێکار داوای هەشت کاتژمێر کاربکات، جووتیار بڵێت زەوی بۆ ئەو کەسەی دەیکێڵێت.

هەنـــدێک دەڵـــێن ئەگەر سیســـتەمی پاشـــایەتی نەرووخـــایە، بەسروشـتیی ئەم گۆڕانکاریـانە روویـدەدا، لە وەلامـدا دەڵێـین: (خـۆ لەعەرەبسـتانی سـعوودی ١٤ تەمـوز روویـنەدا، بەڵام ئـافرەت تـا ئەم دواییانە بۆی نەبوو ماشین لێبخورێت).

راستە لە کودەتاکەو ئەو سـالانەی حـوکمی (عەبدولکەریم قاسـم) هەنـدێک کـاری نـابەجێ و ئـاژاوە هەبـووە، ئەمە لەهەمـوو شـۆڕش و گۆرانکارییەکـدا روویـداوە. بە تـایبەتی لە رۆژهەلاتـدا. هەنـدێک ١٤تەمـووزی عێـراق بە ١٤ی تەمـووزی فەرەنسـا بەراوردەکەن، دەپرسم ئایا ئەقلیەت، رەوشت، بیرو باوەر، ئایین و پەرچەکرداری ئەم دوو میللەتە بەقەدەر ئەرزو ئاسمان لە یەکەوە دوورنین؟

١٤ی تەمووز و کورد:

١ -مـاددەی سێی دەسـتووری کـاتی دەڵێت عەرەب و کـورد لە نیشتمانی عێراقدا هاوبەشن.

٢ -لە سـیمبۆلی کۆماریـدا، شمشـێرێکی عەرەبـی بەرانـبەر بەخەنجەرێکـی کـوردی کێشـرابوو وەک رەمـزی عێـراق، بە هەمـوو عەرەب و دنیا راگەیەندرا ئەم عێراقە موڵکی ئەم دوو نەتەوەیەیە.

٣ -رێـگەدان بە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان داواو بەرگـری لە مافی گەلی کورد بکات.

٤ -رێـگەدان بە گەڕانەوەی بارزانییەکـان لە سـۆڤیەتەوەو قەرەبووکردنەوەیان.

٥ -دەرچـوونی عێـراق لە پەیمـانی (سـەنتۆ)، یەکێـک لە خـاڵە گرنگەکـانی ئەم پەیمـانە ئەوەبـوو، ئەگەر راپەڕیـن و شـۆڕش لە هەر پـارچەیەکی کوردسـتان روویـدا هاوپەیمانـان بۆیـان هەیە بەهێـزی

هەموویان سەرکوتیبکەن. بەم دەرچوونەی عێراق پەیمانەکە تێکچوو، کە لە نێوان تورکیا، عێراقی مەلەکی، ئێران و پاکستاندا بەسترابوو.

ئەگەر (عەبدولکەریم قاسم) نەبووایە رەنگە هەروا بە ئاسانی خوا لێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی نەگەیشتبایەوە چیای شیرین، تا لەوێوە جاری شۆڕشی چەکداری بدات، هەروەها خوا لێخۆشبوو ئیبراهیم ئەحمەدیش هەروا بە ئاسانی نەیدەتوانی ئێستگەی ڕادیۆی دەنگی کوردستان لەماوەت دابنێت و هەواڵی شۆڕشی چەکداریی ڕابگەیەنێت.

هەر لەسایەی ١٤ی تەمووزدا کوردی باشوور خۆی کوکردەوەو خەلک هۆشیاربووەوەو شۆڕشیانکرد، گومان لەوەدا نییە کۆمەڵێک ئەفسەری بێئەزموون ئەم کارەیان ئەنجامدا، بەڵام گەلی عێراق و کوردیش نەیانتوانی سوودی لێوەرگرن و بەکارەسات کۆتاییهات.

تەنیا یەک نموونە دەخەمە بەرچاو، مەهداوی کە کەسی دووەم بوو لە عێراقدا، لە کاتی دادگایی کردنەکەدا وتی: (سنجعل کورستان العراق مشعل لتنير الأجزاء الأخرى من کوردستان الکبرى)و هەر لەسەر ئەمەش سەریانبڕی و ئەفسەرە بەعسیەکە پێیوتبوو: (راح نذبحك ونسوي رأسك طوبة) هەندێک دەڵێن قاسم پەشیمانبووە هێرشی سەربازیکردە سەر کوردستان ئەمە ڕاستەو ئەمە عەقڵیەت و ئەخلاقی سیاسی سەرکردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.

هەموو دەزانین لەسەرەتای سەدەی بیست و یەک، کورد ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە نوسینەوەی دەستوور، دامەزراندنەوەی سوپاو حوکومەتی عێراق، لەکاتێکدا سەرکۆمار، جێگری سەرۆک وەزیران، جێگری سەرۆکی پەرلەمان و چەندین وەزیرو ئەندام پەرلەمان و سوپا سالاری عێراق کوردبوون، بەڵام حوکومەتی عێراقی ئێستا، هەموو مادده دەستورییەکانی پێشێلکردو لێیپەشیمان بووەوەو بە هێرشی سەربازی نیوەی کوردستانی لێسەندینەوە، خۆ ئەگەر ڕۆڵی

دەرەکی نەبووایە بە تایبەتی فەرەنسا هەتا قوشتەپەو چەمچەماڵ دەهاتن.

لەبارەی هەڵگیرسانی شۆڕش دژی ١٤ی تەمووز، من لەگەڵ زۆر لەسەرانی ئەو شۆڕشەدا گفتوگۆم کردووە، چەند نموونەیەک دەخەمە پێش چاوتان، لە پەنێلێکدا لە تەلەفزیۆنی میدیا مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد، شێخ عیزەدین حوسێنی و دکتۆر مەحمود عوسمان)و چەند کوردی باکوور، مامۆستا ئیبراهیم وتی: ئێمە پەلەمانکردو هەڵەمانکرد چەکمان دژی قاسم بەرزکردەوە، ئەمە لە وەڵامی پرسیارێکی مندا بوو لەبارەی شۆڕشی ئەیلولەوە، ئیستاش ئەم پەنێلە لە ئەرشیفی تەلەفزیونی میدیادا ماوە.

کۆبوونەوەی (قیادەی مەرکەزی حزبی شیوعی عێراقی)مان لە ناوچەی گەلاڵە گرێدا، پاش کۆبوونەوە خوا لێخۆشبوو (سامی عەبدولرەحمان) هات بۆ لامان، بە تایبەتی بۆ لای (ئیبراهیم عەلاوی)، لەگەڵ خۆی بڕێک ئازوقەشی بۆ هێنابووین، چونکە لەگەڵ عەلاوی لە لیژنەی ئەندازیارانی حزبی شیوعی کۆنە هاوڕێ بوون، پاش قسەکردن پێمانوت: دەمانەوێ زیارەتێکی سەرۆک بارزانی بکەین، زۆری پێخۆشبوو، وتی ناوەکانم بدەنێ ئێمەش بەم شێوەیە ناوەکانمان نووسی: موسڵح جەلالی، ئیبراهیم عەلاوی، محەمەد ئەمین پێنجوینی، عەبدول جەبار(ئەبو ئەنیس).

ڕۆژی دواتر کاک سامی هات، لەگەڵ خۆی بردینی بۆ بارەگای بارزانی لە (دیلمان)، کۆبوونەوە لە کەشوهەوایەکی باشدا بەڕێوەچوو، هەندێ داواکاری لێمان هەبوو و هەندێک یارمەتیشیداین. ئیبراهیم عەلاوی لەسەر شۆڕشی ئەیلول و حوکمی قاسم پرسیاری لە بارزانی کرد، بە کورتی ئاوا وەڵامی دایەوە (قاسم نێچیرێک بوو، ئێمە هیلاکمان کردو بەعس بە پشتی ئینگلیز ڕاویکرد).

# (٥٩)

# پاشەکشەی هێزی پێشمەرگەو کۆنفراسەکەی حزبی شیوعی عێراق - قیادەی مەرکەزی

لە دوای دەسگیرکردنی هەموو سەرکردەکانی حزب و ڕوخاندنی ڕەمزەکانی وەکو (عەزیز ئەلحاج)و چەند کەسێکی تر و نیشاندانیان لە تەلەفزیۆن، بووە هۆی نائومێدیەکی زۆر لەناو ڕیزەکانی حزب و چەپ و شۆڕشگێڕەکاندا.

بەلام لە لقی کوردستان هەر زوو کەوتینەوە چالاکیی و پێوەندیکردن بە ڕێکخراوەکانەوە، هەتا گەشتینە باشووری عێراق و ناو زۆنگاوەکانیش، بە ئەرکێکی ویژدانی ئەزانم، ئاماژە بەڕۆڵی هەندێک لە هاوڕێیان بدەم، وەکو شێخ (حەسەنی قادرکەرەم)و هەندێک هاوڕێی دیکە.

چەندجار چوومە بەغداو باشووری عێراق، لەئەنجامدا بڕیاری کۆنفراسێکمانداو لە مانگی هەشتی ساڵی ١٩٦٩دا لە گوندی ئەستێل لەناوچەی قەرەداغ بەستمان، ئەوانەی بەر پەلاماری بەعس نەکەوتبوون و ئێمە توانیبوومان بیانگەینی لە نوێنەری ڕێکخستنەکانی (باشوور، ناوەڕاست، بەغدا و موسڵ)مان، بانگکردبوو، ئەو نوێنەرانە کە دەهاتنە سلێمانی من وەرمدەگرتن و دەستە دەستە دەمگەیاندنە گوندی دۆلاش لە ناوچەی قەرەداغ، چونکە لەو گوندە هێزێکی چەکداری بچووکمان هەبوو.

لە یادمە (ئیبراهیم عەلاوی)م، لە ماڵی (ئەکرەمی ساڵحە ڕەشە) وەرگرت، ئەو کاتە ئەکرەم ئەندامی حزب بوو و لەو دەوڵەمەندانە بوو کە یارمەتی ماددییان دەداین، هەروەکو عەلی بۆسکانی و حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی.

لەپێنجەم ڕۆژی کۆنفراسدا بووین، هێرشی حوکومەت لە گەرمیان و سلێمانییەوە بۆ گرتنی قۆپیەکانی قەرەداغ دەستیپێکرد، گەرمیان هەر زوو شکا، چونکە شێخ جەعفەری کۆنە پارێزگاری سلێمانی، کە ئەوکاتە ئامر بەتالیۆن بوو خۆی ڕادەستکرد، ئیتر هەموو هێزی پێشمەرگەو ئەندام و لایەنگرانی پارتی، ڕوویانکردە قۆپی قەرەداغ. ئێوارەی ڕۆژی پێنجەمی کۆنفراسەکەمان لە بەرپرسی هێزی قەرەداغەوە (شەهید حەمەی سەید عەلی حافز) نامەیەکمان بۆ هات، لە قۆپی داری زەرد ئامادەبین. ئێمە زانیمان هێرش بۆ سەرمان لەهەر چوارلاوە دەستیپێکردووە، بەپەلە کۆنفراسەکەمان کۆتایی پێهێناو سەرکردایەتیەکی نویمان لەم ناوانە پیکهینا:

١) موسڵح جەلالی – سکرتێر
٢) ئیبراهیم عەلاوی – جێگر
٣) ئەبو محسن بەرپرسی زۆنگاوەکان و هێزە چەکدارەکان.
٤) ئەبو جەعفەر خضیر عباس
٥) جەمال (محەمەد ئەمین پێنجوێنی) لقی کوردستان.
٦) ئەبو عەلی (عەبدولجەبار زەهاوی) هێزی پێشمەرگە.
٧) غازی انطوان بەرپرسی کەرکوک و هێزی عەسکەری
٨) عاصم خفاجی بەرپرسی چاپەمەنی و پێیوەندییەکان

هەر بە پەلە هەندێک لە هاوڕێیانی باشوورمان بڵاوەپێکرد، بەتایبەتی ئەوانەی نەیان دەتوانی بە شەو ڕێبکەن لە ڕێگەی دەربەندیخانەوە ڕەوانەمان کردنەوە.
شەش هاوڕێمان لە گوندی ئەستێل دایەدەست (کاکە عەولا)، پێمان گووت لە هەر دەرفەتێکدا بۆتکرا ڕەوانەی ناو شاری سلێمانیان بکەرەوەو دەیزانی لە سلێمانی دەیانگەیەنتە دەست کێ؟.

بەندە، موسلح جەلالی و ئەبو عەلی، چەکدارەکانمان کۆکردەوەو چووینە کۆبونەوەکەی داری زەرد بۆلای بەرپرسی هێزەکەمان.

شەهید حەمەی سەید عەلی حافز، نزیکەی بیست کەسی لە دەورە دانیشتبوو، لەوانەی ناسیمن: ئامر بەتالیۆن نەجمەدین حەسەن، خالید ڕەباتی و ڕەحیم دۆینە بوون، بەرپرسی هێزەکەمان وتی: ئەمشەو بەرەو بەرزنجەو شارباژێر پاشەکشێدەکەین، دەبێت پێش هەتاوکەوتن عەربەتمان جێهێشتبێت.

بە چیاکانی بەرزنجەدا بەرەو شارباژێر شۆڕبووینەوە. من و ئەبوعەلی و موسلح جەلالی جیاکردەوە وتی: با هێزەکەتان لەنزیکی ئێمەوە بێت و ئەوانەی جێکەی باوەڕتانن با لەنزیکی خۆتانەوە بن و لەگەڵیەکدا لە پێوەندیدا دەبین، چونکە زانیاریمان هەیە لە پاشەکشێدا، هەندێک لەناو ئێمە دەست دەوەشێنن، ڕادەکەن و خۆیان ڕادەستی بەکرەجۆ دەکەن، لەم قسانەدا بووین تۆپێک دای لەتەنەدوری نانکردنەکە، کە چەند مەترێک لێمان دووربوو، بەمە ورەی خەڵکەکە ڕووخاو بڕیاردرا پاشەکشە بکەین.

فڕۆکەکان لە ئاسمانەوە کەوتنە بۆمبارانکردن، ڕێچکە ڕێی ئێمەو هەموو ئەوانەی لەگەرمیانەوە پەنایان بۆ قۆپی قەرەداغ هێنابوو چەند کیلۆمەترێک بوو، هەتا گەیشتینە نزیکی (ئەستێل) شەو داهات، ئینجا لە قەرەداغەوە تۆپبارانیان کردین.

هەرچۆنێک بوو لەسەر چیای (پۆشانەوە) شۆڕبوینەوە بۆ دەشتی شارەزوور، لە نزیکی (زەڕایەن) جاش ڕێگەی پێگرتین، تەقە پەیدا بوو، کوژراوو بریندارمان هەبوو، لە هێزەکەی ئێمە دوو بریندار هەبوو، یەکێکیان سەربازێکی عەرەب بوو، تازە تەڤلی ئێمە بووبوو، ماوەیەک ڕێمان کرد تراکتۆرێکمان بینی پێشمەرگەیەکی زۆر خۆیان پێدا هەڵواسیبوو، برینداره عەرەبەکەمان خستە ناو تراکتۆرەکەو وتمان بەڵکو لە بەرزنجە بماندەنەوە.

لەنـاو هێـزەکەدا هەواڵـی برینـداربوونی (ئـازاد قەرەداغـی) بـڵاوو بـووەوە، هـاوڕێ (سـەعە سـووری جـافەرانی و فـایەق ئەمـین) وتیـان ئـازاد خزممـانە بـا بیـدۆزینەوەو لە حـاڵیی بپرسـین، بینیمـان سـواری وڵاخێکیان کردبوو و برینەکەی سووکبوو، ئەو منی ناسییەوە، چونکە لە قوتابخانەی پیشەسازی یەکمان بینیبوو، سەری نا بەگوێمەوە وتی: هەندێک ئاگاتان لە عەرەبەکان بێت، چونکە چەکدارە کوردەکانی سـەر بە حکومەت بەڵێنیانداوە، ئەو عەرەبانە بفڕێنن و پێیان بفرۆشنەوە.

لە تاریک و ڕوونی بەیاندا گەشتینیە ناوچەی شارباژێڕو بەرزنجە، هەلیکۆپتەر کەوتە بۆمبابارانکردنی ئەو گروپانەی جێمابوون. ئێمە لە گوندی (حاجی مامەند) جێگیربووین. لەناو شارەوە هەوالمان بـو هـات کە ئەو شـەش هـاوڕێیەی دابوومـاننە دەسـت (کـاکە عەوڵا) لەنزیـک گونـدی (جێشـانە) کەوتـوونەتە دەسـت چەکدارە کوردەکـانی سـەر بە حوکـــومەت، ئەوانـــیش ڕادەســـتی حوکوومەتیـــان کـــردوونەتەوە، حوکـــومەتیش بە مەرجێـــک ئـــازادیکردوون، وتـــار لەڕۆژنـــامەی (الثـورة)و(نـور)دا بنووسـن و هێرشـبکەنە سـەر شـۆڕش و بـارزانی و بەپیـاوی شـای ئێرانیـان لەقەڵەمبـدەن، هەروەهـا قیـادەی مەرکەزی بە پیـــاوی بـــارزانی ئەژمـــاربکەن. دوای بڵاوبـــوونەوەی وتارەکانیـــان بەریانـدان، ئەو هاوڕێیـانە:(هومـام المرانـی، عاصـم خفـاچی، غـازی انطـون)و دوو هـاوڕێی تـر ناوەکانیـانم بیرنەمـاوە.هەواڵێکـی تـری ناخۆشمان پێگەیشت کە ئەو سەربازە عەرەبەی بە برینداری خستمانە ناو تراکتۆرەکەوە، چەند کەسێک بۆ کڵانشیکۆفەکەی کوشتبوویان.

هەر لەم کۆنفراسەدا ئەندامێکی کۆنفراسـەکە ئاشکرابوو، پێوەنـدی لەگەڵ قیادەی حزبی بەعس هەیە، کۆنفراس بەگشـتی بڕیاریـدا بخـرێتە ژێر لێکۆڵینەوەو پاش هەفتەیەک دانی بە تاوانەکانی دانا کە دوو سـاڵە لەگەڵ بەعسـدا کاردەکـات، لەسـەر چەنـد کەسـی دیـکەش نهێنـی ئاشـکراکرد، زانیـاریی زۆریشـی لەسـەر شـۆڕش باسـکردو ئیتـر ئەو سیخوڕە بە بڕیاری کۆنفرانس سزادرا.

## (٦٠)

# شاکر فەتاح مرۆڤێکی ناوازە

لە ڕێگەی نووسینەکانیەوە لە گۆڤاری گەلاوێژو بلاڤۆکە کوردییەکانی تردا دەمناسی، بە تایبەتی نامیلکەکانی (وەکو پەیژەو کۆگرەی مندالان)و نووسینەکانی، لە هەموویاندا گەنجان و مندالانی کوردی بۆ خوێندن و خۆشەویستیی نیشتمان هاندەدا، ئەو کاتانەی بەڕیوەبەری شارۆچکە بووە لە خورمال و ماوەت و ئاکری، بۆ هاندانی لاوانی کورد بو فیداکاری گەل و نیشتمان بە ناوی ئەو شوێنانەوە بلاڤۆکی دەرکردووە، نووسینەکانی تژی بوون لە کوردستان، خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی، بابەتی کۆمەلایەتی، ئەدەبی و زمانەوانی، خزمەتێکی گەورەی بە ئەدەب و زمان و هزری کوردی کردووە. زۆر تامەزرۆبووم ڕووبەڕوو ببینم و لە تەکیا بدوێم، لە سالەکانی حەفتا بە دواوە زووزوو یەکترمان دەبینی.

جارێک بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەو کاتەی بەڕێوەبەری شارۆچکەی ئاکرێ بووم، نوری سەعید هات بۆ ئەو دەڤەرە، دوو شەو لەمالی خۆمان میوانداریەکی شاهانەمان کردن، چونکە لەئاکرێ هۆتێل نەبوو، کاتێک ویستی بگەڕێتەوە، وتی شاکر چیت دەوێ بۆت بکەم؟ دەی بلێ .. وایزانی دەلێم: بمکە بەجێنشین (قائمقام) یان پاداشتێکم بدەرێ، پێموت بەگم دەمەوێت لەم دەڤەرە وەکو ناوچەکانی سلێمانی خوێندنی سەرەتایی بکەین بەکوردی و جادەی موسل - ئاکرێ قیرتاوبکرێت، هەندێ داماو وتی: ئافەرین شاکر تۆ شایانی هەمو شتێکیت، دەبڕۆ خێرا دوو داوا کارییم بەناوی خەلکی ناوچەکەوە بۆ بنووسەو بیهێنە! داواکارییەکانم خستەبەردەستی و لەسەر داواکارییەکەی خوێندنی کوردی بۆ بەڕێوەبەری پەروەردە(مدیر معارف)ی موسلی نووسی بۆ(بۆجێبەجێ کردن!)، بەلام بۆ

قیرتاوکردنی جادەکە، وتی ئەبێ ئەمە لەپەرلەمان باسبکەم، هەتا لە بودجەی سالّی نوێدا پارەی بۆ تەرخانبکەین.

شاکر فەتاح وتی چومە لای (مدیری مەعاریف)ی موسڵ کابرایەکی عەرەبی چارەگران بوو، داواکەم خستە بەردەمی و واژۆی نوری پاشای بینی لە جێگەکەی خۆی هەستاو لە تەنیشت خۆیەوە دایانام، وتی تۆ چی پێشنیاردەکەی پێکەوە جێبەجێیدەکەین، پێویستە هەردووکمان هاوکاری بکەین بۆ ئەوەی پرۆگرامی خوێندنەکان بکەین بە کوردی، هەروایش بوو سالّی خوێندنی نوێ بە کوردی دەستپێکرد، ماوەی شەش مانگ بەردەوامبوو، لەپشووی نیوەی سالّدا هەموو سەروک هوزو ئاغاکانی ناوچەکە هاتنە لام و هەرەشەیان لێکردم، وتیان دەبێ بڕیاری خوێندن بە زمانی کوردی هەڵوەشێتەوە، چونکە منداڵەکانمان لە زمانی نوێژو عیبادەت دووردەکەونەوەو لە قیامەتیش نازانن وەلامی فریشتەکان بدەنەوە؟ ئەگەر ببن بە فەرمانبەر ناتوانن لە فەرمانگەکانی حوکومەت کاربکەن.

گوێم بە قسەکانیان نەداو وتم ئەوە بڕیاری سەرۆکوەزیرانە، ئەوان چوون بۆ بەغدا لەلای وەزیری ناوخۆو وەزیری مەعاریف شکاتیان لێکردم، پاش مانگێک منیان لەوێ گواستەوەو خوێندنیشیان بە زمانی کوردی هەڵوەشاندەوە.

شاکر فەتاح لە تەمەنی هەشتاو سێ سالّیدا گوللەباران کرا، چونکە لە کۆبونەوەیەکدا ڕووبەڕووی عەلی حەسەن مەجید وتی لەڕێگەی جەنابتانەوە داوا لەسەرۆک ئەکەین ئەو گەنجانەی چوونەتە چیا ببەخشرێن و بگەڕێنەوە ناو کەسوکاریان، ئەوانیش هەر ڕۆڵەی ئەم وڵاتەن، ڕۆڵەی عێراقن، هەر چەند ئێوە پێیان ئەڵێن (موخەڕیب) ئێمەش پێیان دەڵێین فیدایی، هەرچی بن ڕۆڵەی عێراقن. شاکر فەتاح مرۆڤێکی ئاوا ناوازەو خۆنەویست بوو.

## (٦١)
# شێرکۆ شاعیرێکی داهێنەر

لەو کاتەوە تۆ دیارنیت شیعر بە دوای لوتکەیەکدا دەگەرێ .؟!

لەساڵەکانی ١٩٥٥ - ١٩٥٦ بۆ چارەسەری نەخۆشی لە گەڵ باوکمدا چووین بۆ بەغدا، لە ماڵی زاواکەمان میوان بووین، کە لە گەرەکی تەپەی کورد بوون، ئەو کاتە (شەفیقە خان)ی دایکی شێرکۆ، خێزانی (عومەر هەڵمەت) بوو، لە رادیۆی کوردی بەغدا بێژەر بوو، شەفیقە خان و دوو کچەکەی پێکەوە دەژیان (فریشتەو گەزیزە)، ئەو کاتە لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، هەر لە منداڵیەوە ئاشقی شیعری کوردی بووم، کە زانیم شەفیقە خان خێزانی بێکەسی شاعیر بووە، ئیتر لێی نزیک بوومەوەو هۆگری بووم، چەند شیعرێکی بێکەسم لەبەر کردبوو، وەکو (داری ئازادی و بیست و حەوت ساڵە)و گەلێکی تر، شەفیقە خان هەڵی ئەساندمە سەرپێ، وەکو ئەوەی لە پۆلدابم، دەیووت بۆم بخوێنەرەوە.ئەویش بۆ خوشکم و ژنەکانی تر، باسی ژیانی خۆی و بەسەرهاتەکانی لەگەڵ (فایەق بێکەس)داو چۆنیەتی شووکردنەوەی بە (عومەر هەڵمەت) دەکرد، دەیووت لەگەڵ عومەردا هاوسەرگیریمان کرد، ئەو لە پۆلی پێنجەمی دواناوەندی بووە، شەوانە درەنگگەراوەتەوە بۆ لای دایکی، لێی پرسیووە لەکوێ بوویت؟ ئەویش وتوویەتی دایکە گیان لە سینەما بووم، منیش کە گوێم لەمەبوو بە هەستێکی منداڵانەوە بە پێکەنینەوە وتم وەڵا لە شوێنێک بووە لە سینەما خۆشترە!

جارێک یەکێک لە ژنەکان لێیپرسی شەفیقە خان ئەگەر بمریت لەو دنیا چیت ئەوێ؟ وتی ئەگەر (عومەرهەڵمەت)م بدەنەوە هیچی ترم ناوێ، لەحەوشەکەدا سێ ماڵی تری کوردی لێبوون، شەوانە بۆ قسەی خۆش لەدەوری شەفیقە خان کۆدەبوونەوە.

که گەراینەوە بۆ سلێمانی دایکی شێرکۆ نامەیەکی پێدام، وتی کورەکەم لە قوتابخانەی فەیسەڵییە لە پۆلی شەشەمە، بەڵکو ئەم نامەیەی بدەیتێ، نامەکە دوودینارو نیویشی تێدابوو، یەکەم جار من ئاوا شێرکۆم ناسی.

لەساڵی ١٩٦٠دا کە بۆ خوێندن هاتمە سلێمانی، لە قوتابخانەی پیشەسازی سلێمانی جارێکی دیکە شێرکۆم بینییەوەوەو یەکترمان ناسییەوە، هەر ئەو کاتە (عومەر هەڵمەت) مامۆستا بوو لەو قوتابخانەیە، وانەی کارەبای پێدەووتینەوە، هەر ئەو ساڵە پۆلی پێنجەمی پیشەسازی گواسترانەوە بۆ بەغداو شێرکۆیان لەگەڵدابوو.

لەساڵی ١٩٦١دا لەمەراسیمی بە خاکسپاردنی شاعیری مەزن (گۆران)دا لە تەک جەلالی میرزا کەریم و شێرکودا لە بن دار ئەرخەوانێکدا لە گردی سەیوان، باسی شیعرو ئەدەب و سیاسەت دەکرا، من ئەم چوارینەم بۆ هات:

**گۆران مرد هەندێ وایان ئەزانی**
**ئیتر ئاوا بوو شیعرو نیشانی**
**رۆژێک دێ لە زێر پەیکەری بۆ بکەن**
**لیی پرسن بڵێن (وەک خۆی) ئەزانی ..؟؟!!**

شیعرەکەمدا بە جەلالی میرزا کەریم، ئەویش دای بە شێرکۆو شێرکۆش بە شڵەژاوی و شێوازەکەی خۆی رووبێتکردم و وتی ئەمە شاعیریشی قسەناکەی؟ منیش رۆژنامەیەکم بە دەستەوە بوو (هیوای کوردستان)، وتم لێرەشدا شیعرێکم بڵاوبووەتەوە بیخوێنەرەوە، کۆپلەی یەکەمی بەم جۆرە دەستی پێدەکرد:

**قوتابی گوڵی بۆن خۆشی یەخەی گەل**
**قوتابی تیشکی وشەداری بەیانیانی دەم کەل**

ئیتر لەو کاتەوە بووینە برادەرو دۆست و هاورێ، لەزۆربەی کۆرو فیستیڤاڵە شیعری و ئەدەبیەکاندا یەکتریمان بەسەر دەکردەوە، یان پێکەوە سەفەرمان دەکرد.

ئەو چووە دەرەوەو ئێمەی جێهێشت، لەپاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و هاتنەوەی بۆ سلێمانی، دوورخرایەوە بۆ باشووری عێراق، بەڵام پێوەندیمان هەر هەبوو، ئەو کاتانەی لە دەستەی نووسەرانی کاروان بووم، شیعری بۆ دەناردم و لەوێ بڵاومان ئەکردەوە، ئەو لە شارۆچکەی بەغدادیە لە قەزای عفک، کە شوێنێکی زۆر دوور لە ئاوەدانییەو لەوێ وەکو دوورخراوەیەک کرابووە فەرمانبەر، لەو کاتەدا لە سلێمانی وەکو بەڕێوەبەری(بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و جەماوەر) بەناوی فەرمانگەکەمەوە، ڤیستیڤاڵێکی گەورەم بۆیادی (فایەق بێکەس) سازکر و بروسکەیەکمان بۆ نارد کە بۆ سەرپەرشتی ڤیستیڤاڵ ئامادەبێت. بەو هۆیەوە ڕێگەیاندا چەند ڕۆژێک بگەڕێتەوە بۆ شاری هەڵەبجە و قوربانی.لەم دواییانەدا کە مەست دەبوو دەیوت پێنجوێنی بەڕاستی دەرفەتێکی باشت بۆ ڕەخساندم بۆ چەند ڕۆژێک هاتمەوە شار. ساڵانی ١٩٩٦-١٩٩٧ لە بەرلین بەرپرسی ئەنستیتیوتی کوردیی بووم، چەند جارێک بانگهێشتمانکرد، کۆڕی ئەدەبی و شیعریمان بۆ سازکردو هەندێ لە شیعرەکانی ئەومان کرد بەتورکی و ئەڵمانی و چاپ و بڵاومانکردنەوە، چونکە کوردی باکوور هەر بەناو ناوی شێرکۆیان بیستبوو، وەکو ئێستا بە لوتکەی شیعری مۆدێرنی کوردی دەرنەکەوتبوو.

ڕاستە لە شیعری کوردیدا لوتکەمان زۆرە وەکو جزیری، خانی، نالی، مەحوی، هێمن، هەژار، جگەرخوێن، عەلی عەبدولرەحمان، محەمەدی سمۆ(ئەم دووانە کوردی سۆڤیەتن و کلاسیکن)، شێرکۆ، پەشێو، هەڵمەت، مزوری، کەژاڵ ئەحمەدو کەژاڵ ئیبراهیم خدر!.

گوڵزاری ئەدەبیمان ڕێک وەکو جوگرافیای کوردستان پڕە لە لوتکەی بەرزو جوان، هەندێکی چوار وەرز سەوزو تەڕو پاراوە، هەندێکی تەماوی و بەفرە، هەندێکی ڕوتەن و وەرزییە.

بۆیە لەو کاتەوە شێرکۆ دیارنییە، شیعر خۆی بە دوای لوتکەیەکدا دەگەڕێ!! شێرکۆ ئاشقی شیعر، ئاشقی جوانیی، خاک و مرۆڤ داهێنەرو فرەبەرهەم و بەشیعری لەدایکبوو بە شاعیریش کۆچیکرد.

## (٦٢)

# پانزەی تەباخ (ئەیلول)

# ڕۆژی زیندووبوونەوەی گەلێك

من نامەوێ بە وردی باسی پانزەی تەباخ بکەم، چونکە چەندین کتێب و سمینارو لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، لەم پۆستەدا تەنیا چەند خاڵێکی گرنگ دەخەمە ڕوو، ئەویش لە گۆڕدەرهێنانی گەلێکە.

لە پاش سەرکەوتنی دوڵەتی فاشستی تورک بەسەر شۆڕشی (شێخ سەعید و سەید ڕەزا)و لەداردانی سەرکردەکانی، دیکتاتور ئەتاتورک گۆڕێکی ڕەمزی دروستکردو پێی لەسەر گۆڕەکە دانا، وتی ئەوە گەلی کوردمان زیندە بە چاڵکردو جارێکیتر زیندوونابێتەوە، ئێمەش هەموو ساڵێک لەو ڕۆژەدا دەمانکرد بەسینگکوتان و شین و شەپۆڕ.

هەتا بەڕێز (ئۆچەلان) لە هەرکەسێکی سیاسی کورد، زووتر هەستیکرد کە دەبێ ئەو گۆڕە هەڵتەکێنین و ئەو گەلەی لەناویدایەو بەخەیاڵی ئەتاتورک مردووە، زیندووبکرێتەوەو گیانی بەردابکرێتەوە، هەروەها کەسایەتییە ڕووخاوەکەی بونیادبنرێتەوەو بکرێتەوە بەو گەلەی لە دنیادا بەسوارەی ڕۆژهەڵات ناسراوە.

ئۆچەلان هەرزوو وتی: کوردستان وڵاتێکی داگیرکراوەو بۆ نەهێشتنی ئەو داگیرکارییە پەکەکەی بە ڕێکخستنێکی تۆکمەو بەهزرێکی نوودەمیانەو بەگیانی لەخۆبووردوویی و گیان بەختکردووییەوە، سیستەمێکی شەڕی چەکداری دامەزراند کە لە خەباتی گەلاندا بێوێنەیە.

لەساڵی ١٩٩٢ شاندێک چوینە دەشتی (بیقاع) لە لوبنان، لە یەکێ لە سیمینارەکانی باسی ئازادیی مرۆڤی دەکرد، دەیووت: مرۆڤ کەدێتە دنیاوە سێ کۆد(تەوق)ی لە ملدایە، کۆتی یەکەم پایەو دەسەڵات و

پارە، دووەم کۆتی هەوەسی سێکسیە، کۆتی سێیەم ترسە لە مردن، ئەوەی دەبێتە ئەندامی پەکەکە ئەبێ ئەم سێ کۆتە لەگەردنی دابماڵێ ئەو کاتە دەبێتە ئەندام، ئیتر ئەو ئەندامە گەریلا بێت یان کادری ڕێکخستن.

ئۆچەلان هەزاران سەربازی بەم فەلسەفەیە پێگەیاند، کە لە هەموو کوردستان و جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، ڕاستە لەناو ئەم سوپایەدا کەسانی لاوازو بێ پرنسیپ هەبووە، بەڵام هەر زوو فڕێیانداونەتە دەرەوە، یان خودی سیستەمەکە قبوولێنەکردوون و کەوتوونەتە دەرەوەی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕییەوە، ئۆچەلان بەم فەلسەفەیە پەکەکەی دروستکرد، ئەنجامەکەی ئەوەیە ئەیبینین لە ڕوژئاواو باکوورو ئەورووپا.

پانزەی تەباخ نەک هەر قەڵەمبازێکی مێژوویی سەرسوڕهێنەربوو، بەڵکو ئەقڵی سیاسی و شێوەی خەباتی گەلی کوردی گۆڕی.

من هەرجار دەچووم بۆ بیقاع کۆمەڵێک ڕۆشنبیرو تێکۆشەرم لەگەڵ خۆمدا دەبرد، ئۆچەلان زۆر کەیفی دەهات کە لەگەڵ ڕۆشنبیرانی باشووردا بکەوێتە گفتوگۆ، بە تایبەتی ئەو دەستەبژێرە کە شەوێک هەتا بەیانی لە گەڵماندا لە گفتوگۆدا بوو، هەرجارێک ئەم بینی هەواڵی ئەو بەڕێزانەی ئەپرسی.

لەساڵی ٢٠١٥ لە بناری قەندیل، لەگەڵ گروپێک دەستەبژێرو رووناکبیرو تێکۆشەری تر سەردانێکی بەڕێز (جەمیل بایەک)مان کرد، بەخۆشییەوە پێشوازی لێکردین، چەند کاتژمێرێک گفتوگۆی گەرم لە نێوانماندا پەیدابوو، ئەمە ئەو کاتە بوو کە شەڕی خەندەق لە ئامەدو شارەکانی تری باکوور دەستیپێکردبوو، برادەرەکان ڕەخنەو پێشنیارو ڕونکردنەوەی خۆیان بەسەربەستی هێنایە زمان، هەڤاڵ جەمیلیش بە ڕۆحێکی وەرزشی وەڵامیدەدانەوە.

# (٦٣)
# بە بۆنەی کۆچی دوایی
# (ئەحمەد بامەڕنیە)وە

من چەند جارێک (ئەحمەد بامەڕنی)م دیبوو، وابزانم یەکەمجار لە بەرلین لەتەک بەڕێز (سەلاح ڕەشید)دا بوو، لە ڕیستۆرانتێکدا کەوتینە گفتوگۆ، مـن ئەوم بە پیـاوێکی سیاسـی و شـارەزا هـاتە بەرچـاو، جارجـارەش کە ڕەوانشـاد (کەمـال فوئـاد)م دەبینـی هەواڵـی ئەوم لێدەپرسی، جارێک کاک کەمال وتی باشبوو بیرتهێنامەوە، مام جەلال وەلامـی بـۆ نـاردووم دەڵێـت: بە پێنجـوێنی بڵـێ ئەحـمەد بـامەڕنی نوێنەری منە لە (یەکێتی ئەوروپا لە برۆکسل)، بەڵام جێگەو ڕێگەی نیـیە، داوات لێـدەکات لە لای هەڤـاڵان بمێنێـتەوە هەتـا شـوێنی بـۆ دابینئەکەین، ئەوکارەم بە ئەنجامگەیاندو هەڤاڵان ژوورێکی تایبەتیان بۆ تەرخـانکرد، کۆمپیوتەرو فـاکس و تەلەفۆنیـان خسـتە بەردەسـت، ئیتـر لەوێ دەژیاو کارەکانی خۆی ئەنجامدەدا.

مـاوەیەکی زۆر لە بارەگـای کـۆنگرەی نەتەوەیـی مـایەوە، شـەوانە زۆر کاتمـان پێکەوە دەگوزەرانـد، جارێـک وتـی: بـرادەران تێبینیـان لە سەر من چییە؟ وتم تێبینییەکانیان هەمووی پۆزەتیڤە، بەڵام دەڵێن کە بـامەڕنی ئەچێـتە چێشـتخانەکە قـاپ و کەوچـکەکە لەسـەر مێـزەکە جێدێڵی، وتم هەڤاڵ لێرە هەرکەس خۆی خزمەتی خـۆی دەکات، ئێرە وەکـو کۆمـۆنێکی کـۆلەکتیڤە، پێکەنـی.. وتـی باشـە، لەمەودوا بە جێیناهێڵم.

ئەوکـاتەی بەڕێـز (ئـۆچەلان) لە ئیتاڵیـا بـوو لەشـاری ڕۆمـا سـەردانمکرد، کاتێـک ویسـتم بچـمە ژوورەکەی، لە ژوورەکەی ئەوبەرەوە یەکێک بـانگیکردم، لامکـردەوە(د. ئەحـمەد بـامەڕنی) بـوو، وتـی کـاکە دوو ڕۆژە لێـرەم، نـامەی جەنـابی مـام جەلالـم هێنـاوە،

نامەکەیان بردۆتە ژوورەوەو من چاوەڕیی وەلامم، کە چوومە ژوورەوە بۆ بەڕێز ئۆچەلانم باسکرد، وتی ئەوە نامەکە بە عەرەبییە بۆم بخوێنەرەوە، (مام جەلال نوسیبوی بەڕێز ئاپۆ من ئامادەم یارمەتیت بدەم بەلام چۆن؟ ئەگەر خۆت بگەیەنیتە کوردستان، من دەتپارێزم)، نامەکە دوورو درێژ بوو سێ لاپەڕەی فولسکاپ بوو.

بەڕێز ئۆچەلان بە پێکەنینەوە وتی بۆی بنووسە: "جەنابی مام جەلال لە کوێوە بگەمە کوردستان، من لە ماڵێکدا وەکو دەست بەسەرم بە تالیۆنێک سەرباز گەمارۆی داوم، مەگەر بەگوریس هەڵمکێشن بۆ ئاسمان، هەر کەسێک دێتە لام دەزگا هەواڵگرییەکان زیاتر لە دەجار دەیپشکنن. بەڕێز مام جەلال دەڵێن ئێوە لەگەڵ ئێرانیەکاندا پەیوەندیتان باشە، ئەگەر بتوانی ڕەزامەندیی و ڤیزای ئەوانم بۆ دابینبکەیت، ئەوا دەتوانم بگەمەلاتان و(ماسیمۆ دالیمۆ) سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیای برادەرت پانزە ڕۆژ مۆڵەتی بۆ داناوم ئەبێ ئیتاڵیا جێبهێڵم. لەلایەکیترەوە هەماهەنگیم لەگەڵ (ماندێلا) کردووەو بڕیارە بچم بەرەو باشووری ئەفریقا"، نامەکەم بەکوردی نووسی، بەڕێز ئۆچەلان واژۆیکردو مۆرەکەی خۆی لێدا، نامەکەیاندا بە ئەحمەد بامەڕنی.

لەم دواییانەدا جەنابی مام جەلالم ئەبینی، وتی کە نامەکە هات یەکسەر خەتەکەی تۆم ناسیەوە لام سەیر نەبوو، وتم ئەم غەزەبی خوایە چۆن خۆی گەیاندە ڕۆما، درود بۆ گیانی ئەحمەد بامەڕنی کە ئەم یادگارو نهێنیانەی هێنایە بەرچاوم، بەلام بە داخەوە پیلان و گەلەکۆمەکێی سیا (CIA)و مۆساد و میت مەحکەم داڕێژرابوون بۆ ڕادەستکردنی ئۆچەلان بە تورکیا.

# (٦٤)
# بەرپرسەکەمان چۆلەکەکوژ بوو

لە چیرۆکەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کردبوو، ساڵی ١٩٦٣ لە هەڵەبجە ئەندامی لیژنەی قەزای ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی و بەرپرسی شار بووم، ڕۆژی هەشتی شوبات هەینی بوو، لە ماڵی مامۆستا (مەحمود شەریف هەلاج) لە کۆبوونەوەدا بووین، لە پڕ مامۆستا مەحمود خۆیکرد بەژووردا و ڕادیۆیەکی بەدەستەوە بوو، وتی کودەتا بووە، زەعیم کوژرا، ئێوە خەریکی چین؟ کۆبوونەوەکەمان هەڵپەسارد، شتە نهێنییەکانمان شاردەوەو تەتەرێکمان نارد بۆ سلێمانی، بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر وەربگرین، تا بڕیاربدەین چیبکەین؟ پاش دوو ڕۆژ وەڵامهاتەوە:

- ئەوانەی ئاشکرابوون بچنە دەرەوەی شار.
- گەنجەکان ڕووبکەنە شاخ.
- لە هەرجێگەیەک بەباشی دەزانن بنکەیەکی چەکداری دابنێن، بۆ ئەوەی هەرهاوڕێیەک ترسی گرتنی هەبێ، ڕوویتێبکات.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانە کارەکانمان بەمجۆرە دابەشکرد:

١) هاوڕێ سەید تۆفیق گەشتێک بەرەو خورماڵ و هەورامان بکات.

٢) مەلا ڕەئوف و حەمەڕەشیدی کوێخا مەحمود بۆ دەربەندی خان و وارماوا، هەتا بناری بەمۆ بڕۆن.

٣) من و حەمە کوڵەباڵ بۆ شارەزورو سەید سادق و عەربەت و دۆڵی کوڵێتان بڕۆین.

٤) لەپاش بیست ڕۆژ هەموومان لە گوندی شیرەمەڕ لەماڵی (سمایلی خەسرەو) یەکبگرینەوە.

هەرچەنــدە بەرپرســی شــار بــووم، بەلام حەزمــدەکرد بەنــاو ڕێکخراوەکانــدا بگەڕێــم و بــزانم هەتــا چ ڕادەیەک ئەنــدامەکانمان ئامادەی گیانبـازین و ئەو دروشـمە تـازەیەی حـزب بەرزیکـردۆتەوە (شەڕی چەکداری)، ئایا دەتوانین جێبەجێیکەین؟

لە گونــدەکانی دەوروبەری هەڵەبــجەوە مــن و حەمە کوڵەبــاڵ کەوتینە قسەکردن و کۆبوونەوە لەگەڵ جووتیارەکان، هەتا گەیشتینە گونـدی(لامەرکەزی) ســێ ڕۆژمـان پێچـوو، لەمـاڵی هـاوڕێ (ئەوکە) ڕۆژێــک پشــوومانداڵ چەنــدین لاوی خــوێنگەرم ئامــادەیی خۆیــان نیشـانداو بـۆ چەک هەڵگرتن ناویـان نووسـی، هـاتینە گونـدی گـامێش تەپە. لەبەرئەوەی حەمە ڕەشید سەرۆکی هۆزی (وردە شاتری) بوو زۆرینەی گەنجەکـانی وردەشـاتری هـاتن بـۆ کۆبـونەوەکە، نـزیکەی نەوەد تا سەد کەس دەبوون، هەر لەوێ گوندی (وڵەسم) دیـاریکرا بـۆ بنکەی چەکداریی.

ئیتـر ڕوومـانکردە گونـدی شـانەدەری و شـەوێکیش لای هـاوڕێ (فەریقی کۆیخـا تالیب) مـاینەوە، ئیتر بڕیارماندا هاوڕێ فەریق ببێتە بەرپرسی هێزە چەکدارەکەو ڕاستەوخۆ دەستبەکاربێت، منیش بەرەو چەوتـان و کۆڵیتـان ڕۆیشـتم لەگەڵ (جەلالـی چەوتـان، کوێخـا قـادری کۆڵیتــان، مەلا عەلــی دوتاقــاچ و کۆیخــا قــادری زەنگــی ســەر) کۆبـوونەیەکم کـردو داوامڵێکـردن یـارمەتی هـاوڕێ (فەریقـی کوێخـا تالیب) بدەن.

لە ئەنجامی ئەم چالاکییانەدا هێزی پێشمەرگەی دۆڵی کۆڵیتان بە فەرمانی (عەبدولوەهاب ئەتروشی) بڕیاری گرتنی منیان دابوو، منیش سێ ڕۆژ لە مـاڵی (کوێخـا قـادر) لە ژوورێکی سـاردو تاریکدا خـۆم شاردەوە، خێزانە بەڕێزەکەی کۆێخا لەکونی دەلاقەکەوە خواردنی بۆ ئەهێنام، ڕۆژێک وتی: "هۆ برا، برا کوڕەکەی لالە حەمە ئا بەو شێوەیە بمــوەنە بەهەشــت بە کەلامــولا گەرەکــم نیــیە، بــۆ نــاچی بەلای

خوێندنەکەتەوە، ئیتر نیوە شەوێک (جەلالی چەوتان) گەیاندمیەوە گامێش تەپە.

لەکاتی دیاریکراودا لە گوندی (شێرەمەڕ) لە ماڵی (سمایلی خەسرەو) یەکمانگرتەوە، هاوڕێ(ن) بە بیانوی ئەوەی کاتی خۆی حزب پێیوتوە زۆر نەچێتە ناو جەماوەرەوە، نەهاتبوو!!! ئێمە کۆبونەوەکەمان دەستپێکرد، هەرکەس راپۆرتی خۆی پێشکەشکرد ئەنجامەکەی بەمجۆرە بوو: دە تفەنگی جۆراوجۆر، سێ تاپڕ، دوو دەمانچەی لەکارکەوتوو و بڕێک فیشەک، رەخنەیەکی زۆر لە هاوڕێی بەرپرس گیرا، هەر کەس چوو بەلای کاری خۆیەوە، من کە ئەرکم بەرپرسیاریەتی شار بوو بەرەو هەڵەبجە کەوتمەرێ، عەسرێکی درەنگ گەیشتینە بن دارتووەکانی (حەمە ئوغان)، بینیمان هاوڕێی سەرکردەمان دارلاستکێکی بەدەستەوەیەو خەریکی چۆلەکە کوشتنە، حەمە کوڵەباڵ بە تەوسەوە پێیوت: هاوڕێ چەند چۆلەکەت کوشتووە؟ بە شڵەژاوییەکەوە وتی: بە خوا منداڵەکەمان دانی دەردێ، دوو رۆژە هەر دە چۆلەکەم بۆ کوشتووە، ئێمەیش ماندوو و چڵکن چووینە ماڵی هاوڕێیەک پشووبدەین، لێیپرسیم: دەڵێن هاوڕێی چۆلەکەکوژ پلەی لەحزبدا بەرزبۆتەوە؟ وتم بەڵێ پاڵێوراوی کۆمیتەی ناوەندییە!، وتم هاوڕێ حەمە (ژەنەڕاڵ جیاب) پاڵێوراوی کۆمیتەی مەرکەزی حزبی شیوعی ڤێتنام بوو (قەلای دیان بیان فو)ی گرتوو و سوپای فەرەنساو ئەمەریکای شکاند، هاوڕێیەکەی ئێمەش بە دوو رۆژ دە چۆلەکەی کوشتووە، کە لەو کاتەدا بەعسییەکان رۆژی دەیان شیوعییان دەکوشت.

رۆژێک لە خێزانە بەرێزەکەی هاوڕێ (ن)م پرسی، وتم مامۆستا چی خوێندووە؟ وتی: هاوڕێ، ئەو شارەزایی هەیە، منیش بە سەرسامییەکەوە وتم لە چیدا؟ وتی: لە خۆ شاردنەوەدا، درێژەی پێداو وتی: لەم رۆژانەدا هاوڕێ (سەید باقی) هاتوو و وتی ئەم گەڕەکە دەپشکنن، ئیتر وەکو بسمیلای لێبکەی لەبەرچاو ونبوو، پاش

چەند سەعاتێک لە کولانەی مریشکەکان هاتە دەرەوە، سەرم سوڕما چۆن لەو کونە دەرباز بوو؟ ئیتر من باوەڕم بەو جۆرە سەرکردەو بەم شێوازی خەباتە لەق بوو، بۆیە لە گوندی (باوەکۆچەک) شوێنێکم پەیداکرد، دەستە دەستە هاوڕێیانی ڕێکخراوەکانی شارەزوورو هەڵەبجەم کۆدەکردەوەو کتێبەکانی شۆڕشی چین و ڤێتنامم لە بارەی شەڕی چەکداری و شەڕی پارتیزانی بۆ دەخوێندنەوەو بۆم شرۆڤەدەکردن، هاوڕێی ژەنەڕاڵی چۆلەکەکوژ ڕاپۆرتی لە دژم نوسیبوو، کە من حزب تێکدەدەم و بیروباوەڕی ماو بڵاودەکەمەوە (ئەمەش ئەو کاتە کفرێکی گەورە بوو)، پاش ماوەیەک دوو هاوڕێی پێشکەوتوو (ئەحمەد کەریم و حسێن عەلی غالب) هاتن بۆ لێکۆڵین، لەئەنجامدا منیان گواستەوە بو گوندی عازەبان لە دەربەندی خان، هاوڕێی چۆلەکەکوژیان سڕکردو هاوڕێ (حسێن عەلی غالب)یان لە جێگەی دانا .. ئەم چیرۆکە زۆری ماوە.

# (٦٥)

# مەحمود هەژارو هەڵبژاردنی جوتیاران

(مەحمود هەژار) پیاوێکی نیشتمانپەروەرو مەجلیس خۆشبوو، بە قسە خۆشەکانی لە سلێمانیدا ناوبانگی دەرکردبوو ،ئەو زوو زوو هاتوچۆی پێنجوێنی دەکرد، بەتایبەتی لە هاویناندا لەگەڵ (تیپ ڕشێنەکانی مەلاریا) دەهات، ئەو لەگەڵ گەنجەکانی پێنجوێن دۆستایەتی هەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ کاکمدا بەو هۆیەوە منیش دەمناسی. کە بۆ خوێندن هاتمە سلێمانی، جارجار لە چایخانەی ئەوقاف ئەمبینی و هەواڵی لاودکانی پینجوینی لیئەپرسیم. لەساڵەکانی ١٩٦٠ - ١٩٦١ هەڵبژاردنی جووتیارانی پاریزگای سلیمانی بوو، بەو هۆیەوە کێبڕکێیەکی گەرم لەنێوان پارتی و شیوعیدا بۆ بردنەوەی هەڵبژاردنەکە دروستبووبوو.

دوو لیست بە ناوی دوو کادیری لە پێشی پارتی و شیوعییەوە ئامادەکرابوو، (مەلا ڕەسوڵ و ئاوڕەحمانی ساڵحی خلە)، بەو بۆنەوەیەوە سلێمانیان سەرقاڵکردبوو، ئەوکاتە قوتابی بووم لە سلێمانی، بەلام حزب بۆ هەڵبژاردن ئەرکداریکردم بچمەوە بۆ پێنجوێن لەگەڵ هاوڕیانی ئەوێ هەوڵبدەم بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین دەنگ، حەوت دیناریشیان بۆ خەرجی پێدام. گەشتێکی دە ڕۆژەم بە ناوچەکەدا کردو زۆر گوندم بەسەرکردەوە، توانیم نزیکەی سەدو بیست کەس کۆبکەمەوە، کە ناسنامەی جووتیارییان هەبوو، بە دوو لۆری بەرەو سلێمانی کەوتینەڕێ، نزیکەی نوێژی نیوەڕۆ گەشتینە بەر مزگەوتی گەورە، جووتیارەکان گوتیان با نوێژەکەمان بکەین، ئەوان چوونە مزگەوت و من و شۆفێرەکان چووینە چایخانەی ئەوقاف، وتم ئێمە پشوویەک ئەدەین، کە جووتیارەکانیش هاتنەوە نان و کەبابتان بۆ ئەکڕم، ئەوجا ئەچین بۆ دەنگدان لە(مەلعەبەکە).

لەچایخانەکە (مەحمود هەژار)م بینی، لێیپرسیم چۆنە واهاتووی؟ وتم جووتیاری پێنجوێنم هێناوە بۆ دەنگدان، کە واموت بزەیەک گرتی و چپەیەکی لەگەڵ ئەو کەسەدا کرد کە لەتەکیدا بوو، کەسەکەی تر منی مەشغولکرد، ئاگام لێبوو (مەحمود هەژار) لەگەڵ شۆفێرەکان بەرەو لای مزگەوتی گەورە ڕۆیشتن، ئیتر ئەم کابرایە منی واسەرقاڵکرد ماوەیەکی زۆر گیریدام، کەڕۆیشتم نەجووتیار مابوو نە لۆری، پێیوتبوون حەمەمین کارێکی بۆ دروستبووەو منی ناردووە بتانبەم بۆ دەنگدان، ئیتر جووتیارەکان دەنگیاندا بوو بە لیستی (مەلا ڕەسول)، چونکە جووتیارەکان نەخوێندەواربوون، مەحمود هەژار پێیوتبوون ئەوە لیستەکەی حزبمانە، حزبی شیوعی.

بەو هۆیەوە لیستی (مەلا ڕەسوڵ) سەرکەوت، ئێمەش هەڵبژاردەکەمان دۆڕاند، (مەلاڕەسوڵ) لەو شەڕەدا شەهیدبوو کە لە دۆڵی ناڵپاریزی ڕێگەی پێنجوین بەسەرکردایەتی خودی مام جەلال کراو لەوێ سوپای عێراق خراپ شکان.

لەم ساڵانەی دواییدا لە بیرۆی خوا لێخۆشبوو (عەلی بۆسکانی) مەحمود هەژارم ئەبینی پێموت تۆ قەرزاری منی، ئەگەر تۆ ئەو کارەت نەکردایە من پلەیەک لە حزب نەدەهاتمە خوارەوەو نان و کەبابیشت لەکیس جووتیارەکان نەدەدا، ئینجا کاک (عەلی بۆسکانی) دەیوت یەڵا مەحمود هەڵسە بابچین قەرزەکەی بدەینەوە، (حەمەی بەکرو عومەری مەحمود میرزا)و چەند کەسێکی تری کۆئەکردەوەو ئەی بردین بۆ نادی دەیووت بەمجۆرە قەرزەکەی حەمەمین ئەدەینەوەو کاک عەلی خۆی حسابەکەی ئەدا.

یادی ئەو پیاوە نیشتیمانپەروەر و قسەخۆش و شەرافەتمەندانە بەخێر، بەڕاستی ئەو زەمانە حزبایەتی و کوردایەتی جێگەی ڕێزو شانازی بوو، گیان بەختکردن لەڕێگەی نیشتمان و گەلدا ئامانجی گەنجە ڕۆشنبیرەکان بوو.

## (٦٦)

# فەرهەنگی مام عەزیز ئاکرەیی و چەند چیرۆکێك

لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە زۆر جار پێنجوێن کەوتۆتە ژێر دەسەلات و قەڵەمڕەوی پێشمەرگە . لە سالانی شەستەکاندا لە شەڕی (جەلالی و مەلایی)دا، ژەنەراڵ عەزیز ئاکرەیی) فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و مەلا ئەمین وەکو فەرماندەی بەتالیۆن هاتنە پێنجوین. سەرلەنوی یەکەی کارگێرییان دروستکردەوەو (سیامەند) بوو بە دادوەر،(ملکۆ) بوو بە جێنشین(قائمقام)، هەر چۆنێک بوو شارەوانیان خستەوەگەڕ.(کارمان بەوەدا نییە کە ئەوانە بۆچی هاتبوون و چییان کرد؟) لەبەرئەوەی زۆرینەی ناوچەکە، بە کادیرو پێشمەرگەوە سەر بە باڵی (جەلالی) بوون، باڵی (مەلایی) لاواز بوون.

سەرکردایەتی پارتی داوایان لە حزبی شیوعی کردبوو لەو ناوچانە یارمەتییان بدەن، ئەو کاتە حزبی شیوعی بەتەواوی لایەنگری مستەفا بارزانی بوون، بە بڕیاری سەرکردایەتی حزب منیان ناردەوە بۆ دەڤەری پێنجوێن و دوو نامەیان پێدام، یەکێکیان بۆ عەزیز ئاکرەیی، ئەوی تریان بۆ حوسێن بارزانی کە بە ڕووسی نوسرابوون.

هاتمەوە بۆ پێنجوێن و نامەکانم دایە دەست مام عەزیز، پاشان کۆبوونەوەم لەگەڵ لیژنەی قەزای پێنجوێنی حزبی شیوعی کرد، ئەوەی لە یادمبێ لە ئەندامانی لیژنەکە (تۆفیقی نزارە، قادری حاجی حوسێن و سەلامی عەلی ئەحەڕەش) باسی هۆی هاتنەوەکەمم بۆ کردن و ئەوەم پێڕاگەیاندن کە حزب داوامان لێدەکات یارمەتی مام عەزیز ئاکرەیی بدەین.

پاش چەند ڕۆژێک خوانێکمان لەماڵی هاوڕێ (سەلام) سازکرد کە (مام عەزیز، مولازم یوسف، سیامەندو ئەفسەرێکی تر بەناوی

مەحمود سامی) بەشداربوون، لەوێ باسی ئەوەمان کرد، کە چۆن یارمەتیان بدەین؟ پاش دوو ڕۆژ کەسێکی ناسراو هاتە لام وتی ئەو شەوە کۆبوونەوەتان لەگەڵ ئەفسەرە شیوعییەکان کردووەو بەشی زۆری قسەکانتان ڕیکۆردکراوەو گەیشتۆتە (ساواکی ئێرانی) لەبەرئەوە تۆ یا پێنجوێن جێبهێڵە یان خۆت شوێنبزربکە، تومەس کەسێکی ئەو خێزانە ئەم کارەی کردبوو.

ڕۆژێک مام عەزیزو سیامەند ناردیان بە شوێنمدا، سیامەند وتی (کارێکمان پێتە ئەگەر ئەنجامیبدەیت خزمەتێکی گەورە بە شۆڕش دەکەیت، ئەگەر بتوانی بچیت بۆ بەغدا؟ خێزانەکەم لە مەڵبەندی ڕوشنبیریی و کولتووری سوڤیتی کاردەکات. بارەگاکەیان لە دەسپێکی (شارع ابی نواس)ە، بە ناوی (مرکز ثقافي السوفيتي)، ژنەکەم باڵا بەرزێکی قژزەردە، سوورو سپیەیکی چاو سەوزە، خاڵێک بەلای چەپییە وەیە، دەم بە پێکەنینەو ناوی سۆزان سیامەندۆڤایە، کە بینیت بڵێ پەژاڵستە سۆزانا کەڕووی تێکردی ئەم نامەیەی بدەرێ).

هەرکە چوومە هۆڵەکە بینیم و ناسیمەوەو وتم پەژاڵستە سۆزانا، یەکسەر هات، تەوقەم لەگەڵ کردو نامەکەم خستە مشتیەوە، بەئاماژە پێیووتم چاوەڕێ بە، پاش چەند خولەکێک گەڕایەوە ژنێکی لەگەڵ بوو بە عەرەبی قسەیدەکرد، ووتی سێ ڕۆژی تر وەرەوە بۆ ئێرە، کە چوومەوە جانتایەکی دیپلۆماسی پێدام، وتی ئەوە وەڵامەکەیە، منیش جانتاکەم هێنایەوە پێنجوێن و لە ماڵی (حەمەی دەروێش ئەحمەد)، دامە دەست سیامەند.

ئیتر پێوەندیم لەگەڵ مام عەزیز زۆر بەهێز بوو، ڕۆژانە دەمبینی، دەفتەرێکی گەورەی پێبوو، بەسەر چیاو دۆڵەکاندا دەگەڕا، هەر گوڵ و گیایەکی ببینیایە پرسیاری ناوەکەی دەکردو لای خۆی تێبینی لە بارەیەوە دەنووسی، یان هەر وشەیەکی تازەی ببیستایە لای خۆی دەینووسی، ئەمانە کەرەستەی فەرهەنگەکەی بوو، ڕۆژێک هەموو پێنجوێنیان کۆکردەوەو ووتیان (ملازم یوسف) تۆپی دروستکردوە،

تاقیدەکاتەوە، من (یوسف پەترۆس)م ئەناسی، چونکە لە بنکەی ئاوەگرد سەردەستەمان بوو، شارەزاییەکی باشی لە دروستکردنی تەقەمەنیدا هەبوو، لە گوندی بناوەسووتە کارگەیەکی بچکۆلەی بۆ کاری تەقەمەنی دانابوو، ڕۆژێک پێیوتم پێویستی بە بڕێک(تی ئێن تی) هەیە، داوای لێکردم بۆی پەیدا بکەم، لام سەیر بوو، وتم خۆتان هەموو ڕۆژێک لە سنە و تاران، بۆچی خۆتان پەیدایناکەن و نایهێنن؟ وتی: ئەوە بۆ ئێمە ڕێپێدراو نییە، لەم ڕۆژانەدا ساواک هاتوون، شوێنەکەمیان پشکنیووەو پێیانوتووم لە نارنجۆک و مین زیاتر، نابێ هیچ شتێکی دیکە دروستبکەی، بەهەرحاڵێبوو بەهۆی هاوڕێ(تۆفیقی نزارە)، لە ڕێگەی ماسیگرەکانی مەریوانەوە باری گویدرێژێک دینامێتمان بۆ هێنا، کە بایی پەنجا دینار بوو. هەمو پێنجوێن چووین بۆ(کەلی حاجێ شێخ)، بۆ سەیری تاقیکردنەوەی تۆپەکەی (ملازم یوسف)، کە تۆپ تەقی بەگولەو لولەو بنکەیەوە چوو بەئاسمانا، هەر پارچەی لە شوێنێک کەوتەخوارەوە، تومەز بنکەکەی بە زەوییەوە قایمنەکرابوو.دانوستاندنی نێوان(مستەفا بارزانی)و(عەبدولسەلام عارف) تێکچوو بوو، لەشکری عێراق هاتەناو شاری پێنجوێن، هێزی پێشمەرگەو مام عەزیز چوونە بایەواو باشماغ، ئێمەش چووینە بناوەسووتە، زۆر بەنهێنی لەگەڵ مام عەزیز پێوەندیمان هەبوو، پەل (فەوج)ێک، سەرباز لە پێنجوێن جێگیربوون، پێیانئەوتن (فەوجی مزەڵی)، ئەمانە (عەبدولکەریم قاسم) بەتایبەتی پێکیهێنابوون، زۆربەی ئەفسەرەکانی لەسۆڤیەت مەشقیانکردبوو، دەستیان لە خەڵک و هەتا لە پێشمەرگەیش دەپاراست، هەندێ ئەفسەرو سەربازی شیوعیان تێدامابوو.ساڵی ١٩٦٥ مستەفا بارزانی هاتە ناوچەکەو ماوەیەکی زۆر لەگوندی ساوجی مەریوان مایەوە؛ سەرەک وەزیرانی ئەوکاتەی ئێران (ئاغای هوێدا) هات و بارزانی بینی.

ڕۆژێک مام عەزیز لەگوندی بناوەسووتە هاتە کەپرەکەمان، منی بردە پەنایەکەوەو وتی ئەم پەلە ئەفسەری شیوعییان تێدایە، دەتوانی

پێوەندییەکمان بۆ دروستبکەی؟ وتم با حزب ئاگاداربکەمەوە، بزانم ئەوان چییدەڵێن؟ پاش چەند ڕۆژێک وەڵام لە سلێمانیەوە هاتەوە ناوی (مولازم مەحمود)یکیان بۆ ناردم، هاتمە ناو شاری پێنجوێن، چوومە ماڵی هاوڕێ سەلام و باسی هۆی هاتنەکەمم بۆکرد، وتی ئەفسەرەکان ڕۆژانە دێن بۆ چایخانەکەی ئێمە، ئەم مولازم مەحمودە زۆر ئەمێنێتەوەو زۆر قسەم لەگەڵدا دەکات، بەیانی لەگەڵ باوکی هاوڕێ سەلامدا دەستێ جلی شڕم لەبەرکردو چووم بۆ چایخانەکەو سەلام چپاندی بەگوێما، وتی ئەوە مولازم مەحمودە، چاوەڕێم کرد تا چایخانەکە تۆزێ چۆڵبوو، چوومە نزیکیەوە، وشە نهێنیەکەم پێوت ئێستەش لە یادمە نهێنیەکە ئەمە بوو(ئنتە گەرایب نازم غەزالی) کە وامپێوت: زۆری پێخۆشبوو، ئەوەی مام عەزیز داوای لێکردو پێموت، وتی بەیانی یەک ئەبینینەوە، ڕۆژی دوایی کەیەکمان بینیەوە، نامەیەکی پێدام، منیش ئێوارە گەڕامەوە بۆ گوندی (بایەوە) نامەکەم نارد بۆ مام عەزیز، پاش چەند ڕۆژێک لە بایەوە (عەگید سدیق)م بینی، وتی ئەمشەو لای مزگەوت چاوەڕێبکە یەکێک ئەنێرم بە شوێنتا، لەکاتی خۆیدا ڕاسپێردراوەکە هات و سوار سەیارەکەی خاڵە عەگیدی کردم، وتی ئەچین بۆ ساوجی لەوێ داوای تۆ ئەکەن، لە ساوجی خورشید ناوێکم بینی، وتی سەرکردایەتیمان سڵاویان بۆت هەیە، ئەگەر بتوانی لەڕێی ئەو ئەفسەرانەی ئەیانناسی نەخشەیەکی سەربازگەکەو جۆری چەکەکانیان و ڕەبیەکانی ئەو عەرەبە شۆڤێنیانەی دوژمنایەتی ئێمە دەکەن، بۆمان دەستنیشان بکەی، لە پاش دوو ڕۆژ ئەو کارەم ئەنجامداو لە نزیک ساوجی خورشیدو کەسێکی ترم بینییەوە.خورشید وتی تۆ ئاگادار بە لەم شەوانەدا دێین سەربازگەکە دەگرین، ئیتر بۆ ڕۆژی دوایی تۆپخانەیەکی زۆری ئێران لە دەوروبەری (باشماخ و هەلالاوا) دامەزران، شەوێک تۆپباران دەستپێکردو لە چەند قوڵێکەوە هێرشکرا بۆ پێنجوێن و سەربازگەکە، زۆربەی سەربازو پلەدارەکان بەرەو (سەیسایەق) هەلاتن، بەلام

سەربازگەکە نەگیرا، وتیان فەرماندەی بەتالیۆنێک کە بڕیاربوو لە گوندی(ئاسنەوە) هێرشبکات بۆ ڕەبیەکانی ناو پێنجوێن، ناپاکیکردووەو هێرشینەکردوە.ئیتر پەیوەندیم لەگەڵ مام عەزیز دوور بە دوور هەر هەبوو، هەتا دوای ڕاپەڕین لە خۆپیشاندانێکدا لە هەولێر کە بۆ پشتگیری شۆڕشی باکوور کرا، یەکترمان بینییەوە، ئەویان گرت و لە عەینکاوە خستیانە بەندیخانەوە، پاش چەند ڕۆژێک بەریاندا، لە ڕێگەی (عەبدوڵا سەیدۆک)ەوە پێوەندی پێوەکردم و وتی دەمەوێ بچم بۆ (خواکورک)، من کارەکەم بەجێگەیاند، خۆیشم لە هەولێر لەماڵی (نەسروڵا سورچی و مومتاز حەیدەری) مامەوە، چونکە هێزێکی چەکدار چووبوونە ماڵی ئێمەو تالانیان کردبوو، خێزان و منداڵەکانم چووبوونە ماڵی نازەنین خانی خێزانی شەهید (ئەحمەدی دەلاک)، خۆشم هاتمە سلێمانی. ساڵی ١٩٩٢ شەڕی پەکەکەو بەرەی کوردستانی دژوستبوو، پێوەندیمکرد بە (نەوشیروان مستەفا)وە، هەوڵماندا ئەم شەڕە نەکرێ، بڕیارماندا بچین بۆ خواکورک، کاک نەوشیروان شاندێکی لەگەڵ خۆی هێناو ئەو لەسیدەکان مایەوە، من و (شێخ تاریق نوری) بەچیای شاکێو هەڵزناین، تاریک و ڕوونی بەیانی گەشتینە بارەگاکانی پەکەکە. بەلای ڕووبارێکدا ڕۆشتین بینیم مام عەزیز بەو سەرمایە مەلەدەکات. لەگەڵ سەرکردەکانی پەکەکە کەوتینە کۆبوونەوەو دانوستاندن، مام عەزیز هانی ئەوانی ئەدا بۆ شەڕ.

لەساڵانی ١٩٩٤ – ١٩٩٥ مام عەزیزم لە ئەڵمانیا بینییەوە، لەلای بەرێز (ئۆچەلان)ەوە هاتبوو هێنام بۆلای خۆم بۆ ئەنستیتیوتی کوردی لە بەرلین، ئیتر لەوێ دەستیکرد بەڕێکخستنی فەرهەنگەکەی و نووسینەوەی، (پەروەرو عەبدوڵا) یارمەتیان ئەدا، شوێن و ڕێگەمان بۆ دابینکرد، زۆر ئاسوودەو کەیفخۆش بوو و هەندێ چارەسەری دکتۆریمان بۆ ئەنجامدا، لەگەڵ خۆم شارەو شار ئەمگێڕاو ئەمبرد بۆ کۆڕو کۆبوونەوەکان، تازە تەلەفزیۆنی (مەد تیڤی) دامەزرابوو،

چەنـدین بەرنـامەی کولتـووری، زمـانەوانی، مێژوویـی و سیاسـیمان تۆمارکرد، ڕۆژێک بردم بۆ (پۆتسدام) بۆ ئەو کۆشکەی کۆبوونەوەی (سـتالین، چەرچـل و ڕۆزفێلـت)ی بـۆ دابەشـکردنی ئەڵمانیـای نـازی تێداکرا، کە هـاتینە دەرەوە زۆر خەمبار بوو زۆر گریـا، ئیتر چووینە قاوەخـانەیەک پـاش پشـوودان و قـاوە خـواردنەوەیەک ئەمـلاو ئەلای منـی مـاچکردو وتـی: یەکەمجـار کەتـۆم بینـی زۆرم خۆشویسـتی، ئومێدیشـم پێـت هەبـوو.ئەو کـاتەی کە لە ئینسـتتیوت بـوو، کـوردی بەرلـین، لە خـزم وناسـراوەکانی و لەپـارتی و کـۆنە پێشـمەرگەکانی خـۆی دەسـتە دەسـتە دەهـاتن بـۆ لای، ڕۆژێـک مـام عەزیـز دیارنەمـا، بیسـت و چـوار کـاتژمێری بەسـەردا چـوو، ئیتـر ئاگـاداری پـۆلیس و شارەوانی و وەزارەتی ناوخوی ئەلمانیامان کرد. هەوالماندا بە بەریز (ئـۆچەلان)، ئەویـش ئاگـاداری ڕێکخسـتنەکانی لە ئەوروپـادا کـرد سۆراغیبکەن، دوای هەشت نۆ ڕۆژ ناسراوێک لە شاری (کیـۆڵن)ەوە تەلەفـۆنی بـۆ کـردم وتـی ئەمڕۆ مـن (دۆڵمـێچەر) وەرگێڕی عەزیـز ئاکرەیی بووم لە دادگاو لای پۆلیس، لێیان پرسیووە لە بەرلین لەکوێ بوویت؟ ناوی تۆی هێناوە، بۆیە پێت ئەڵێم ئاگاداربە! لێم پرسی بۆچی گرتوویانە؟ گوتی نەیارەکانی مام عەزیزو پەکەکە ڕاپۆرتیان لێداوە بە(گرییـۆ) دەزگـای دژە تیرۆرو هەواڵگریـی ئەڵمانیـا، کەوا وەزیرێکـی حوکـومەتی سـەدام کە ژەنەڕاڵێکـی عەسـکەرییە لە بەرلینـە، ئیتـر ئەم دەزگایە کە بارەگاکەی لە کۆڵنە گرتوویانەو هێناویانە بۆ ئێرەو سێ ڕۆژە لێکـۆڵینەوەی لەگەڵـدا دەکەن، چـونکە مـام عەزیـز تـا ئەو کـاتە خـۆی تەسـلیم نەکردبـوو، هەر بە تەمـابوو بچـێ بـۆ لەنـدەن، ئیتـر ئەوەبـوو ئەڵمانیـا مـافی پەنابەرییـان پێیـداو هەر لەوێـش مـایەوە تـا ژیانئاوایی کرد.دواجار لە پرسەی مینا خانمی خێزانی قازی محەمەد، لەمـاڵی عەلـی قـازی لە شـاری بـۆن یەکتریمـان بینیـیەوە، چەنـد کاتژمێرێک پێکەوە دانیشتین.

ڕۆحت شاد پیاوی تێکۆشەرو کۆڵنەدەرو کوردپەروەر

## (٦٧)
# ئاگری نەورۆز لە شەمەندەفەردا

بە درێژایــی تەمەنــی ڕژێمــی ســەدام دوای پاشــگەزبوونەوەی لەبەنـدەکانی ڕێکەوتنـامەی یـازدەی ئـازارو پووکـانەوەی نـاوەڕۆکی ئۆتونۆمییە یەکلایەنییەکە، هەمـوو دەستکەوتەکان یەک لە دوای یەک پشتگوێ خران، تەنیا تروسکەیەک کە مابوو، مەیدانە ڕۆشنبیرییەکە بوو، لەپاش نسکۆو هەرەسهێنانی شۆڕش، بزاڤی ڕۆشنبیریی ڕۆڵێکی گرنــگ و مێژوویــی بەرچــاوی هەبــوو لەبەرزکــردنەوەی ورەی ڕووخاوی خەڵکی کوردستان و سەرلەنوی مورالی گەلی گەیاندەوە لوتکەی شۆڕشگێڕیی، ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین، کە گۆڤاری بەیان، ڕۆشـنبیری نـوێ، کـاروان، ڕۆژنـامەی هاوکـاری و گۆڤـاری کـۆڕی زانیاریی و بەرهەمە چاپکراوەکانی ئەو سەردەمە، بوونە جێگەی هیوا و شوێنی بەبادانی غەم و مەراقی ڕوناکبیرو گەنجەکان.

پێویستە ئەو ڕاستیەش بزانرێت، کە ئەدەب و ڕۆشـنبیری ڕۆحـی لە گیـانەڵای گەلیـان گەیانـدەوە لـوتکەی بەرخـۆدان، ئەدەب بەهەمـوو ژانرەکانییەوە، شیعر، چیرۆک، ڕۆمان، هونەر بە هەموو شێوەکانیەوە موزیـک، گـۆرانی، شـێوەکاری، شـانۆ، میهرەجـان و کۆڕوکۆبـوونەوە ئەدەبییەکـان ئەمـانە میکـانیزمێکی بە هێزبـوون بـۆ هۆشـیارکردنەوەو وەڵامـدانەوەی هەرەس، ڕاسـتە لەم چەنـد ســاڵەی دواییـدا هەنـدێک نووسـەر هەڵوێسـتیان لەنووسـین وەرگـرت، بەڵام خەبـاتی پیـرۆزی فەرهەنگیی هەر بەردەوامبوو. لەژێر دروشمی بەرەو ئەدەبی بەرگریی و فەلســەفەی (وشــەو فیشــەک لەیەک خەنــدەقی بەرگریــدان)، ڕۆشنبیرەکان هەموو هەڵێکیان دەقۆستەوە بۆ ئەوەی بەقەڵەم، فڵچە،

نوانـدن، ئـاواز بەرگـری لە خـاک و نەتەوە بـکەن و لەم مەیـدانەدا قوربانی زۆر درا.

لەسـاڵی هەشـتاو شەشـدا فیسـتیڤاڵی (مەربەد) لەبەغـدا سـازکرا، زۆرئەدیـب و شـاعیر بەشـدارییان تێدا کـرد، لە یەکێک لەکۆڕەکانـدا شاعیری وەک: نزار قەبانی، عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی و یوسف سایغ شـیعریان تێدا خوێندەوە، لەشـاعیرانی کـوردیش: جەلال زەنگەبـادی، محەمەد بەدری، سـەلیم بەرەکـات، سـەلاح شـوان، عەبدوڵا عەبـاس و نافع ئاکرەیی بەشداربوون.

کۆتـا رۆژی فیسـتیڤاڵ بە شـەمەنەفەرێکی تـایبەتی بەرەو شـاری بەسـرد بەرێکەوتـین. بـۆ ئەوەی بەشـداری لە کـۆنگردی ئەدیـب و نوسەرانی عەرەب بکەین، کە لە هەمـوو وڵاتـانی عەرەبی، ڕۆژهەڵاتـی نـــاوین و جیهـــانەوە گەورە شـــاعیرو کەڵە نووســـەرەکانیان بانگهێشتکردبوو.

ئەو شـەوە، شـەوی نەورۆز بـوو، ئـێمە ویسـتمان سـوپرایزێکی نـاوازە پێشکەشـبکەین، لە هەمـوو فـارگۆنی شـەمەنەفەرەکەدا چەپـکە گـوڵی نەورۆزو پـان کـاردی جەژنە پیـرۆزەو شـیرینیمان بەشـییەوە، مێزێکمـان ڕازانـدەوەو یەکێکمـان بەلای مێـزەکە دانیشـتبوو، بەنـدە بە جلی کوردی ڕانک و چۆغە پشـتێنی گوڵ گوڵی و کڵاشـی هەورامی خۆمکرد بە شـەمەنەفەرەکەداو لە مێـزی چێشـتخانەکەدا دانیشـتبووم، شاعیری گەورەی عێراق عەبدولڕەزاق عەبدولواحیدو حەمید سەعیدو چەند شاعیرێکی کورد دانیشتن و لەیەک کاتی دیاریکراودا لە هەمـوو فارگۆنەکاندا ئاگری نەورۆزمان بە مۆم کردەوە.

ئەوەی شـایانی بـاس بێت مەحمـود زامدار، دکتـۆر حسـێن جـاف، دکتۆرنـــافع ئـــاکرەیی و ســـەلاح شـــوان بەفارگۆنەکانـــدا ئەگەڕان و شیرینیان پێشکەشئەکردو لەبارەی جەژنی نەورۆزو شۆڕشی کاوەی

ئاسنگەر قسەیان بۆ میوانەکان ئەکرد، باسی نەورۆزیان بۆ دەکردن، کە ئەمە جەژنی سەرکەوتنی زۆرلێکراوانە بەسەر زۆردارانـدا، جـا لەبەرئەوەی من جلی کوردیم لەبەردا بوو، کەوتبوومە ژێر تیشک و سەرنجی هەموو میوانە عەرەب و بیانییەکانەوە.

ڕۆژانی کۆنگرەو شەوانی هوتێل، لە کاتی پشووەکاندا دەهاتنە لامان و لەبارەی نەورۆزو کێشەی کورد پرسیاریان لێدەکردین، کۆتا شەوی کۆنگرە کرا بە شەوی شیعر، وا ڕێککەوت من لە دوای مەحمود دەرویش چەند پارچە شیعرێکم کرابوو بە عەرەبی خوێندمەوە، هەروەها دکتۆر بەدرخان سندی، محەمەد بەدری و سەلاح شوان شیعریان خوێندەوە، ئەوەی جێگەی دڵخۆشی و سەرنج بوو، بۆ من محەمەد زفزاف گەورە ئەدیبی مەغریبی، شاعیرێکی یەمەنی باشوور، شاعیری بەناوبانگی تونسی کە خاوەنی ئەم چامە بەناوبانگەیە(خروف دخل البرلمان قال: باع... ويرد الصدى بالإجماع...). ئەمانە شیعرەکانیان لێ وەرگرتم و لەسەر کێشەی کورد دیداریان لەگەڵدا ڕێکخستم.

## (٦٨)
## گەشتێك بۆ کۆنە هەواران بە هاوڕێیەتی بولبولی کوردستان هۆمەری دزەیی

کۆنە هەواران کۆنە هەواران
مەنزلگای دۆست و جێژوانی یاران.
هەواران وێران یاران نادیار
رەنج و وەفایە بووە بە یادگار

لە پاش کەرەنتینەیەکی چوار مانگەی ئارەزوومەندانەی خۆم، کەڵکەڵەی گەشتێکی نیشتمانی جوان کەوتەسەرم، لە هەولێری دێرینەوە بۆ هاجی هۆمەران بەتایبەتی بۆ گوندی ناوکێلەکان، گوزەر بە گەلی عەلی بەگ، بێخاڵ، دۆڵی باڵەکایەتی و باڵویان!

پشوویەک لە بێخاڵ و چۆمان، بۆ هەواڵی هاوڕێ و دۆستان.! بۆ جێژوانی تاریک و ڕوون بۆ کۆبوونەوەی نهێنی نوێژی شێوان!!.

گەلاڵەی جوان، وێرانەیەک مرۆڤم لێنەبینی کە بیانناسم و بمناسنەوە، ئەوا ٥٠ ساڵ تێپەڕی من مێژەرێکی بەفرینم لەسەرم هەڵگرتووە. هەر وەکو ریشی هەڵگورد، لە زستاندا سپی بووە، هەواڵی هەرکەسم پرسی، لەمێژە ژیانئاوایی کردووە، گوتم حەسەن ئاغا کوانێ؟ گوتیان زۆر لە مێژە ماڵئاوایی کردووە.

حەسن ئاغا شیوعیەکی کۆن بوو، بوو بوو بە پارتی و سەر بە پاراستنیش بوو، بەلام وەفای هاورێیانەی هەر مابوو، زۆر ڤەشارتی یارمەتیئەداین، دەیووت با کاک فرانسۆ هەریری نەزانێ، لە گوندی

ناوکێلەکـان پشـــوویەکماندا، لەبەر مارکێتێـــک وەســـتابووین لە پـــڕ کـابرایەکی بەتەمەن هـاتە دەرەوە وتـی: فەرمـوو فەرمـوو کەرەمکەن، مـن نـاوم مـام دەروێشـە، کەوتـمە قسـەکردن لە تەکیـا، هەواڵـی مەلا مێژوو، پورەگوڵەو چەند کەسێکی ترم لێپرسی، بە غەمبارییەوە وتـی ئەنفالکران، شەهید بوون.

کە دیقەتی منیدا وتی ئەرێ تۆ هاوڕێ جەمال نیت کە (شـرینقە)ت لە منداڵەکانم دەدا؟ نازانم پاش ٥٠ ساڵ زیاتر چۆن منی ناسییەوە؟! ئەوەی لە بارەگای شیوعییان(شـوحیان) بـووی؟ ئەو هەواڵـی سـەعید مەتەرو ئیبراهیم عەلاوی و عەزە ڕەش و مستەفا چاورەشی لێپرسیم، ئەو کـاتە مـن لەگەڵ چەنـد هـاوڕێیەکی شـار لەم گونـدو نـاوچەیەدا خەباتی سیاسی و ڕۆشنگەری شیوعیانەمان دەکرد، کەمالە کوێر و کەمال شاکرو چەند گەنجێکی تر بووین.

مەکتەبـی سیاسـی، هێزێکـی پێشـمەرگەو بـنکەی سـەرەکیمان لە گونـدی نـاو کێلەکـان بـوو، لە یـادمە یەکەم کۆبـوونەوەی پـاش کۆنفرانسـی (ئەسـتێل)مان لەوێ بەسـت، لە پێشـووی کۆنفرانسـەکەدا، گوێمـان لە ڕادیـۆی بەغـدا گرتبـوو، هەواڵـی دانپێـدانانی حوکـومەتی عێراقی بە ئەڵمانیای دیموکراتی ڕاگەیاند، لە ڕاگەیاندراوەکەدا؛ عێراق داوای هاوپەیمانێتی ئابووری و سەربازی کردبوو.

کۆبوونەوەکەمان وەستا، ئیبراهیم عەلاوی باسی (پرەنسیپی فیلی برانـد) ڕاوێژکـاری ئەوســای ئەڵمانیـای ڕۆژئـاوای کــرد (کەهەر دەوڵەتێک لە دەرەوەی بەرەی سۆسیالیستی ئەگەر دان بە ئەڵمانیای دیموکراتیدا بنێت، ئەوا دەبێت ئەو دەوڵەتە بڕوخێت و لەناوبچێت).

لەسەر ئەمە گەنگەشەو ئاخافتنی زۆر کرا، مەکتەبی سیاسـی بـوو بە دوو دەســتە، دەســتەیەک دەیـانوت دەبێـت دەسـت لە دروشـمی ڕووخانـدنی دەسـەڵات هەڵبگـرین، دەســتەیەکی تـر دەیـانوت دەبێـت

شــــەڕی چەکـــداری و دروشــــمی ڕووخانـــدنی دەســـەڵات هەر بەردەوامبێت، بۆ دەرچەیەک لەم تەنگەژەیە من و ئیبراهیم عەلاوی پێشنیارمانکرد لە مـاوەی دوو مانگدا بتـوانین پلینێۆمێـک بگـرین، هەرواش بوو کۆبوونەوەیەکی فراوانمان پێکهێناو پاش گفتوگۆیەکی ۳ شەو و۳ ڕۆژی دروشمی کۆتاییهێنان بە دەسەڵات هەر وەک خۆی مایەوە، پاشـان کۆبـوونەوەی دەسـتەی کـارگێری کـرا، کارەکانمـان دابەشکرد، من و ئیبراهیم عەلاوی و مستەفا هـاتینەوە بۆ سلێمانی. ئەو کاتە گوندی ناو کێلەکان ئاوەدان بوو نوێژی هەینی تێدا دەکرا، لە گونـدی پاشـکۆزی نزیکـی ناوکێلەکـانەوە نوێژکەرەکـان دەهـاتن بـۆ مـزگەوتەکەی نـاو کێلەکـان. حەمەد ئاغـای مێرگەسـۆری لە پاشـکۆز دادەنیشت هەموو هەینییەک دەهات، ئێمەش وەکو ڕێزێک بۆ خۆی و ئەو کەسانەی لەگەڵیدابوون؛ لە بنکەکەمـان بانگهێشتی نانخواردنمـان دەکــردن، ئەو لەبەرئەوەی هەنــدێک لە کوڕەکــانی شــیوعی بـــوون سۆزێکی بۆ ئێمەی شیوعی هەبوو و نانی ئێمەی بەحەرام نەدەزانی.

لە بنکەکەمان چەند شیوعییەکی خەڵکی ناسریە هەبوون، ئیبراهیم عەلاوییـش کە خـۆی خەڵکـی قەزای (قەلـعەت سـوکەر)ی پارێزگـای ناسـریە بـوو، حەمەد ئاغا زۆر باسـی پیـاوەتیی خەڵکـی ناسـریەی بۆ دەکـــردین، کە ئەو کـــاتەی لەوێ دەستبەســـەرو زینـــدانیی بـــووە، شیوعییەکان و خەڵکی ناسریە زۆر یارمەتییان دابوون، ئیتر ئەوانەی خەڵکـی ناسـریە بـوون زوو زوو هامووشـۆی مـاڵی حەمەد ئاغایـان دەکرد.

ئـێمە لە بنکەکەمانـدا دەرمانخـانەیەکی بچکۆلانەمـان کردبـووەوە، دکتۆرێکیشمان هەبـوو بە نـاوی دکتـۆر ئەبوقەیس، هەمیشـە بە دەنـگ برینـدارو نەخۆشــەکانی گونـدی نـاو کێلەکـان و گونـدەکانی دەورو بەریەوە بوو، ئەمە وایکردبوو خەڵکی ئەو ئاوایـانە قسـوریمان لەگەڵ

نەکەن لە ناردنی هێلکە و ماست و دۆی بەهاراندا، ئاخر من و کەماڵە کوێرو مستەفا چاوڕەش هەر لە لای دکتۆر ئەبو قەیس فێری دەرزی لێدان و برین پێچی بووین.

ئەبو قەیس بۆ هەر گوندێ بچووایە جارجار یەکدووانێکمانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، ئێمە لەو گوندەدا حەمامێکمان لە نزیک ڕووبارەکەوە دروستکردبوو، بە ئاگری دار گەرممان دەکرد، جار جار ڕێگەمان بە هەندێک کەسانی ئاوایی دەدا لەوێ خۆیان بشۆن، ئەمانە ئێمەی لای گوندییەکان خۆشەویست کردبوو.

لە یادمە ڕۆژێک من لەوێ جلم دەشت، سەیرمکرد ئاو بەشی خوشوردنەکەم ناکات. لە دەرەوەش بەفرێکی زۆر بارییوو، ئیتر دەرگای حەمامەکەم دەکردەوە بە تۆپەڵ بەفرم دەخستە ناو بەرمیلی ئاوەکەوەو دەتوایەوە و خۆمم پێدەشت.

داخەکەم بۆ ئەو ڕۆژانە، ئێستەش کە هەوای پانکە لێمدەدا، لەوانەیە هەفتەیەک لە جێگەدا بکەوم، ئەوانەی لە ژیاندا نەماون گیانیان شاد بێت، ئەوانەیشی لەژیاندان تەندروست و تەمەن درێژبن.

ببورن ئەم دێرە شعرە نەنوسرابوو لەکاتی تایپدا.

# (٦٩)
# دوو ڕۆژ پێش تەقینەوەی
# مەلاکان لەحاجی ئۆمەران

لە دوای ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی یازدەی ئازار، شۆڕشی گەلی کورد لە باشوور تەکانێکی تری بە بزاڤی نەتەوەیی کوردستاندا، کەشوهەوایەکی ئارام و دیموکرات هاتەئاراوە، دەستە دەستە ڕووناکبیرو نیشتمانپەروەران لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە، بە مەبەستی پیرۆزبایی لە (مستەفا بارزانی) بۆ دەستکەوتی ڕێککەوتنامەکە، ڕوویان لە حاجی ئۆمەران دەکرد، ئێمەش شاندێک پێکهاتبووین لە:(شێخ حەسەن قادر کەرەمی، ئەکرەم عیزەت نەجیب، محەمەد سدیق پارێزەر، بەندە) لەسەر ئەوە پێکهاتین سەردانی حاجی ئۆمەران بکەین و پیرۆزبایی ئەم دەستکەوتە لە بارزانی و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بکەین، باسمان لەوەکردبوو، جیا لە بیروڕای خۆمان لەسەر ڕێککەوتننامەکە، ڕەوشی سیاسی، باری ئاڵۆزی شاری سلێمانی، هەڵوێستی هەندێک لە کاربەدەستانی ئەو کاتەی شارو هەڵسوکەوتیان بگەیەنینە لای بارزانی و مەکتەبی سیاسی.

لەناو خۆماندا پێکهاتین ئەگەر دەرفەت نەبوو هەموومان قسەبکەین، بەندەو شێخ حەسەن ئەوەی ڕێککەوتبووین لەسەری بۆ بارزانی باسبکەین، چونکە ئەو ئێمەی باشتردەناسی لەبەرئەوەی چەند جارێک بۆ کاروباری حزبی چووبووینە دیداری.

کاتژمێر نۆی شەو گەیشتینە بارەگای ڕەوانشاد ئیدریس بارزانی، پێشوازییەکی گەرمی لێکردین، دوای پشوویەکی کەم، ناوەکانی نووسی و لەگەڵ خۆی بردی بۆلای بارزانی، کە چووینە ژوورەوە دوو مەلا لە لای سەرەوە دانیشتبوون، یەکێک لە مەلاکان لە سوریاوە هاتبوو، پاسەوانەکان زۆر بە وریاییەوە چاودێری هامووشۆکەران و

دەوروبەری خانوەکەیان دەکرد، وەکو شتێکیان بیستبێ وابوو، مەلا سوریایەکە لای سەرەوە دانیشتبوو، بە فەرموودەو ئایەتی قورئانیی کەوتە ئاخافتن، لە تەک بارزانیدا کۆڕێکی گەرمی ئاینییان پێکهێنا، کاک ئیدریس کە لە نێوان ژوورەکەی خۆیی و بارزانیدا هاتووچۆی دەکرد بەئاماژە پێیوتین: بچنە نزیکی و قسەکانتان بکەن، دوو کورسی لە تەنیشت بارزانییەوە چۆڵ بوو، من و شێخ حەسەن لە نزیک بارزانییەوە دانیشتین و قسەکانی خۆمانمان کرد، لە وەڵامدا وتی: پێشنیارەکانی ئێوەم بەلاوە پەسەندە، ئێوە سەربەستن هەرچی بکەن لەلایەن منەوە ڕێگەپێدراون، چونکە من ئێوە دەناسم هەموو ژیانتان لە حزبی شیوعیدا بو گەل تەرخانکردووە. سبەینی لەگەل ئیدریس گفتوگۆ لەسەر ئەوشتانە بکەن، هەروەها لە شێخ حەسەنی پرسی یاشێخ تۆ ئێستاش هەر شیوعیت؟ شێخ حەسەن وتی نەخێر ئەزبەنی ئێستا ئێمە هەرچوارمان وازمان لەحزبی شیوعی هێناوە، بارزانی بە پێکەنینەوە وتی سوبحانەڵلا شێخ و شیوعی چۆن ڕێکدەکەون؟

بەیانی چووینەوە لای کاک ئیدریس، ئەوەی پێویستبوو گفتوگۆمان لەسەر کرد، لەو کاتەدا ئێمە هێشتا لای بارزانی بووین ئاغاواتی پێنجوێن خۆیان کرد بە ژووردا، ئەوانەی لە یادم بێ میرزا سابیر و میرزا ڕەفیقی برای، حەمەسدیق خانی میشیاو، مەجید خانی حەمەڕەشید خان و مەحمود بەگی گۆڵێ بوون، ئێمە هاتینە دەرەوە، بەیانی سەردانێکی شێخ محەمەدی هەرسین و دکتۆر مەحمودو چەند کەسایەتییەکی دیکەمان کرد، کاتێک لە خێمەکەی دکتۆر مەحمود هاتینە دەرەوە، میرزا ڕەفیق هات بۆ لام و وتی: کە ئێوە ڕۆیشتن کاک ئیدریس لێیپرسین ئەو پێنجوێنییە دەناسن؟ میرزا سابیریش وتبووی بەڵێ ئەوە خزمی خۆمانە، ئاغاکانی تریش هەر وتبوویان دەیناسین پیاوێکی باشە، بەڵام خۆزگە شیوعی نەبووایە، بارزانیش بەپێکەنینەوە وتبووی لەناو شیوعییەکاندا پیاوی باش زۆرە.

هەر ئەوکاتە میرزا ڕەفیق پێیوتم کە لەبارەی منەوە وتوویانە هەر کارو پێویستییەکم هەبێ ئاگەداریان بکەمەوە، بۆ ڕۆژی دوایی من و کاک ئەکرەم شەوێک لە هەولێر لە هوتێل سەندباد ماینەوە، بەیانیی کە هەستاین وتیان مەلاکان لە حاجی ئۆمەران خۆیان تەقاندووەتەوە، بەڵام بارزانی سەلامەتە.

لەم ڕۆژانەدا ٢٠٢٠/٩/٢٥ سەردانێکی میرزا ڕەفیقم کرد لە هەولێر، بەدوور و درێژی باسی ئەو دیدارەو تەقینەوەی مەلاکانی بۆ کردم.

## (٧٠)

# دکتۆره بەتەمەنە چاویلکە
# لە چاوەکە بۆ کوژرا؟

"من بێ چەکم چەندین پێشمەرگەو خەڵکی سڤیلم لەمردن ڕزگارکردووە"... ئەو کاتەی ئامادەکاری دەکرا بۆ شەڕی ١٩٩٢ی شەڕی باشوور و باکوور، تازە لەلای بەڕێز ئۆچەلان لە (بیقاع) گەڕابوومەوە، گرتن و کوشتن و ڕاوەدوونانی ئەوانەی سەردانی ئۆچەلانیان کردبوو دەستییپکردبوو، چاودێری ئەو کەسانەشیان دەکرد کە هەواداری شۆڕشی باکوور بوون، منیش لەو کەسانە بووم کە ئاسایش لێم دەگەڕا؟بۆیە لەماڵی برادەرێکم خۆم پەنا دابوو، شوێنەکەم قایمبوو، هەرلەوێوە پێوەندیم لەگەڵ هەڤاڵاندا ڕێکخستەوە، برادەرەکەم ناسراو و ناوبەدەرەوە بوو، هاوڕێی زۆری لەناو سەرکردەو فەرماندەو بەرپرسەباڵاکاندا هەبوو، ئەو خۆی ئەو کاتە یەکێتی بوو، بەڵام دۆستایەتی لەگەڵ پاسۆک، پارتی و حزبی شیوعیشدا هەبوو، هاوڕێی خاوەنماڵ زوو زوو لەهەموو لایەنە سیاسییەکانەوە سەردانیان دەکرد، منیش نوسەرو ئەدیب و هەڤاڵەکانیش دەهاتن بۆ لام، هەندێکیان ئافرەت بوون، نەخۆش و برینداریان دەهێنا، تا بۆ چارەسەرکردن هاوکارییان بکەم، بەم هۆیانەوە جێگەی من ئاشکرا بوو، چەند جارێک هەڕەشەیان لەخاوەن ماڵەکە کرد ئەویش مەردانە وەڵامیدانەوە.

من لێرەدا چیرۆکێکتان بۆ دەگێڕمەوە، کە کوڕە ئازاکە خێرا خێرا وەکو چالاکییەکی قارەمانانە بۆ ئامادەبوونی کۆڕی خواردنەوەکەی دەگێڕایەوە، ئەو زەمانە(ئارەقی) فەل هەبوو، بەڵام لەماڵی برادەرەکەم ئارەقی ئەسلی و جارجارەش ویسکی هەبوو، بەو هۆیەوە میوانیان زۆر بوو، کۆڕ گەرم دەبوو، برادەران مەستدەبون و باسی شەڕو نەبەردیی و گیانفیدایی دەکرا، ئێمەش زۆر بەتاسەوە گوێمان

لێدەگرتن، ئیتر ئەم چیرۆکانە وەکو مەزەی دانیشتنەکان وابوون، جارجارەش بە خەیاڵەوە لەگەڵ مندا دەکەوتنە گەنگەشەو ئاخافتن، کاک (ر) کەوتە باسی ئەو شەڕانەی لەگەڵ حسک، ئیسلامی، شیوعی و پارتی کردوویەتی، شتی سەیروسەمەرەو بێلەزەتی باسدەکرد.

لەبارەی شەڕی قرناقەو وپشتئاشان ئاوای گێڕایەوەو وتی: زۆر شیوعیمان کوشت، دیلیشمان کوشت، ژنیشمان کوشت، دوای شەڕەکە من و فلان و فلان و لەبن دارێک دانیشتبووین بینیمان کابرایەکی بەتەمەنی چاویلکە لەچاو جانتایەکی بەکۆڵەوەیەو بەگۆچانێکەوە بەهەناسەبڕکی بەرەو لای ئێمەدێ، نزیک بووەوەو سڵاوی کرد. من بەفیشەکی وەڵاممدایەوە. هاواری کرد وتی من دکتۆرم بۆ دەمکوژن؟ من چەندین پێشمەرگەی نەخۆش و بریندارم لە مردن ڕزگارکردووە، چەند ساڵە لەم دەڤەرە تیمارو چارەسەری ئەو جووتیارە هەژارانە دەکەم، کاک (ر) لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی بەسەری ئێوە یەک سەلیەم پێوە نا، تلاوتل هەتا ناو شیوەکە خلۆربووەوە، وتم بڕۆن جانتاکەی بێنن! کەجانتایان هێنا، پڕ بوو لەدەرمان، کوڕە ئازاکە کە بینی زەوقی دانیشتنەکەی تێکداوە ئارەقە فەلەکەش کەس مەست ناکا، ویستی باسەکە بگۆڕێ لەو لاوە کاک (ح) وتی فلان بەسە بەس! ئەوە پێنجوێنی شاعیرەو ئەوەی تۆ گێڕاتەوە هەمووی دەکات بەشیعرو چیرۆک و بڵاویدەکاتەوەو ئابڕوومان دەبات؟منیش ئێستە دەڵێم بەڕێز کاک (ح) وا کردم بە چیرۆک، دەشبێت بە شیعر، بەڵام ئایە ئابڕوماوە!!؟ منیش کوڕەکەم جێهێشت و چوومە دەستشۆرەکە هەرچیم خواردبوو، لەگەڵ قسەکانی ئەودا هەموویم هەڵهێنایەوە.

بەیانی کوڕە ئازاکە هاتەوە بۆ لام وتی: مامۆستا زویر مەبە خۆ تۆ ئێستا شیوعی نیت، هەروەها وتی من ئێستە بەرپرسی جبەخانەیەکم، چەک و دووربینی شەوم لایە، بە برادەرانی پەکەکە بڵێ بە هەرزان پێیان دەفرۆشم، منیش چوومەوە دەستشۆریەکەو وتم قوڕ بەسەر کورد قوڕ بەسەر کورد.

## (٧١)

# دوو شاعیر و دوو چیرۆک

"کاکەی شۆفێر شەونم بگەیەنە نەخۆشخانە، ئێمەیش ببە بۆ بەندیخانە!"

پەتای کۆرۆناش گورزی خۆی لەئەدەبی کوردیدا، شاعیری بەتوانا، بوێرو دژەباو (مەهاباد قەرەداخی) هەر لەو زەمانەوە لە کفری لە قوتابخانەی ناوەندی بوو. وەکو ئافرەتێکی نوێخوازو ئازادیخواز هاتە مەیدانی ئەدەب و سیاسەت، لە گەرمیان وەکو چرایەک قوتابخانەکانی کفری ڕووناککردەوە، شیعرە بە باندۆرەکانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاودەکردەوە، هێشتا قوتابی بوو ناوبانگی دەرکرد، بەتایبەتی ئەو کاتەی لەسەر شیعرە شۆڕشگێڕیەکانی دەستگیرکرابوو.

ڕۆژێک لە بەغدا چووم بۆ (کۆڕی زانیاریی)، سەردانی ژوورەکەی (مەلاشکورو حەمەی مەلا کەریم)م کرد، لەوێ پیاوێکی کەواو سەڵتەلەبەری شەدە لەسەری گەرمیانی لێبوو، کۆڕی ئەدەبی و سیاسییان گەرمکردبوو، من گوێم بۆ گرتبوون، گەلێک بەو پیاوە گەرمیانییە سەرسامبووم، کە تژی شارەزایی بوو لە فەرهەنگی کوردی، ئەوان منیان پێناساند، خێرا وتی ئا فلان حەزمکرد تۆم ناسی، تۆ لە شیعری (کۆتەڵی کامەران موکری)دا، باسی حەمەیاڵ، کەڵپۆس و کۆتەڵت کردوە، ئەو وشانە گەرمیانین، ئایا لە دەڤەری پێنجوێنیش بەکاریدەهێنن؟ منیش وتم بەڵێ، لای ئێمەش بەکاریدەهێنن، بەڵام وابزانم لەو هۆزە جافانەمان وەرگرتوە کە لەبەهاراندا ڕوویاندەکردە ناوچەی پێنجوێن، ئەو پیاوە بەڕێزە

هەرسەیری کاتژمێرەکەی دەکردو بە مەلا شوکری دەگوت نەهات؟ نەهات؟ لەم قسانەدا بووین (عەبدولستار تاهیر شەریف) خۆی کرد بە ژووردا، کابراش باسی گرتنەکەی مەهاباد قەرەداخی بۆکردو ئەویش بەڵێنیپێدا کە هەوڵدەدات بۆ ئازادکردنی، من لەڕێی شیعرەکانیەوە بەڕۆحی مەهاباد قەرەداخی ئاشنابووم.

زەمان هات و چوو، دوای راپەڕین لە هەولێر مەهاباد قەرەداخی بە یاوەری کوڕێکی گەنج و قۆزهاتە میوانیمان، وتی ئەوە هاوسەرەکەمە، ئیتر ئێمە لە هەموو مەراسیمی زەماوەندەکەیاندا بەشداربووین. لەیادمە لەو ئاهەنکە خنجیلانەی لە مالی خوماندا بومان سازکرد خۆی و هاوسەرە جوانەمەرگەکەی ئەم گۆرانیەیان چڕی، ئێمە گیانێکین لەدوو جەستەدا، وەک شیعرو ئاواز لەیەک بەستەدا.

لەم سالآنەی دوایدا لە ئەورووپا چەند جارێک بینیمەوە، بووبوو بە هەواداری تەڤگەری ئازادی باکوورو لەکۆبوونەوەکانی کۆنگرەی نەتەوەییشدا یەکتریمان دەبینیەوەو کاتمان بە باسی شیعر، نوێخوازی و دژە باویی دەبردەسەرو زۆریش هانمدەدا.

شاعیر (ع.ع.شەونم) شاعیرێکی نوێخواز بە هەوایەکی کلاسیک، هاوتای گۆران، دیلان، کامەران و ع.ح.ب شاعیری جوانیی، شۆڕش و نەورۆز، شاعیری ئاگرو کوردایەتی، هونەرمەند، شێوەکار، ئاوازدانەر، دەنگخۆش، زمانزان و قسەخۆشبوو.

وەکو ئەکتەر توانایەکی بەهێزی هەبوو، سەلیقەو شارەزایی لە زۆر بواری هونەریدا هەبوو، بەهرەیەکی بێوێنەی لە لاساییکردنەوەی دەنگی خەڵکیدا هەبوو، لاسایی هەر کەسێکی کردبایەوە، وەکو ئەو کەسە دەهاتەگۆ.

ئەو کاتەی بەڕێوەبەری رۆشنبیری بووم، لەگەڵ شەونم، مستەفا ساڵح کەریم، حەسیب قەرەداخی و شێرکۆ بێکەس پێکەوە دەچووین

بۆ هەموو کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبیی و شیعرییەکان، جارجار ئەحمەد شوکریشمان لەگەڵ خۆماندا دەبرد.

ئەو کاتە من و کاک مستەفا ماشینمان هەبوو، شیرکۆ ماشینەکەی مستەفای ناونابوو ئەسپەسووری ۹۱، هینەکەی منیشی ناو نابوو رەخشی رۆستەم، ئیتر هەرکاتێک دکتۆر ئیحسان لەبەغداوە تەلەفۆنی بکردایە، ئێمەیش بەرەو ئەوێ دەکەوتینەڕێ، بە ئاوازی شەونم و گۆرانی حەسیب چیرۆکی زۆرمان لەم گەشتانەدا هەیە، بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەم چیرۆکەیە کە بۆتان دەگێرمەوە.

نازانم چۆن بوو هەموومان لەپاسێکی بچکولەدا لە هەولێرەوە بۆ سلێمانی کەوتینەڕێ، بەشیعری شێرکۆ و نوکتەکانی کاک مستەفاو گۆرانییە بەناوبانگەکەی حەسیب (تێزتە)، شەونم دەستیکرد بەلاسایی کردنەوەی قسەو وتارەکانی سەدام وەکو خۆی هەتا گەیشتینە دوکان، لەوێ شۆفیرەکە وتی بە یارمەتیتان پۆستێکی هەواڵگریم پێیە دەبێبیدەم بە بازگەکە، هەتا شۆفێرەکە هاتەوە شەونم کەوتە گیانەلاو لەگۆکەوت، مستەفا نوکتەکانی پێچەوانە بوونەوە، کە شۆفێر گەڕایەوە شەونم وتی کاکە من جەڵتە لێیداوم زوو بمگەیەنە خەستەخانە، شێرکۆش وتی کاکە زەحمەت نەبێ شەونم بۆ خەستەخانە ئێمەش ببە بۆ بەندیخانە! شۆفێرەکە زەردەخەنەیەک گرتی و ئێمەش قوڕوقەپمان لێکردو کۆڕەکە وەکو خۆڵی مردووی بەسەردا بکەی ئاوای لێهات، شۆفێرەکە تێگەیشت و وتی خەمتان نەبێ هەرشۆفێرێک لەم ڕێگەیە ئیشبکا هەواڵگریی ئەم کارانەی پێدەسپێرن، من ئێوە دەناسم من کوڕی فلانم باوکم شەهیدی حزبی شیوعییە، هاوڕێی ئەم کاک حەمە دەمینە بووە، ئیتر شەونم ئاهێکی وەبەرهاتەوە شۆفیرەکە وتی بەمەرجێک مامۆستا شەونم لاسایی خوتبەکەی ئەم دواییەی سەدامان

بۆ بکاتەوە، حەسیبیش دەستیکردەوە بەگۆرانییە بە ناو بانگەکەی.
ڕۆحی هەموویان شاد بێ.

هەر بەو بۆنەوەیەوە یادی ڕۆشنبیرو نووسەری ئازادیخواز عەزیز حەریری و شاعیرو زمانزان و پەروەدەکار عوسمان هەورامی کە بەپەتای نەگریسی کۆرۆنا بەجێیانهێشتین، یادیان بەخێرو ڕۆحیان شاد بێ!

## (٧٢)

# ئەو پیاوەی بەگوریسێك بەسترابووەوە

ئەمەی بۆتان دەگێڕمەوە زیاتر لەپەنجا ساڵی بەسەردا ڕابردووە، بەلام هەر لە یادەوەریمدا ماوەو دیمەنەکەی زۆر ئازاریداوم، دوودڵ بووم لە نووسینەوەی، نەوەک بە جۆرێکی نەگەتیف لێکبدرێتەوە؟ من نامەوێ لێرەدا شۆڕشی ئەیلول هەڵبسەنگێنم، لێ هەندێ شتی سەیرو سەمەرە هەیە لە ئەرشیفی هیچ شۆڕشێکدا نەبینراوە.

بۆ نموونە: هەندێک هەبوون لە ناو شۆڕشدا لەوپەڕی دەسەلاتی سیاسی و سەربازیدا بوون، خێزانەکانیان مووچەخۆری میری بوون و مانگانەکانیان بەبێلێبڕین و دواکەوتن وەردەگرت، یان جاری واهەبووە بەپۆل شۆڕشگێران دەچوونەوە ناو حوکومەت و پلەوپایەی سەربازی و مەدەنیان وەردەگرت، یان لەناو حوکومەتەوە دەچوونە دەرەوەو لە شەوڕۆژێکدا دەبوون بە شۆڕشگێڕ، کار وایلێهات ڕەش و سپی تێکەڵبووبوو، ئەم ئالوگۆرە جوگرافیایە سالانێکی زۆری خایاند، دەوڵەتانی داگیرکەریش بەئارەزووی خۆیان گەمەی نامەردانەیەن پێدەکردین (بەهەرحاڵ با واز لەسیاسەت بهێنین).

لە سالانی شەستەکاندا زۆرناوچەی سلێمانی کەوتبووە ژێردەسەلاتی شۆڕشەوە، بە پێی توانا خزمەتگوزاریان پێشکەشدەکرد، ناوچەکانی وەکو قەلادزێ، ماوەت، شاباژێڕ، پێنجوێن، تەوێلەو قەرەداخ ناوچەی ئازادکراوبوون.

بەهجەتی عەونی ئەفسەرێکی خانەنشینی پلەبالای سوپای عێراق بوو، کرا بوو بە پارێزگاری سلێمانی و لە پێنجوێن دائەنیشت، لە حزبەوە (حزبی شیوعی) ئاگادارکرام کە پارێزگار دۆستی خۆمانەو

پێوەندی پێوەبکەن، منیش هاوڕێ (سەلامی عەلی ئەحە ڕەش)م، نارد بۆ لای کە بەناوی شیوعییەکانی پێنجوێنەوە بەخێرهاتنی بکات، لە گفتوگۆی نێوانیاندا بەسەلامی وتبوو خاڵی گومرگەکانمان هەموویان دزن، چەند شیوعییەکم بۆ بنێرن لە جێگەی ئەوان دایاندەنێم، منیش سەردانمکردو پێمـوت هـاوڕێ سـەلام دابنـێ، ئەو کـاتەی سـەلام بەرپرسی بەشێکی گومرگەکە بوو، ئیدارەی پارێزگا بوژایەوە، بەڵام زۆری پێنەچـوو سـوپای عێـراق گەڕایەوە نـاو شـاری پێنجـوێن، پارێزگـاو نـاوچەو هێـزی پێشـمەرگە چوونە گوندەکانی بـایەوەو باشساخی ئێران. جەنابی پارێزگار لەسەر سنووری بناودسووتەو بایەوە کەپرێکی کردبوو لێینووسیبوو (پارێزگای سلێمانی)، جارجارە سـەردانمدەکرد، یەکێـک لەو جـارانە دیمەنێکـی غەمنـاک سـەرنجی ڕاکێشام.

دیمەنـی ئەو پیـاوەی کە بەگوریسـێکی ئەسـتوور بەسـترابووەوە بەدارێکەوە، هەرجارێک سەردانی پارێزگارم دەکرد، کابرا بە تیلەی چاو تێیدەگەیاندم، کە شفاعەتێکی بۆبکەم، کە چوومە ژوورەوە ووتم: بەڕێـز جەنـابی پارێزگـار ئەم دیـمەنە زۆر نامرۆڤـانەیە، وتـی: لە دەسەڵاتی مندا نییە، دادگای باڵای شۆڕش بە تۆمەتی کوشتن، بیست ساڵی بە ملدا داداوە، بەڵام من نازانم چی لێبکەم؟ من خۆم جێگەم نییە تیا بژیم ئەم بەڵایەشیان تووشی من کردووە.

کاک بەهجەت پیاوێکی قسەخۆش و بەڕێزبوو، بنەماڵەکەشیان لە سلێمانی بەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەرو دڵسۆز ناسراون، ووتم بەڕێز من چەقۆیەکم پێیە، بەڵایا ئەڕۆم و چەقۆکەی بۆ فڕێ ئەدەم، ئیتر ئەو خۆی ئەزانێ چی ئەکا، بەمەرجێ من نەخەیتە جێگەکەی ئەو، ووتم وا حوکومەت ئەم ناوە تۆپباران دەکات ڕوو لەکوێ دەکەن؟ تا بیست ساڵی دیکە دار نامێنێ تا زەلامی پێوە ببەستنەوە، ووتی: تۆ هەم

شاعیرو هەم شیوعی ئەرێ تۆ دەیناسیت؟ ووتم نەخێر، ووتی دەبرۆ چی دەکەی بیکە! بەڵام من ئاگام لێ نییە، ئیتر کابرا شەو گوریسی هەڵبڕی و فرتەی لێکرد. پاش بیست و پێنج ساڵ لە گوندی سەرای سوبحان ئاغا کابرام بینییەوە، ئەو منی ناسییەوە، چەقۆکەی نیشاندام، من لەگەڵ کاوەی شێخ لەتیفدا بووم، کابرا چەقۆکەی دەرهێنا کە بەزنجیرێک بەستبووی بە پشتێنەکەیەوە، بە منی ووت: یا شێخ ئەم چەقۆیە ژیانی مرۆڤ لەناودەبات، بەڵام ژیانی منی ڕزگارکرد، ئیتر بووین بەدۆست و ئاشنایەکی گیانی بەگیانی.

وونمان کاک بەهجەت کەسایەتییەکی مەجلیس خۆش و سەرگوزەشتەی بە نرخی لا بوو، بۆی گێڕامەوەو ووتی: تۆفیق وەهبی بەگ سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق بوو، بۆ پشکنین سەردانی سلێمانی کرد، ئەو کاتە ئەزمر پەلێکی سوپای عێراقی لێبوو هات بۆ سەردانی پەل(فەوج)ەکەمان، ووتی کێ کوردە بچێتە لایەکەوە، کێ خوێندەوارە دەست هەڵبڕێ، ناوی هەموومانی نووسی، ووتی بەیانی هەموتان بێن بۆ (حامیەی سلێمانی)، بەیانی هەموومان چووین، ئەوەی ئەفسەربوو، یەکێ ئەستێرەیەکی پێدراین، ئەوەی بڕوانامەی دواناوەندی هەبوو کردی بە ئەفسەرو ئەستێرەیەکی پێدان، ئەوەی بڕوانامەی شەشی سەرەتایی و ناوەندی هەبوو خولێکی بۆ کردنەوە لە(حامیە)، پاش ساڵێک ئەوانیش بوون بە ئەفسەر، کاک بە هجەتیش خۆی لەو ئەفسەرانە بوو، تۆفیق وەهبی بەگ لەگەڵ مەلیک قسەیکردبوو و فرمانێکی کارگێڕی مەلەکی بۆ ئەفسەرەکان دەرکرد بوو، ئاوا ئەبێ کوردایەتی ڕاستیی.

## (٧٣)

# کانی ماسی دادگایەکی بێویژدان و قێزەون

شۆڕشی کوردو ڕژێمە یەک لەدوای یەکانی ڕژێمی بەغداد، زوو زوو دەکەوتنە گفتوگۆکردن، هەر کە ماندودەبون و بەرەو بێهێزی دەچون، دانوستاندێکیان پێکدەهێناو پشویەکیاندەدا، حوکمەت ئەم هەلەی بەکاردەهێناو ئەکەوتنە کنەی شۆڕش و کڕین و فرۆشتن و هەوڵدان بۆ ریزەکانی کوردو شەڕی کورد بە کورد دروستکردن.

لەو دانوستنانەی بارزانی لەگەڵ عەبدولسەلام عارف کردی، پیشمەرگەو شۆرشگیرەکان هاتنە ناو شارەکان. تا رادەیەک دەستیان لە کاروباری کارگێڕیی و دۆسیەی ئەمنی وەردەدا، لە سلیمانی هێزێک بە ناوی شۆڕشەوە دادگایەکیان بەناوی دادگای شۆڕش لە گوندی کانی ماسی لەڕۆژئاوای شارەوە دامەزراند، کەوتنە دادگایکردنی ئەو کەسانەی ئەوان حەزیان لێنەبوو، ئیتر هەندێ بە کوشتن و هەندێ بە ئازاردان و هەندێ بە سەرانە لێسەندن مامەڵەیان لەگەڵدەکردن.ئەمە جگە لەو ئافرەتانەی بەگومانی ئەوەی کار لەگەڵ حکومەت دەکەن ئەیانبردن سوکایەتیان پێدەکرن و گوایە ناموسی کورد دەپارێزن !!. ئەوانە قەسابخانەیەکیان پێکهێنابوو بۆ ئازاردانی شیوعیەکان و جەلالیەکان و سەرانە سەندن لە دەوڵەمەندەکانی شار .

لەماوەی چەند ڕۆژێکدا لە سلێمانی ٢٠ ئەندام و کادری حزبی شیوعیان تیرۆرکرد، کە کەسانی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەری کەسانی دیاری شارەکەبوون، وەکو: ڕەئوفی حاجی قادرو عەبدولرەحمانی سالی خلەو مەلا عەلی و هاولاتیانی دلسۆزو دیاریتر، کە هەندێکیان لەبەرچاوی ماڵ و منداڵیان یان لەسەر کارو دوکانیەکان ئەیانکوشتن.

ئەوکاتە من لەناو شار لە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی کاردمدەکردو (مەجید عەبدولرەزاق)یش بەرپرسی سلێمانی بوو، پێکهاتین لەسەر ئەوەی شاندێک بچین بۆ لای کوێخا سمایلی تەلان،

چونکه ئەو کاتە کوێخا وەکو نوێنەری بارزانی ناسرابوو، شاندەکەمان بریتی بووین له مەجید عەبدولڕەزاق و بەندەو نوری قەرەچەتانی.

چوینه لای کوێخا باسی ئەو ڕەوشه ناهەموارەی شارمان بۆ کرد که کانی ماسی دادگا نییه، بەڵکو له قەسر نهایه خراپتره، داوامان لێکرد بچێت بۆ لای بارزانی و ئەم ڕەوشەی تێبگەیەنێت، هەندێ بەڵگەو زانیاریمان پێدا.پاش چەند ڕۆژێک گەڕایەوه بەیاننامەیەکی به واژۆی بارزانی هێنابوو، تیایدا نوسرابوو ئەو کاسەنەی دەسیان لەو کاره خراپەدا هەیە لەپارتی دیموکراتی کوردستان دەرکراون، لیژنەیەکیان بۆ لێکۆڵینەوه دروستکردوه، بەم نزیکانه دەگەنه سلێمانی. پاشان دەرکەوت که ئەسڵەن ئەم دادگایەو ئەو کارانەی دەیکەن بەدەستی هەواڵگریی عیراقی (کەریم حەمدانی)و ساواکی ئێرانی (خ.ب) دروستکراوه، کەسانێکی نەشارەزاو شارەزا بەناوی کوردایەتی بەڕێوەیدەبەن.لەو کارەساتانەی ئەم دادگایە ئەنجامیدا، که لەدوای دادگاییه بەدناوەکانی هیتلەر بۆ سووتاندنی جوولەکەکان وێنەیەکی دەگمەنە، له سەدەی بیستدا (ئاورەحمانی ساڵحی خەله) یەکەم کەسبووه مەحکەمەی کانی ماسی به سوتاندن حوکمی مردنیدا.

ئەڵێن قسه قسه ڕائەکێشێ، له دانیشتنێکدا باسی ئەم حوکمه قێزەونه کرا و گەنگەشەی زۆری لێ دروست بوو . له دانیشتنەکەدا ڕووناکبیری ناسراو (فوئادی مەجید میسری) له وێبوو، کاک فوئاد وتی: ئەو شەوەی ئەورەحمانیان سوتاند، منیش لەسەر جەلالی له کانی ماسی حەپسبووم له ژورێکی تاکەکەسیدا بووم، له پەنجەره بچووکەکەی سەر دەرگاکەوه چاوم لێبوو دەبەیەک نەوتیان کرد بەسەر ئاورەحمانداو ئەو کەسەم ناسی که شقارتەکەی لێدا، هەرگیز ئەو دیمەنەم له یادناچێ، که مرۆڤێک بووبووه گوژمەیەک کڵپەو گر هاواریدەکرد بژی شیوعیەت، بژی جووتیار، بژی کرێکار، ئیتر تاکڵوکۆی دامرکایەوه هەر هاوار هاواری بوو، (منیش وتم با ئەم باسه لادەین برادەران کوجا شاهید میسلی قازی؟).

پێویسته دادگای کانی ماسی بچێته کتێبی گینسەوه چونکه سزای سوتاندی مرۆڤێک دەدا له سەر جیاوازی ئایدۆلۆژی.

## (٧٤)
# موفتی پێنجوێنی چرایەکی گەش و شاعیرێکی ئازادیخواز!

بە ئەرکێکی ویژدانی و نیشتمانی دەزانم، چەند رستەیەک لە بارەی مەلایەکی بەهرەدار، دانا، خاوەن هەڵوێست و بوێرەوە بنووسم، کە پاشخانێکی مەعریفی و زانستی نوودەمیانەی هەبوو.

ئەو لای وابوو هەمووان لە ئەرک و مافدا یەکسانن و دەرفەتی ژیان و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانیش دەبێ بۆ گشت بێت، واتا موفتی نەک هەر شاعیرێکی کلاسیکی و ویژدانی و نیشتمانپەروەری یاخیبوو، بەڵکو چرایەکی پرشنگداری رۆشنگەریی بوو، دوکانەکەی مەڵبەندی منەوەران و رۆشنفکرانی ئەو سەردەمەبوو، کە لە تاریکی و نەزانیدا کۆمەڵگەی کوردی بەرەو نقوومبوون دەچوو! ئەو شیعری کردبوو بە ئامرازێک بۆ گەیاندنی بیروباوەڕە رەخنەگرانەکەی لە نەریتە دواکەوتووەکانی ئەو سەردەمە، رەخنەگرتن لە سیستەمی دەرەبەگایەتی و رژێمی پاشایەتی، هەروەها (راڤەکاریی مەلاکانی ئەو زەمانە) بەتایبەتی لەبارەی میرات و مافی ژن و مامەڵەی نا جۆری ئاغاکان لەگەڵ جووتیارە هەژارەکاندا.

ئەو لە رێگەی شیعرەوە وانەی بیری نوێی بەگەل دەوتەوە! بۆیە ئەو مەلایانەی لەگەڵ ئەودا هاوڕانەبوون وەکو تانەیەک ناویاننابوو مەلا بابی، نەیانئەزانی لەڕەوتێکی سۆفیگەریدا هەر کەسێک گەیشتبێتە پلەی باب، مانای دەروازەی گەیاندن و ئاشنابون بە خودا ( بابولا)بووە، هەر ئەو کاتە لە پێنجوێن چەند کەسێک هەبوون بەخۆیان

دەوت (بەلشـەفیک)، بیروبـاوەڕێکی تازەیـان بڵاودەکـردەوە پێیانـدەوت سۆسیالزم (هاوبەشی و یەکسانی).

(مەلا عەبــدوڵڵا)ی بێســـتانی لە دوکـــانی جگەرفرۆشـــیەکەیدا کۆیدەکردنەوەو باسی بیروباوەڕە نوێیەکەی بۆ دەکردن ئەوانە بریتی بـوون لە: ئەحـمەدی عەبە بـلە (موختـار)، حـاجی قـالە بەراز، حەمەی دەروێش ئەحـمەد، مەحمـودی ئەحـمەدی خـوامراد، حەمەی بـاخەوانی شاعیرو تـایەری میرزا ئەحمەد.موفتی لەگەڵ شـاعیری نەمـردا (قـانع) لەکاتی جـاڕدانی کۆمـاری کوردسـتان سـەردانی سـابڵاخیان کردبـوو، ڕیورەسمی هەلکردنی ئالای کوردستانیان بینیبوو. ئەو ماوەیەی لەوی مـابوونەوە بە ئایـدۆلۆژیای بەلشـەفی ئاشـنابووبوون و چاویـان بە چەند ئەفسەرێکی سۆڤێتی کەوتبوو، لە گەڕانەوەیاندا گۆڤاری هەلالەو بڵاڤۆکی تریان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووەوە، کە وێنەی قـازی مـحەمەدو مەلا مستەفای بارزانی و حەمە ڕەشید خانیان بە بەرگی ژەنەراڵیەوە تێدابوو، هەروەها وێنەی چەند ئەفسەرێکی ژنی سۆڤیەتیان هێنابوەوە، ئەو وێنانە لای ئێمەو مانان جێگەی سەرسوڕمانێکی بێئەندازە بوون.

لەگەڵ کاک مەحمودی برام کە دەچووین بۆ دوکانەکەی یان بلێین مەڵبەنـدە ڕۆشـنگەریەکەی مـوفتی پێنجـوێنی، گـوێم لە گێڕانەوەیـان دەگـرت بە زەحـمەت ئەقڵـم قبوولـیدەکرد کە ژن ژەنەڕاڵ و ئەفسـەر بێت، ئێستەیش گوێم بەو وشانە دەزرنگێتەوە : بەلشەفی، سۆسـیالزم، سۆڤیەت، پێشەوا، کۆمـار، ژەنەراڵ و دیمـوکراتی، کە لەو دانیشـتنانەدا دەمبیستن، موفتی بۆ ئەوەی بیسـەلمێنی ژن و پیاو لە کارو فەرمانـا، لە ماف و دادپەروەریدا یەکسانن، (ڕابیعە)ی کچی لەسـەر دوکانەکەی دادەنـا هەتـا بیسـەلمێنێت ژنـیش وەکـو پیـاو دەتـوانێ کاسـبیبکات و بژێـوی ژیـانی خێـزانیش مسـۆگەربکات، (لیمـۆ)ی کچـی خسـتە

قوتابخـانەی کـوڕانەوە بـۆ ئەوەی بیسـەلمێنێ کچـیش وەکـو کـوڕان لەخوێندندا دەتوانن سەربکەون و ئەنجامی باش بەدەستبهێنێت.

لەسەر ئەمە نەیارەکانی کەوتنە تەقەو تانەلێدان، بەلاَم ئەو بەرگەی هەمـــوو ئەم شـــتانەی گـــرت و بە شـــیعر وەلاَمـــی دەدانەوەو دەمکـوتیکردن، دەیـووت شـیعر ئـامرازێکی کـاریگەرەو جەمـاوەری ڕەشـوڕووتی نەخوێنـدەواریش دەتـوانێ ئەزبەری بکـاو پارێزگـاری لە خـۆی و بیروبـاوەڕەکەی بکـات. هەڵبەسـتە بەناوبـانگەکەی مـوفتی پێنجوێنی:

**پێنجوێن بە بێ تۆ نزیکە مەرگم**
**لوبنان شکێن بووی داخی بە جەرگم**

بەهـۆی بـوومەلەرزەو وێرانبـوونی پێنجـوێنەوە لەسـالاَنی ١٩٤٨ - ١٩٤٩ نووســیبوی و لە ســاڵی پەنجاکانــدا لەئــاهەنگی ڕێوڕەســمی داگیرساندنی کارەبای پێنجوێندا خۆی شیعرەکەی خوێندەوە، هەر بەو بـۆنەوەیەوە لەچـامەی پێنجـوێنەکەم چەنـد کـۆپلەیەک پێشکەشـی خوێندەوارانی هێژا دەکەم:

**پێنجوێنەکەم**
**ە وێنەکەم**
**شاری هەرمێ و هەنگوینەکەم**
**ئەی گۆشت و ئێسک و خوێنەکەم**
**کلوەبەفری شیوو و شاخت**
**دارگوێزی چڕ بە دەماخت**
**ئاووهەوای سازگارت**
**گەشت و سەیرانی بەهارت**

پاییزی پەلکە زێرینت
لوتکەکانی وەک پەرژینت
کانیەکانی بەر مانگە شەو
شەپۆلی دەنگی قاسپەی کەو
گوڵە شیلانی ڕەنگاو ڕەنگ
چەند جۆرە گژو گیای قەشەنگ
کەژاوەی مانگی نیسانت
هەزاران دیمەنی جوانت
بیرو هۆشم ئەوروژێنن
فرمێسک لە چاو قەتیس دێنن
چوار وێنکەی تری لەدیوانی ڕۆح و هەورو بەفردایە

# (٧٥)
# کۆنفرانسی ئاشتی و سێ چیرۆکی کۆمیدی و تراژیدی

بزاڤی ئازادیخوازانەی کورد لە باکوور تووشی ڕەوشێکی ئاڵۆزو دژوارهات، لەهەمانکاتدا خودی ئۆچەلان و پەکەکەو پرۆسەی ڕادەستکردنی بووبووە بابەتی سەرەکی میدیاکانی جیهان و هەرلایەک و ولاتیک بە جۆرێک شرۆڤەی ئەم کارەیدەکرد .

لە سیاسەتی جیهانیدا بیرۆکەی بەئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا هاتەگۆڕێ، بۆ ئەم مەبەستە (پەکەدەوە) پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی ولات کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیی لە برۆکسل بەناوی کۆنفرانسی ئاشتی پێکهێنا.

کۆنفرانسەکە ئامانجی خۆی پێکا، چونکە هەر چەند مانگێک دوای گرتنی ئۆچەلان بەسترا ، گەلێک لە سیاسەتمەدار، دیپلۆماتکار، نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکێتی ئەوروپا، کۆبەند (جامیعە)ی عەرەبی، کۆنگرەی ئیسلامی و کەسایەتی جیهانی و کوردی تێدا بەشداربوون، نوێنەری بەشی هەرە زۆری حزبە کوردییەکان بەڕاست و چەپ و عیلمانی و کۆنزەرڤاتیڤەکانەوە ئامادەبوون، چەند کەسایەتی و نوێنەری لایەنەکان وتاریاندا، هەموویان سەرکۆنەی ئەو کارە نایاسایی و نا مرۆییانەیان کرد، بە تیرۆری دەوڵەتیی و چەتەگەرییان لە قەڵەمداو داوایان لە تورکیا کرد ئۆچەلان وەکو سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕ کە داوای مافی خوراوی گەلێک دەکات دادگاییبکرێت، بەداخەوە هەندێ چیرۆکی سەیرو سەمەرە لەم کۆنفرانسەدا ڕوویدا:

١) هەر کە کۆنفرانس بەسروودی (ئەی ڕەقیب) دەستیپێکرد، چەند کەس لە ئیسلامییە سەلەفییەکان و کۆمۆنیستە سەلەفییەکان چوونەدەرەوە ! کە چووم لێم پرسین بۆ؟ ئیسلامییەکان گوتیان دینمان ئاینمان هەر نیشتیمان کفرە، کۆمۆنیستەکانیش وتیان ئەم سروودە هزری نەژادپەرستی بەرەو پێدەدات ئەمەش لەگەڵ ئایدۆلۆژیای ئێمە ناگونجێ !.

٢) هەندێ هاوڕێی ڕۆژهەلاتی هەستانە سەرپێ و وتیان لەبەرئەوەی ئالای کوردستان دانەنراوە ئێمەش ئەچینە دەرەوە، ئیتر خێرا چووم لە هوتێلەکە قوماشێکی سپیم هێناو خستمە بەینی ڕەنگەکانەوە کە لەسەر مێزی قسەکردنەکە شۆڕبووبوونەوە، ئینجا بەهەڤاڵەکانی ڕۆژهەلاتم وت ئەوە هەر چوار ڕەنگەکەی ئالای کوردستان کەسک و سورو سپی و زەرد هێمان بۆ ئالاء، کوردستان.

٣) ئەم چیرۆکەیان زۆر تراژیدییە. کەدانیال میتران وتارەکەی دەستپێکرد، وتی: کە ئۆچەلانم دی لەناو فڕۆکەکە چاوی بەسترابوو و سەری زۆر ئاوسا بوو لەبەینی دوونەفسەری سیخوڕی تورکیا گریام، گریام بۆ شۆڕشگێرانی کورد بۆ سەرکردەو چارەنووسی کورد، مادام میتران وتی: هەر لەو کاتەدا هەندێک کورد بەتەلەفون پیرۆزباییان لێکردم، وتیان باشبوو لەم بەلایە ڕزگارمان بوو، دایکی کوردان وتی من زیاتر گریام بۆ عەقڵی سیاسی و سیاسەتمەدارانی کورد، گریام منیش دەپرسم ئایا ئەمە تراژیدیایی مێژووی کورد نییە؟

ئەوەی لەیادم مابێت لەنێوان دکتۆر مەحمود و دکتۆر پەروینی حاجی ڕەحیمدا دانیشتبووم، بەحەسرەتەوە لێم پرسین ئێوە فەرەنسی باش دەزانن لە قسەکانی دانیاڵ میتران باش حاڵیبوون، ئایا بەم (ئاوەز) عەقڵە سیاسییەوە کورد دەگاتە کوێ؟ دکتۆر مەحمود

سەرێکی باداو هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی هەرئەوەیە کەمەدام میتران وتی؟

دانیشتنی یەکەم تەواوبوو، لە دووەمدا جلی کوردیم لەبەرکردبوو، میدیاکان گرنگییان پێدا، ڕۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی دیداریکی لەتەکدا ڕێکخستم، لەبارەی کوردو شۆڕشەکانی پرسیاری زۆری کرد، پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات و ئامانجی ئەم کۆنفرانسە؟، منیش وەڵامدایەوە کە ئامانجی کۆنفرانسەکە بۆ ئەوەیە (ئۆچەلان) لە سێدارە نەدرێت و دادگاییەکی دادپەروەرانە بکرێت، لە بارەی پەرلەمانی کوردستان پرسیاریکرد وتی ئامانجی ئەم پەرلەمانە چییە؟ وتم بۆ ناسینی دۆزی کوردە بە ناوەندە سیاسی و دیپلۆماسییە جیهانییەکان بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ، بەزەردە خەنەیەکەوە وتی: ئوستاد ئێوە لەسەر کۆنفراسێک ڕێکنەکەوتن چۆن لەسەر سەربەخۆیی کوردستان ڕێکدەکەون؟

بەم تراژیدیایە کۆتاییمان بە دیدارەکە هێنا . لێرەدا ئوستاد بەشیر موشیرم هاتەوەیاد کە دەیفەرموو: (ئەفەندم کورد هێشتا عەقڵی سیاسی کامڵنەبووە)، چونکە کیتابی مێژوو ناخوێننەوە !.

لەکۆتایی کۆنفرانسەکەدا یاداشتێک درا بە نەتەوە یەکگرتووەکان، لیژنەی مافی مرۆڤی یەکێتی ئەورووپا ، هەموو داوودەزگا پێوەندیدارەکانی جیهان کە بەڕێز ئۆچەلان وەکو سەرکردەیەکی شۆڕشگێر داوای مافی میلەتێک دەکات دادگاییەکی دادپەروەرانە بکرێت.

## (٧٦)
# چۆن هەڵەبجەی شەهید بوو
# بە خوشکی مەرزەبۆتۆ!!

درەختی گۆڕستانی هەڵەبجەمان لە مەرزەبۆتۆ ڕوواند، مەرزەبۆتۆ شارێکی جوان و شاخاوی دەوردراوە بە دارستانی چڕو پڕ، سەر بەهەرێمی (بولۆنیا)یە لە باکوری ئیتالیا. بولۆنیا شارێکی یەکجار دڵگیرە بە شێوەیەکی ئەندازیاری بالکێش نەخشێنراوە، لە شارە تایبەتییەکانی سەردەمی (باڕۆک)ی ئەوروپایە، ئەتوانی سەنتەری شارەکە و هەموو بازارەکانی بگەڕێیت بەبێ ئەوەی دڵۆپێک باران لێتبدات، ئەو ڕێگە پیادەڕۆیانەی لە تەنیشت شەقامەکانەوە دروستکراوە شێوەیەکی تایبەتی ناوازەی هەیە.

مەرزەبۆتۆ مەکۆی گروپە پارتیزانەکانی چەپی ئیتالیا بووە، کە دژی نازیەکانی ئەڵمانیای داگیرکەر جەنگاون، هیتلەریەکان زۆر ڕقیان لەم شارە بووەتەوە، بۆیە لە هێرشێکدا گەمارۆی شارەکەیان داوەو نزیکەی دوو هەزار کەسیان لێ ڕەشەکوژ کردوون.

(دانتن) کە یەکێکە لە ڕزگاربووانی (هۆلۆکۆست)، سەرۆکی ڕێکخراوی شارە شەهیدەکانی دنیایە، بە ئامادەبوونی جێگری سەرۆکی کۆمسیۆنی یەکێتی ئەوروپا، چەند ئەندام پەرلەمان، وەزیرو کەسایەتی سیاسی حوکومەتی باکوری ئیتالیا، کۆنفرانسێک لە ١٩٩٨/٣/١٦ لە شاری مەرزەبۆتۆ بەست و ڕێوڕەسمێکی شایستەیان بۆ ڕێزگرتن لە کارەساتی هەڵەبجە پێکهێنا.

ئەوان کە ئەم یـــادە دەکەنەوە، هەر جــارەو شـــارێکی شـــەهیدی جیهان دەکەنە خوشکی مەرزەبۆتۆ، ئەم جارە هەڵەبجە بوو، من وەک نوێنەری پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات بەشداریم کرد، بەڕێز (دانــا هەڵەبجەیــی) وەک ڕۆژنــامەنووس و شــایەتحاڵی کارەســاتەکە بەشـداربوو، ئەو بە باشــی باســی ڕۆژو کــاتی کیمیابــارانەکەی کـرد، وەک خۆی وتی ئەو کاتە لە ناو شاری هەڵەبجە بووە.

من لە سیمینارەکەمدا باسی ژمارەی شەهید، بریندارو جۆری ئەو چەکە کیمیاویــانەم کــرد کە بە کارهــاتبوون، هەروەهــا کــاریگەری دواروژی ئەو چەکانە لە سەر سروشت و ژینگە لە هەلەبجەو هەمـوو نـاوچەکە کرد، ئاماژەشـم بەو سـەرچاوانە دابوو کە زانیـاریم لێوەرگرتـوون، وەک ڕاپۆرتی ئونۆ و پەرلەمـانی ئەڵمانیا ئەمەش بـوە هـۆی ئەوەی کە میـدیاکانی ئیتاڵیـا گرینگیـان پێدا، د.عیسـام داود کە کوردێکی کەرکوکییە لە بنەماڵەی خانەقاکانا وەرگێرمان بوو.

دانتن دیداری لە تەک سەرۆکی حوکمەتی خۆجێی باکوری ئیتاڵیا، سەرۆکی شارەوانی، باژێروانی بۆلۆنیا، پارت و کەسایەتی سیاسـی و کۆمەلایەتی ئەو دەڤەرە بۆ ڕێکخستین.

لە کۆنفرانســەکەدا هەنــدێک پێشــنیارمان پێشــکەش بە یەکێتــی ئەورووپا و ئامادەبووانی کۆنفرانسەکە کرد، چونکە جێگری سـەرۆکی کۆمسـیۆنی یەکێتـی ئەورووپـا لە تەنیشـت مـنەوە لە سـەر مەنەسـەکە دانیشتبوو، پێشنیارەکان:

١ -پێویسـتە لەسـەر کیمیابـارانی هەڵەبـجە سـەدام لە دادگـای نێودەوڵەتی دادگاییبکرێت.

٢ -پێویستە ئەو وڵاتـانەی چەکی کیمیاییـان بە عێراق فرۆشـتووە بدرێن بە دادگای نێودەوڵەتی.

٣ -پێویستە ئەو وڵاتانەی چەکی کیمیاییان فرۆشتوە بە عێراق قەرەبووی (مادی -مەعنەوی) بدەن بە شاری هەڵەبجە.

٤ -کردنی هەڵەبجە بە خوشکی مەرزەبۆتۆ، چونکە ئەرکی ئەخلاقی دەکەوێتە ملی هەردوو شارەکە، بۆ ئەمەش کاک دانا ئەرکدارکرا.

٥ -لەو دیدارەمان لە پرێزگای بۆلۆنیا لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی و پارێزگارو کەسانێکی زۆری سیاسی و کۆمەڵایەتی شارەکە کۆبووینەوە، توانیمان لە سەر کێشەی کوردو شۆرشی کوردستان و ئەرک و کارەکانی پەرلەمانی دەرەوەی وڵات قسەیان بو بکەین، پارێزگار نیوەرۆخوانێکی لەسەر چیایەکی بەرز بۆ سازکردین و تارێکی کورتی بۆ داین، وتی: ئەم شوێنە مەکۆی خۆشاردنەوەی پارتیزانەکان بووە، وا ئێستا کراوە بە شوێنێکی گەشتیاری و بەم شێوەیە ڕازێنراوەتەوە، هەروەها وتی زیاتر لە ٢٠ ساڵە شارەوانی بە دەست چەپەکانەوەیە، چونکە خزمەتگوزاری پێشکەشدەکەین و شارەکەشتان بینی چۆن رازێنراوەتەوە.

لە کۆتاییدا خەڵاتێکی ڕێزلێنانیان پێشکەشکردین کە سومبولی ڕێکخراوەکەیان بوو (ڕێکخراوی شارە شەهیدەکانی جیهان).

# (٧٧)
# ساڵح عەسکەری تێکۆشەر و نموونەی خۆڕاگری..؟

**ئایا ڕاستە مرۆڤی پۆڵاین هەیە؟**

هاوڕێ ساڵح عەسکەری، مامەڕەزایی بوو، لە هەقەکانی کلکە سماق و برای پارێزەر مستەفا عەسکەری بوو، کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەرو شیوعییەکی خوێندەواری ئەدەبدۆست بوو. کە حزبی شیوعی بوو بە دوو باڵ (لیژنەی مەرکەزی و قیادەی مەرکەزی)، هاوڕێ ساڵح بوو بە ئەندامی سەرکردایەتی (قیادەی مەرکەزی)و لێپرسراوی هەموو شانە چەکدارەکانی ناو شارەکانی هەموعێراق، هەروەها بەرپرسی (جیهازی سەمیع)یش بوو.

زوو زوو سەردانی کوردستانی دەکردو ڕێکخستنەکانی هەولێر، سلێمانی و شانەچەکدارەکانی بەسەر دەکردەوە، جارێک (ئەبو نضال)ی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ئەبو نضال نوێنەری (بەرەی ڕزگاریخوازی گەلی فەلەستین) بوو لە عێراق، بە بەرنامەی قیادەی مەرکەزی زۆر سەرسامبوو.

هاوڕێ ساڵح باسی ئەوەی کرد کە ئەوان بوون لەماڵی خاڵیدا (خێروڵا تلفاح) تەقەیان لە سەدام حوسێن کردووە، وتی کاتێک سەدام حوسێن لە ماڵی خاڵیدا سەرقاڵی ئاهەنگگێڕان بوون و ئێمە زانیمان، هەوڵێکی کوشتنی سەدامماندا، وتی ئەبو نضال وەکو پڵنگ بەدار خورمایەکدا هەڵزنا، کە بەرانبەر حەوشەکەی ماڵی تلفاح بوو، منیش لەخوارەوە پاسەوانیم لێدەکرد، لە ئاکامدا چەند کەسێک بریندار بوون سەدامیشیان لەناودا بوو.

هەروەها وتی ئەبو نضال زۆر یارمەتی دەداین، هاوڕێ جۆرج حەبەش و عەزیز ئەلحاج یەکتریان بینیبوو و بڕیاریاندابوو بە نهێنی یارمەتیمان بدات، ئەبو نضال داوایکرد چەند ناوچەیەکی کوردستان ببینێ تا بزانێ ژیانی حزبایەتی و پێشمەرگایەتی شیوعیەکانی کوردستان چۆنە؟ ئیتر من و هاوڕێ ساڵح و ئەحمەدی دەلاک و ئەبو نضال ناوچەکانی قەرەداغ و پێنجوێن و کلکە سماق گەڕاین، هاوڕێ ئەحمەد وتی: کە چوومەوە بەغدا پێشنیار دەکەم عەزیز ئەلحاج و قیادەی مەرکەزی بێنە کوردستان، ئیتر ئەبو نضالمان نارد بۆ گەلاڵە.

جیهازی سەمیم بەو بورە بوو کە حزب لەناو هەموو حزبەکانی عێراق و داوودەزگا هەواڵگریەکانی حوکمەتی ئەوسای عێراق دروستیکردبوو، هەر لە ڕێگەی ئەم تۆڕەوە بوو، هاوڕێ ساڵح ئاگاداریکردینەوە کە چەند کەسێک لە کوردستان سەر بە دەزگەی هەواڵگری عێراقن و تا ئێستەیش لە حزب ئەندامن؟

لەگەڕەکی عەقاری سلێمانی ماڵێکی حزبیمان هەبوو من لێی دەژیام، هاوڕێ ساڵح کە دەهاتەوە بۆ سلێمانی لای من دەمایەوە، ئەو شەوەی پلانی فراندنی پارەکەی (مەعاریف) پەروەردەماندا، لەگەڵ هاوڕێیان ساڵح عەسکەری، شێخ عەلی، حەمە کوڵەباڵ و هاوڕێیەکی تر(...)، کۆبوونەوەیەکمان کردو نەخشەی کارەکەمان ڕێکخست، بەیانی من و هاوڕێ ساڵح هەر لە ماڵەوە مابووینەوە، کە ژن و پیاوێکی مامۆستا بەدوعاو نزاو بۆڵە بۆڵەوە خۆیان کرد بە ژووورداو وتیان موچەکانیان ڕفاندین خوا بیان گرێ! بەزەهریان بێ، ئێمە چووین مووچە وەرگرین و شەمەک و پێویستی ماڵ بکرین، بە نائومێدی گەڕاینەوە، من و هاوڕێ ساڵح چاییمان دەخواردەوەو بزەی سەرکەوتن گرتینی، لە چیرۆکێکدا باسی ئەم چالاکیەیم بەدرێژی کردووە.

محەمەد دەوران کوردێکی ڕۆژئاوابوو لە لوبنان دەژیا، ئەندامی حزبی شیوعی لوبنان بوو، ناسنامەی هاونیشتمانێتی لوبنانیشی هەبوو، لە پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات یەکتریمان ناسی، ئەو لە تەڤگەری سیاسی باکووردا کاریدەکرد، کە زانی من کوردی باشوورم و شیوعیش بووم، ئیتر بووین بە ئاشنا، باسی خەبات و ژیانی خۆی بۆ دەکردم وتی: یەکەم شاند لە لوبنانەوە لەگەڵ کەمال جونبەلات (جانپۆلاد) کە ئەو کاتە وەزیر بوو، بە ئامانجی پیرۆزبایی بەیاننامەی یانزەی ئازار هاتینە گەلاڵە بۆ دیداری (مەلا مستەفای بارزانی)، ئیتر لەو کاتەوە کەوتمە هاتووچوو لە نێوان بەیروت و گەلاڵەدا، بووم بەجێگەی متمانەی سەرۆک بارزانی، هەموو ئەو نامانانەی کە دەینارد بۆ کەسایەتییە سیاسیی و فەرمییەکانی لوبنان و باڵیۆزخانەی دەوڵەتە گەورەکانی جیهان من دەمگەیاندن، ئەوە جگە لەو ڕاپۆرتانەی بۆ ڕۆژنامە گەورەکانی جیهانیان دەنووسی.

ڕۆژێک لە فڕۆکەخانەی بەغدا گرتیانم و بردیانم بۆ (ئەمنی عامە)، گوتیان تۆ سیخوڕی ئیسرائیل و بارزانیت، هەندێک وێنەیان نیشاندامەوە کە چووبوومە باڵیۆزخانەکان، ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دام، هەتا ڕۆژێک گوریسێکیان لە شان و قۆڵم بەست و شۆڕیان کردمەوە ناو بیرێک هەتا سەر سنگم چووبووە ناو پاشەڕۆی تواڵێتەکان، هەشت ڕۆژ بەمجۆرە بووم، ئەمجار دەریانهێنامەوەو تەنکەرێک ئاویان هێناو بە سۆندەی تەنکەرەئاوەکە پاکیان کردمەوە و بەچەند کەسێک هەڵیانگرتم و فڕیان دامە قاوشێکەوە کە سەدو بیست بۆ سەدو سی کەسی تێدا بوو، کەهۆشم هاتەوە گوێم لێبوو دوو کەس بەکوردی قسەم لەگەڵدەکەن، ئەو دوو کەسە ئەحمەدی دەلاک و سالح عەسکەری بوون، ئەوانەی تریش هەموویان شیوعی قیادە مەرکەزی بوون، پێیاندەوتن قاوشی

بەکرێگیراوە (عومەلا) شیوعییەکان، محەمەد دەوران وتی: بیست ڕۆژ لەوێ مامەوە، ڕۆژێک هاتن سەرو ڕیشیان تاشین و بردینیان بۆ گەرماوو جلیان بۆ هێناین و لە گۆرەپانی بەندیخانەکە کۆیانکردینەوە، کورسییان ریز کردبوو، هەر کەسێک ناوی خۆی لەسەر کورسییەکە نوسرابوو، هەر کەسێک لەسەر کورسی خۆی دانیشت، تەنیا سالح عەسکەری نەبێ لە ئەرزەکە دانیشتبوو، بۆهاتنیشی بۆ گورەپانەکە من و ئەحمەدی دەلاک چووبووینە ژێر باڵی، چونکە هەموو نینۆکەکانی قاچیان دەرهێنابوو، ژێر پێی پێستی پێوە نەمابوو گۆشت و ئیسقانەکانی بەدەر کەوتبوو. لە پڕ سەدام و نازم گزار هاتن وتیان ها عومەلا شیوعییەکان وا بڕیاری لێخۆشبوونمان بۆ دەرکردن، بەڕیز کەوتە تەوقەگردن لەگەڵماندا هەتا هاتە سەر ئەحمەدی دەلاک وتی: من تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەرم من بەکرێگیراو (عەمیل) نیم، رووی کردە سالح عەسکەری کە لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، پێیوت تۆ بۆ هەڵناستییە پێ (انت لیش ما تگوم)؟ سالح قاچی ڕاکێشاو ژێر پێی پیشاندا وتی ئەوانە عەمیلن کە مرۆڤ هەتا رادەی مردن ئازار دەدەن، سەدام زۆر پێی تێکچوو، نازام گزار چپەیەکی لەگەڵ کردو تۆزێ دوور کەوتنەوە، سەدام کە بڕیار بوو زۆر قسەمان بۆ بکات، هەندێ قسەی هەلەق و مەلەقی کردو ڕۆیشتن، عەرەبەکانیش هەندێکیان چەپڵەیان لێداو هەندێکیان هوتافیان کێشا کە شیوعیەت لەمردن بەهێز ترە، ئەمانە دەقاو دەق قسەی محەمەد دەوران بوون، وەکو بەشێک لە مێژووی شیوعییەکان بۆ ئێوەم گێڕایەوە، منیش ویژدانم ئاسوودەیە کە ئەمانەم نەبردە ژێر گل.

# (٧٧)

# (قادری حاجی عەلی) پێشمەرگەیەکی ئازا ڕووناکبیرێکی شارەزا

ئەو کاتەی بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری جەماوەری بووم، فەرمانگەکەمان بە تەنیشت سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانییەوە بوو، کە ئێستا قایمقامیەتی سلێمانییە، لەو کاتەدا ڕێکخراوی کۆمەڵەی رەنجدەران لە ناو شاردا بەهێزبوو، بەتایبەتی لەناو ڕۆشنبیران و قوتابیانی زانکۆدا، جارجارەش چالاکیی سەربازییان لە ناو شاردا ئەنجامدەدا؟

لەبەرئەوەی حیزبی شیوعی بەهەردوو باڵەکەیەوە توشی دارمان و نائومێدی بووبوو و هەرەسی بلۆکی سۆڤیەتیش دەستیپێکردبوو، زۆرینەی گەنجەکانی ئەو حیزبە ڕوویان لە کۆمەڵەی ڕەنجدەران کردبوو، وەکو فریادرەسێک دەیانبینی.

خاڵی پەیوەندی من بە مەڵبەندی یەکی کۆمەڵەوە کە لە شاباژێڕ بوون، لە ڕێگەی تێکۆشەری دێرین وەستا (لالۆی پێنجوێنی)ەوە بوو. پەیوەندییەکەش تایبەتی بوو کە تەنیا مەلا بەختیارو بەکری حاجی سەفەر دەیانزانی، ڕۆژێک لالۆ لە فەرمانگە هات بۆ لام و ووتی: پێم باشە چەند ڕۆژێک خۆت ونبکەیت، ووتم بۆ خێرە؟ ووتی: لەم ناوە شتێک ڕوودەدات با تۆ لێرە نەبیت، منیش بۆ چەند ڕۆژێک چووم بۆ بەغدا، کەهاتمەوە بیستم سالح عانی کە بەڕێوەبەری کارگێریی سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی بوو و بەرانبەری کورد بەعسییەکی داخلەدڵبوو، کوژرا بوو. بیستمەوە کە قادری حاجی عەلی دەستی لێوەشاندووە، ئەو کاتە پرنسیپی کاری کۆمەڵە وابوو، هەر گەنجێک

بڕیاری بوونە پێشمەرگایەتی دابایە، دەبوو جێدەستی دیاربێ، من قادرو حەمەجەزام خۆشدەویست، چونکە لەکاتی تێکچوونی پێنجوێن بە هۆی (بوومەلەرزە کەوە)، خەڵکی ئاوارە بووبوون، ئێمە سێ مانگ ماڵی حاجی عەلی بەگ داڵدەیان داین، ئەو کاتە ماڵیان لە بازاڕە بچکۆلەی کانی ئاسکان بوو، ئەم دوو کوڕە زۆر منداڵ بوون، لەم ساڵانەی دواییدا، جارجار کە دەمبینینەوە باسی ئەو چیرۆکەم بۆ دەکردن، حەمەجەزا دەیووت: من ئەو شتانەم لە بیر نییە، بەلام ژوورێکمان لە قاتی خوارەوە هەیە پێیدەڵێین ژووری ماڵە ئاوارەکەی پێنجوێن.

لەگەڵ کاک قادریشدا ئەو کاتە بووین بەئاشنای تەواو کە یەکێک بوو لەسەرکردەکانی گۆڕان، زوو زوو یەکتریمان دەبینی، قادر لەم دواییانەدا زۆر نائومێد بووبوو لە گۆڕان و سەرسامی خۆی لای من بە پەکەکە دەردەبڕی، چەندجار سەردانی قەندیلی کرد، لای سەرکردەکانیان گفتوگۆو دانوستاندنی هەبوو، باسی ئەوەی کردبوو، کە کۆمەڵێک گەنج بنێرێ بۆ شاخ بۆ ئەوەی فێری مەشقکردن و کاری فیداکاری وەکو گەریلا ببن.

خۆ ئەگەر قادر سندوقە ڕەشەکەی یەکێتی بوو، جارجاریش دەرگای ئەو سندوقەی بۆ سەرکردەکانی پەکەکە والا دەکرد؟ من کە زانیم ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ، گرێمدا بەکادرێکی پێشکەوتووی پەکەکەوە (د.ح)، کاک قادر لای پەکەکە ڕێزێکی زۆری لێدەگیرا، وەکو سەرکردەیەکی چەپی کوردستان سەیریان دەکرد.

ئەم نووسینە هەندێ شتی هێنامەوە یاد، ئەو کاتەی لالۆ و چەند کادرێکی تری کۆمەڵە هاتووچۆی فەرمانگەکەی منیان دەکرد، لە وێوە بەلاقۆک و شتی تریان دابەشدەکرد، جەمال جەلال کە لە پێنجوێنەوە دەهات، پۆستی (شاخ)ی لای من بۆ وەستا لالۆ دادەنا، جگە لەمەیش

چەند چالاکوانێکی کۆمەڵە لە لیژنەی ڕۆشنبیریدا بوون وەکو دڵشاد مەریوانی، شەهاب عوسمان و ئازاد عەبدولواحید.

ئازاد ئەو کاتە دۆستی کۆمەڵە بوو، جارجار سەردانی ناوچەی قەرەداخی دەکرد، ئەدەبیات و دەنگ و باسی کۆمەڵەی دەهێنایەوەو بۆ منی باسدەکرد، جارێک (دایرەی ئەمن) خەریکبوو بیگرن، من فریای کەوتم.

جارێک عەبدولئەمیر مەعەلە کە جێگری وەزیری ڕاگەیاندنی عێراق بوو، لە بەغدا کۆبوونەوەی بە هەندێک ئەدیب و نووسەری کورد کرد بوو، نازانم چۆن باسی من و ڕۆشنبیری سلیمانی کرابوو، یەکێک لەو نووسەرانە ووتبووی ئوستاز ڕۆشنبیری سلێمانی بووە بەمەکتەبی ئیعلامی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.

عەبدولئەمیر بێدەنگ دەبێت، نووسەرەکانی تر خێرا قسە بەسەر مەسەلەکەدا دێنن و باری قسەکە دەگۆڕن، کە دێنە دەرەوە پێیدەڵێن: کاکە ئەم قسەیەی تۆ کردت کوشتن و پەتی سێدارەی لە دوایە، ئەویش بەتوڕەییەوە دەڵێت: ئەی نازانن دڵشادو ئازادو شەهاب چالاکوانی کۆمەڵەن و کارە ڕۆشنبیرییەکان، ئەوان لای پێنجوێنییەوە ئەنجامی دەدەن؟ ئەوە کەشوهەوای ئەوسای ڕۆشنبیران، ئەمەش کەشوهەوای سیاسەتمەدارانی ئێستا !!

ڕۆحت شاد کاک قادری زیندوو، ئەوانەی لەکۆبونەوەکەی عەبدولئەمیردا بوون سیانیان لە ژیاندا ماون.

## (٧٨)
# لەنێوان ململانێی سۆفی و دەروێش، پارتی و یەکێتی

لە ساڵی پەنجاکاندا لە وەرزی هاویندا خەڵکێکی زۆر بۆگەشتوگوزار دەهاتن بۆناوچەکەمان، پێنجوێن لە وەرزی بەهارو هاویندا کەشو هەوایەکی سازگارو دیمەنێکی ئێجگاردڵفرێن و ئارامبەخشی هەیە. لەو ساڵانەدا شێخ عوسمانی بیارە لە هاویناندا دەهاتە پێنجوێن و لەمزگەوتی پاشا دەمایەوە، مزگەوتی پاشاو مزگەوتی قازی دوو مەڵبەندی چالاکیی سۆفیەکانی پێنجوێن بوون، مەلاعارف و مەلا ئەحمەدی قازی، دوو مەلای چاکی ئەو زەمانە بوون و پێشنوێژی ئەو دوو مزگەوتەیش بوون، هەروەسا مامۆستای هەموو سۆفیەکانی ناوچەکەبوون، ئەو کاتە پێنجوێن دوو گەڕەکی سەرەکی بوو (بەرکێو و بەری کەناو).

بەرکێو، زۆربەیان دەروێش بوون و شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانی زووزوو دەهات بۆ پێنجوێن، چونکە لەوێ گوندێکیان هەبوو بەناوی (بوبان)، بەری کەناویش زۆربەیان سۆفی بوون، باوکی ڕەحمەتیم ئەحمەدی خوامراد یەکێک بوو لەسۆفییە چالاکەکانی شێخی بیارە، ئەو زەمانە کێبەرکێی نێوان دەروێش و سۆفی لە کێبەرکێی ئێستەی یەکێتی و پارتی بەهێزتر بوو، دەروێشەکان جارجار بەزکر، تەلیلە، دەف لێدان، زەرک لێدان، قەمەو شمشێر وەشاندنەوە بەدەوری مزگەوتی سۆفیەکاندا وەکو فشارێکی دەروونی هاواریان دەکرد، کوڕیان گەرمدەکردو حاڵیان لێدەهات !! سۆفییەکانیش لە مزگەوتەکاندا چراکانیان کزدەکردو خەریکی زیکر،

فیکرو خەڵوەتەی خۆیان بوون، لەیادمە جارێک باوکم، من و سێ برای تری بردین بۆلای جەنابی شێخی بیارە بۆ ئەوەی پیرۆزیی لێوەربگرین و نزای خێرمان بۆ بکات، باوکم فەرمووی ئەوە کورەکانمن، بەرەکەتیان پێببەخشە! قوتابین و نوێژیش دەکەن.

شێخ فەرمووی رۆڵەکانم ئێوە بخوێنن و زانیاریی بەدەست بهێنن! ببن بە دکتۆرو مامۆستاو ئەندازیار، خوداو ئایین لە یادمەکەن و بەویژدان بن! دڵپاک و مرۆڤدۆست بن! تادەتوانن خزمەتی خەڵک بکەن! خودا لە ویژداندایە، ئایین لە کردارو رەفتاردایە، ئەمە وتەکانی جەنابی شێخ بوو. من لەو کاتەوە (خودا)م، لەویژدانمدا هەڵگرتووە ئایینیش لە رەفتارمدا رەنگیداوەتەوە، ئەمە گەوهەری موسوڵمانێتییە، من لەم وتەی شێخەوە تێگەیشتم کە باوەڕداری ئەو نهێنییە رۆحیەیە لە نێوان هەڵوێستی مرۆڤانەو ویژدان و پەروەردگاردا.

## (٧٩)

# فەڕەنسەی کافر و کوردی موسڵمان

لەم ڕۆژانەدا هێرشێکی ناڕەوا دژی فەڕەنسەو سەرۆکەکەی ماکرۆن دەستیپێکردووە، لە پشتی ئەم هێرشەوە ئەو گروپانە هەن کە بە چەقۆ ژن و مامۆستای زانکۆ سەردەبڕن، ئەمەش بە پشتگیری و هاندانی ئەردۆگانی سەرۆکی تورکیایە، فەڕەنسە لە کۆنەوە دۆستی کوردە، پارتی سۆسیال دیموکرات و پارتی کۆمۆنیستی فەڕەنسی هەمیشە پشتگیرییان لە دۆزی کورد کردووە، بە تایبەتی لە دەسپێکی شۆڕشی ئەیلولەوە ڕۆژنامەکانی (لۆمۆندو لۆفیگارۆ) لە ئەوروپا هەواڵی شۆڕشیان بڵاودەکردەوەو داکۆکییان لە پرسی کورد دەکرد.

لێرەدا نابێت ڕۆڵی دکتۆر (قاسملو) بۆ ناساندنی کێشەی کورد بە دەستەبژێری سیاسی و ڕۆشنبیریی فەڕەنسی لە یادبکەین، لێرە هەندێ نموونە دەخەمە بەردیدەی خوێنەران:

١ -ئەوە مادام میتران بوو، بە یاوەری بێرنارد کۆشنەر وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی فەڕەنسە، لەو ڕۆژە سەختانەی لە سەر سنووری حاجی ئۆمەران بە دەیان هەزار مرۆڤی کورد گیریانخواردبوو، ڕۆژانە دەیان منداڵ و پیرو پەککەوتەمان لە برسان و لە سەرمادا لێدەمردن، دانیال میتران بوو هات بۆ تاران و هاتە سەر سنوورو بەپێی سنوورەکەی بەزاند، لەسەر ئەو سنوورەوە داوای لە کۆماری ئیسلامی کرد سنووربکاتەوەو نزیکەی یەک ملیۆن کوردی لە مردن ڕزگارکرد.

٢ -فەڕەنسە بوو لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوەدەوڵەتی، توانی پێشنیاری خەتی ٣٦ بکا بە بڕیارو ناوچەی دژە فڕین دروستبکات و کورد لە جینۆسایدی سەدام ڕزگاربکات، هەر لەسایەی ئەم دژە فڕینەوە بوو ئەم قەوارەیەی ئێستا دروستبوو ..

٣ -دكتۆر عیسمەت شەریف وانلی لە نامیلکەکەیدا کە بە فەرەنسی نووسیویەتی لە ژێر ناوی (پانزە ڕۆژ لە کوردستانی ئازاددا) دەڵێت: دوای چەند مانگێک لە ڕاپەرینی باشوور لە کۆشکی ئەلیزێیەوە بانگیانکردم کە ڕۆژی ... لە دیوانی سەرۆکایەتی بۆ دیداری سەرۆک میتران ئامادەبم!..

کە چوومە بیرۆکەی سەرۆک ئەخزەر ئیبراهیمی وەزیری پێشووی دەرەوەی جەزائیر، کە ئەوکاتە یاریدەدەری سەرۆکی نەتەوە یەککگرتوەکان بوو، لەوێ دانیشتبوو، لێم پرسی خێرە؟ ووتی بۆ کێشەی ئێوەی کوردە، لەو کاتەدا فەرموویان لێکردین بچینە ژوورەوە بۆ دیداری سەروک میتران، سەرۆک وتی بڕۆن بۆ کوردستان نامەی نووسراوی (جەلال تاڵەبانی، مەسعود بارزانی و دکتۆر مەحمود عوسمان)م بۆ بێنن، بەم نزیکانە لە کۆبوونەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان باسی سەربەخۆیی کورد دەکەم و ئامادەکاریشم بۆ کردووە با ئەو بەڕێزانە نەڵێن ئاگامان لێنەبووە، پانزە ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە، دکتۆر عیسمەت بەردەوام دەبێ و دەڵێ بە فڕۆکە هێنایانینە ئەو پەل(فەوج)ە سەربازییە فەرەنسییەی لە ئاگری بوون، کاک عیسمەت لە نامیلەکەکەیدا دەڵێ پانزە ڕۆژ بە کوردستاندا سووراینەوە نەمانتوانی ئەو نامانە بەدەستبهێنین بۆ میتران، پرۆژەکەی فەرەنسا بوو بە قوربانیی!..

ئەخزەر ئیبراهیمی کە یەکێک بوو لە شۆڕشگێڕەکانی جەزائیر پێیووتم عیسمەت شۆڕشگێڕەکانی ئێمەو ئێوە زۆر لەیەک جیاوازن !!

٤ -ئەو کاتەی شاندێک چووینە بارەگای نەتەوە یەککگرتووەکان، بۆ دیداری (پەترۆس غالی)، کۆنگرێسی ئەمەریکی کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی بۆدۆزی کورد هەبوو، لەسەر باگهێشتکردنی دکتۆر نەجمەدین ئێمەش چووین بۆ کۆبوونەوەکە، پێش ئەوەی بە جیهازی کۆنترۆڵەکەدا ڕەتببین، مادام میتران لەسەر کورسیەک دانیشتبوو کە

لێی نزیکبووینەوە هەڵسا تەوقەی لەگەڵ مندا کرد، چونکە من بە ڕانکوچۆغەوە چوو بووم، کاک عیسمەت شەریف وانلی ووتی مادام میتران ڕێز لە هەموو کولتووری کوردی دەگرێت نەک هەر کێشەی کورد.

٥ -ئەو کۆنفراسەی مام جەلال ویستی بۆ چارەسەری کێشەی کورد لە باکوور، لە بەغدا سازییکات، هەر وەکو مام جەلال خۆی ووتی بە هاندان و پشتگیری فەرەنساو سەرۆک هۆلاند بوو، کە ئەو کاتە سەرۆکی فەرەنسە بوو.

٦ -فەرەنسییەکان یەکەم دەوڵەتی ئەوروپایی بوون پشتگیری ڕوژئاوایان کرد بە تایبەتی لە شەڕی کوبانی، لە ژووری ئۆپەراسیۆنی (هاوپەیمانان - عێراق - کورد) زەخیرەیەکی زۆری شەڕ کۆکرابووەوە، دەیانویست بە فڕۆکە فریای شەڕڤانانی ڕۆژئاوای بخەن، ئەمەش کێشەیەکی لەناو هاوپەیمانانندا دروستکردبوو لەبەر تورکیا، بەڵام فەرەنسییەکان پێداگربوون لەوەی نابێت کۆبانی بکەوێت و بە دەردی شەنگال بچێت. ئەگەر هەموو نارازی بن ئێمە بە تەیارەی خۆمان ئەم کارە دەکەین هەرواش بوو!!

٧ -پێشوازیکردنی سەرۆک ماکرۆن لە شاندنی شەڕڤانان و پێشمەرگە لە کۆشکی ئەلیزێ نامەیەکی گەورەبوو بۆ هەموو جیهان و ئەوروپاو دانپێدانانێکی نێودەوڵەتی بوو، کە کورد شۆڕش ئەکات بۆ مافی زەوتکراوی، هەر ئەو ڕق و قینەیە ئێستا ئەردۆگان بە ماکرۆنی دەڕێژێت لەڕێگەی گرووپە توندڕەوەکان و سەربڕەکانەوە.

٨ -لە هێرشی حەشدی شەعبی بۆ سەر کوردستان، عەبادی فەرمانی دابوو هەتا قوشتەپەو بانی مەقان پێشڕەوی بکەن، فەرەنساو ماکرۆن بوون بە عەبادییان ووت: (Stop).

٩ -ئەوە ماکرۆن بوو لە دوای کارەساتی داگیرکردنەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان لە کۆشکی ئەلیزێ پێشوازی لە بەڕێز

نێچرڤـان بـارزانی سـەرۆکی هەرێمـی کوردسـتان وەکـو سـەرۆک دەوڵەتێک کردو پشتگیری خۆی بۆ حوکومەتی هەرێم و دۆزی کورد راگەیاند.

١٠ -دوای کیمیابـارانکردنی هەڵەبـجە، لە پـاریس کۆنگرەیەک بـۆ قەدەغەکردنـی چەکـی کیمیـایی لە جیهانـدا بەسـترا، بـۆ ئەم کـۆنگرەیە کـوردو حوکـومەتی عێـراقیش بانگهێشـتکرابوون، شـاندی عێراقـی بە سەرۆکایەتی (تاریق عەزیز) ئەوسا وەزیری دەرەوە بـوو، ووتبوویـان ئەگەر کوردەکـــان بەشـــداربیکەن ئـــێمە دەکشـــێینەوە، وەڵامـــی فەرەنســـییەکان ئەوە بـــووە، کە کوردەکـــان هەر بەشـــداردەبن لە کۆنگرەکەدا، ئەوە بوو ئەوان کشانەوەو بەشدارییان نەکرد.

بەرێـزان: دەوڵەتێکی ئەوروپـایی کە لە رۆژی تەنگانەدا پشـتگیری میللەتەکەمان بکات شایەنی ئەوەیە کەسانێک بچنە کونسولخانەکەیان و هەرەشـەیان لێـبکەن؟ یـان بچـن هـاوخەمی خۆیـان دەرببـڕن بـۆ سەربڕینی ئەو ژن و رووناکبیرانەی بە چەقۆ ملیان پەڕێندراوە، هەر بەم بـۆنەیەوە دەستخۆشـی لەو شـاندە دەکەم کە لەگەڵ جێگـری سـەرۆکی پەرلەمـان چـوونە کونسـولخانەو هـاوخەمی خۆیـان پێڕاگەیانـدن، ئەمە یەکـێکە لە کـارە هەرە باشـەکانی ئەم خـولەی پەرلەمان.

## چیرۆکی (١):



لەڕاستەوە: عیسمەت شەریف وانلی ، پێنجوێنی ، کۆمەڵێک لەچالاکەوانەکانی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد لەئەوروپا

## چیرۆکی (٢):



یەکێک لەهۆڵەکانی کۆنگریسی ئەمریکا، پەیکەری زۆرینەی کەسایەتییە ناودارەکانی ئەمریکای تێدایە



لەڕاستەوە: گاوان کوردی باکوورو دانیشتووی ئەمریکا (وەرگێڕ)، عەلی یگید
(سەرۆکی پێشووتری کۆنگرەی نەتەوەیی و ئەندامی پەرلەمانی تورکیای هەلاتوو)،
جۆ رۆبرت کەنەدی (برازای جۆن کەنەدی و سیناتۆر)، پێنجوێنی
ئەم وێنەیە لەبیرۆی تایبەتی کەنەدی لە کۆنگرێس گیراوە.



پێنجوێنی و هەڤال فاروق کوردی رۆژئاواو دانیشتووی بۆستن لەئەمریکا لە بیرۆی
سەرۆکی دادگای فیدراڵی ئەمریکا گیراوە



لەڕاستەوە: پێنجوێنی، عەلی یگید، فاروق، کانی خەڵکی باکورو چالاکەوانی کورد لە ئەمریکا



لەڕاستەوە: گەشتیارێکی یابانی، پێنجوێنی، دئیلهان قزڵهان کوردی باکورو بەرپرسی بیرۆی چالاکەوانەکانی کورد لە واشنتۆن، عەلی یگید.

**چیرۆکی (٣):**



لەڕاستەوەو ڕیزی پێشەوە: میرهەم، نەورۆز، ڕێبوار ڕەشید، پێنجوێنی شاری ماستریختی هۆڵەندا



یەشار قایا وتارێک لەکۆبوونەوەیەکی گەورە لە کۆڵن



لەراستەوە: محەمەد دەوران، ڕێبوار ڕەشید، پێنجوێنی، میرهەم، دانیشتوو (کوردی عەفرین لە ڕۆژئاوا)



لەڕاستەوە: ئەحمەد باراش قلنج چالاکوانی کوردی باکوور لە ئەڵمانیا، فەقێ حسین سانج ئەدیب و زمانزانی کوردی باکوورو هاوڕێی تێکۆشان و کاری ڕۆشنبیریی موسا عەنتەر لەدامەزرێنەرانی ئینستتیوتی ئەستەمبوڵ، عیسمەت شەریف وانلی، پێنجوێنی.

شاری ماستریخت – هۆلەندا ئامادەکاریی چاوپێکەتنی سەرۆکی شارەوانی ١٩٩٤

(٤)

## سەردانی پاپا لە ڤاتیکان



لەدانیشتنێکدا کە پاپا وتاریدا (پێنجوێنی و دڵبەخوێن)

(٥)

## چیرۆکێکی گرنگ و سەرسوڕهێنەر



لەڕاستەوە: کوڕی دسیروان، دکتۆرێکی هاوڕێی دسیروان، دسیروان، هۆمەر دزەیی، پێنجوێنی، دوو دکتۆری میوان و دسەروەر تاڵەبانی لە گوندی دەرەویان

(٦)

**یەک ملیۆن وازۆ ... یەک دەنکە شقارتە!!**



لەڕاستەوە: شیخ تەیف شیخ عارف، پێنجوێنی، مەلا ڕەئوف، ئەم وێنەیەمان پێش پرۆسەکە لە ستودیۆ گۆیژە گرت، وتمان نەکا یەکێکمان بگیرێین یان بکوژرێین

(٧)

ئۆپەراسیۆنی **ساندویچ** " بابۆڵە"



نەوشیروان مستەفا و ئۆچەلان

(٨)

## "جانتاکەی یاسینی مچە و پارەکەی مەعارف "پەرومردە"



پینجوینی لە سالانی شەستەکاندا

(٩)

## ئەزانن مادام میتران بۆچی گریا!؟



ئەندامانی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی ولات:

لەراستەوە: دەرۆدی کوردی باکور شاعیرو پزیشک و چالاکوان، رەشید کوردی ئازەربایجان، (ئەوەی پێشەوە) شەمدین هونەرمەندی دەنگخۆشی باکوور، (پشتەوە) شەمۆییڤ کوردی جۆرجیا سەرۆکی دانگای تێهەڵچوونەوەی جۆرجیا، رۆستەم بابایڤ کوردی ئەرمینیا، عەزیزی جەمۆ کوردی کازاخستان، نادری نادرۆڤ زانای پیترۆکیمیاوی سۆڤیەتی جاران و ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی سۆڤیەتی و کوردی کازاخستان، دجەبار قادر، پرۆفیسۆر شەرەف عەشیری کوردی کازاخستان جێگری سەرۆکی عکومەتی کوردستانی سور کە لەسەردەمی گورباتشۆف پێکهێنرایەوە، کوردی باکور، پێنجوینی، دانیشتوو (دڵبەخۆن).



حەمە سوەیلە کادری پێشکەوتوی حزبی شیوعی عیراقی



عەلی سەعید برینپێچ و کادری پێشکەوتوی حزبی شیوعی

(١١)

"حەپسخانەی ماوەت - باستیلی کوردستان"

(١٣)

چیرۆکی وێنەکان و ڕۆڵی ئەدەب و هونەر

(١٣)

## چیرۆکی وێنەکان و ڕۆڵی ئەدەب و هونەر



بەپێوەو لای ڕاستەوە: عەلی جۆلا، عوسمان خاڵ، پێنجوێنی، ئەژی گۆران، شێرکۆ بێکەس، حەمەی حەمەباقی، منیرە محمد ئەمین، هێمنی شاعیر.
لەڕیزی خوارەوەو لای ڕاست: دووەم کەس بەپێوە ئیسماعیل خەیات، حەوتەم کەس شەهاب عوسمان، هەشتەم عەتا قەزاز، کۆتا کەس دانیشتوو عوسمان شەیدا.
لەگەڵ کۆمەڵێک هونەرمەندی شێوەکاریی لەبەردەم خانەی قتابیان کە لە برایم پاشابوو ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨، ئێستە قوتابخانەیەکی دواناوەندیی کچانە.



لەڕاستەوە: د.نافیع ئاکرەیی، سامی شۆڕش، پێنجوێنی، شێرکۆ بێکەس
فیستیڤاڵی شیعری کوردیی دووەم لەهەولێر



لەڕاستەوە: پێنجوێنی، پشتەوە جەلال عەزیز، مستەفا سالح کەریم، شاعیر پیربال مەحمود. هونەرمەند ئەنوەر قەرەداخی، دیداری چیرۆکی کوردیی لە پیرمام ، وێنە لە شەقلاوە گیراوە سالی سەرەتای هەشتاکان



لەڕاستەوە: شاعیر ئەحمەد هەردیی، پێنجوێنی، حەسیب قەرەداخی
یەکەمین ڤیستیڤالی شیعری کوردیی لەدوای نسکۆی ۱۹۷۵ لە دهۆک



ردنەوەی پێشانگای شێوەکاریی هەڵگورد جوندیانی لە باخچەی یەکێتی نوسەرانی سلێمانی

سالی هەشتاکان

لەدواوەو لای چەپەوە: حەمە سەعی حەمە کەریم پەیامنێری ڕۆژنامەی هاوکاریی، فەرید زامدار، د.عەبدوڵڵا ئاگرین، ئەکرەم قەرەداخی، حەسیب قەرەداخی، جیهان عومەر

لەراستەوە: ئەو منالەی جلی کوردی لەپشتی پێنجوێنییەوە (هەڵگورد جوندیانی)، لەپشتەوە فوئادی حەمەمین ئاغا چاویلکەی لەچاوە پێنجوێنی، کچەکە: تاڤگە ئەحمەد

(١٤)

## شاعیرو هونەرمەندان



لەڕاستەوە: فوئادی حەمەمین ئاغا، ئازاد عەبدولواحید، پێنجوێنی، لەگەڵ کۆمەڵێک ئەدیب و ڕوناکبیرانی شاری سلێمانی



شاعیرو هونەرمەندانی بەشداربووی ڤیستیڤالی یەکەمی پۆستەری شیعری کوردیی

(١٥)

## چۆن جەمال جەلالم رزگارکرد؟



لەچەپەوە: کەمالی حەسەن میرزا رەشید، جەمال جەلال،
پۆلێک پێشمەرگەی تێکۆشەر



جەمال جەلال و هاورێیەکی

**چیرۆکی (١٦)**

یادەوەری **لەگەڵ مستەفا** چاورەش



(١٨)

## ڕادیۆی ئیسرائیل و پرسەی هونەرمەند تەها خەلیل



هونەرمەند تەها خەلیل



یاسر عەرەفات

(١٩)

## بزنەکەی ئەڵلایی خەریک بوو ملمان بکات بەپەتا!



شازاد سائیب



پێنجوێنی و دلشاد مەریوانی

(٢٠)

# بەکری حاجی سەفەر و کۆبوونەوەکەی هەڵەبجە



سەلاح رەشید، پێنجوێنی، مام جەلال، د.کەمال فوئاد



فەرەیدون عەبدولقادر–بەکری حاجی سەفەر–مام رۆستەم

(٢١)

**به بۆنەی ڕۆژی (کۆبانی)یەوە ئێمەیش لە سەرکەوتنی کۆبانی ئاگادار بووین!!**



پێنجوێنی و ساڵح موسلیم



مەزلوم کوبانی

(٢٢)

## میکانیزمەکانی پرۆسەی ئاشتی زنجیرەی یەک



موراد قەرەیلان

(٢٣)

## میکانیزمەکانی پرۆسەی ئاشتی زنجیرەی دوو



هەڵۆی برای ئەحمەد، پێنجوێنی، زەینەب خانمی خێزانی کاک هەڵۆ



پێنجوێنی ، جەمیل بایک

## میکانیزمەکانی پرۆسەی ئاشتی زنجیرەی سێیەم



بیقاع ساڵی ١٩٩٢ یەکەم دیداری بەڕێز ئۆجەلان لە ئەکادیمیای سەربازیی مەعسوم قورقماز

(٢٨)

## بەشداریمان لە یەکەم کۆنگرەی پاسۆک





(٣٠)

**دروستکردنی پەرلەمان لە دەرەوەی وڵات**



لەڕاستەوە: نەجدەت بۆڵدان سەرۆکی سارەوانی شەرناخ و راکردوو لەدەرەوەی وڵات، نەورۆز چاکوانی سیاسی باکوور، فلامەرز باش بوغا چالاکوانی سیاسی باکوور، عیسمەت شەریف وانلی، پێنجوێنی، ئەحمەد ئەکتاش چالاکوانی سیاسی باکور، ئەلیف چالاکوانی سیاسی باکوور.
برۆکسل – لەکۆبوونەوەیەکی پەرلەمانی کوردستان لە هۆڵی شارەوانی ١٩٩٥

(٣٢)

**وەقفی شێخ سەعیدی پیران، وەقفی ئایینی نەتەوەیی و کوردستانی**



عەبدولرەحمان دوڕڕە



عەبدولمەلیک فورات نەوەی شێخ سەعیدی پیران

## (٣٤)

## چۆن (مامە عەلی)یم گەیاندە لای بارزانی و شێخ لەتیفی حەفید




پێنجوێنی



شێخ لەتیفی حەفید و مەلا مستەفای بارزانی



عەزیز محەمەد (سکرتێری حزبی شیوعی عیراق) و پێنوێنی

(٣٥)

## كۆنگرەی قوتابیانی جیهان لە بەغداو... شەڕی ڕاست و چەپ



جەلالی میرزا کەریم



پێنجوێنی و هۆمەری دزەیی

(٣٦)

# قورنان خوێندن بە ڤۆنگاوە!!!



پێنجوێنی و چەند کوردێکی کازاخستان




لەڕاستەوە: ڕەشیدۆڤ کوردی کازاخستان، کنیاز ئیبراهیم، بابی نازێ، پێنجوێنی، دوو کوردی کازاخستان



هەڵپەڕکێی کوردی کازاخستان



پرۆفیسۆر نادری نادرۆف

(٣٩)

**چیرۆکی ئەم وێنەیە**



لەڕاستەوە: مەحمود زامدار، ئازاد عەبدولواحید، عەلی مەردان، پێنجوێنی



لەڕاستەوە: پێنجوێنی، عەلی مەردان، شەماڵ سائیب

(٤٠)

**مانگرتنی قوتابیانی ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی**

(٤١)

**یەکەم سەفەرمان بۆلای بەرێز ئۆچەلان**



لەڕاستەوە: پێنجوێنی، مومتاز حەیدەری، عەبدوڵلا ئۆچەلان،
تاریق جامباز، چالاک سوفی

(٤٢)

**سەفەری دووەم بۆ لای بەرێز ئۆچەلان**



پێنجوێنی و هاوڕێکانی لەگەڵ ئۆچەلان و کۆمەڵێک گەریلا

(٤٣)

## حەلاجەکەی قەڵای هەولێر لە یادمەکەن!!!!



پێنجوێنی ١٩٨٤



ڤیستیڤاڵی یادی سلێمانی لەهۆڵی سەندیکای کرێکارانی سلێمانی



ڤیستیڤاڵی شیعری کوردیی لەهەولێر

(٤٤)

## شادبوون بە دیداری کوردۆلۆژی مەزن تۆفیق وەهبی



شێخ مەحموودو تۆفیق وەهبی



پێنجوینی و غولام خانەقینی و شێخ کاوەی حەفید لە هاید پارک – لەندەن



پێنجوێنی ، میر تەحسینی ئێزیدی، مەجیدخانی حەمە ڕەشید خانی بانە

(٤٥)

## كۆنگرەی مێژوویی نەتەوەی کوردو کوردستان لە شاری لۆزان




کونفرانسی یەکێتی ڕوشنبیرانی ولاتپاریزی کوردستان لە بون

(٤٦)

## ئنسیکلۆپیدیا (Encyclopedia)ی کوردو کوردستان



**ئەندامانی خولی یەکەمی پەرلەمانی دەرەوەی ولات**

**لەڕاستەوەو ڕاوەستاوەکان: سینان کوردی باکور، عەزیزی جەوێ کوردی روسیا، پرۆفیسۆر نادری نادرۆف، کوردی کازاخستان، کاروان کوردی باشور، پێنجوێنی، د.جەبار قادر، شەرەف عەشیری**

**دانیشتووەکان لەڕاستەوە: د.ڕۆدی کوردی باکور، د.ڕەشید کوردی کازاخستان، عارەبی شەممو کوردی جۆرجیا، دڵبەخۆن دارا**



وتاری پێنجوێنی لە کۆنگرەی سێیەمی کۆنگرەی گەل لە قەندیل

## (٤٧)

## یادگاریی لەتەک ئیبراهیم ئەحمەد



برایم ئەحمەد

(٤٨)

## یەکەم کۆنفرانسی دیالۆگی فیکریی و سیاسی پەکەکە لە (١٩٩٣) لە برۆکسل



یەکەمین کۆنفرانسی تەڤگەری ئازادیی کورد لە ئەورووپا - بۆکسل

لەڕاستەوە: یەشار قایە، پێنجوێنی، ڕۆجییە گارۆدی



لەڕاستەوە: پێنجوێنی، د. وانلی، ئاسیا عەبدوڵلا، کانی یەڵماز، دیلان



[illegible]

(٤٩)

**کۆنفرانسی ئاڤێستا ساڵی ۲۰۰۱ لە**

**(Haus der Kulturen der welt)ی بەرلین**



لەراستەوە: سەلیم فورات، پێنجوێنی، دوانلی

